



# کچی بەڕێوەبەری سێرک

نوسینی؛ یۆستاین گاردەر

وەرگێڕانی لە دانیمارکیەوە؛ بەهرۆز حەسەن

دەقە کوردیەکە پێشکەشە بە خوێنەرانی گاردەر،

وە بەتایبەتی پێشکەشە بە هەموو نوسەران و ئەوانەی دەخوازن "بنوسن"، هیوادارم ئەم ڕۆمانە سروشی نوێتان پێ ببەخشێت...

بەهرۆز حەسەن.



«...من دەڵێم ئێستاکە زۆر ڕۆیشتووین _مەبەستم لەلایەنی ڕۆشنبیریە _ بڵێیت کاتی ئەوە نەهاتبێت کە پشویەکی کەلتوری بچکۆلە بدەین و بەهێمنی بیر لەو شتانە بکەینەوە کە پێیان گەیشتووین، ئەو شتانە هەزمکەین کە چوونەتە ناومانەوە؟».

"Johan E. Mellbye نوێنەری پەرلەمان"
"پارتی جوتیاران، ڕۆژی 2. May 1927"

«خۆبەستنەوە بە میدیای جیهانی و فێرکارە کەلتوریەکانەوە وەک ئەوە وایە کە پێ بنێیتە ناو جیهانێکی ترەوە، جیهانێکی ئەفسوناویەوە. وەک ئەوە وایە کە دیسانەوە هەنگاو بەرەو هەقیقەت هەڵبێنیتەوە.
سەردەمی خەونبینین بەسەرچووە»

"Håvard Simense پارێزەر و ڕۆژنامەنوس و ڕەخنەگر"
"ڕۆژنامەی ئێواران، ڕۆژی 18. August 2001"





مێشکم جەنجاڵە. سەدان بیرۆکەی نوێ بە مێشکمدا دێن و دەچن، بەردەوامیش ئەندێشەی دی دێتە مێشکمەوە.

دەکرێت بتوانین تاڕادەیەک دەست بەسەر بیرکردنەوەکانماندا بگرین، بەڵام لەوە دەچێت نەتوانین بەتەواوەتی بیرکردنەوەکانمان بوەستێنین. چەندەها ئەندێشەی داڕێژراوی پڕنەشئەی خۆش لە مێشکمەوە هەڵدەقوڵێن و ناتوانم بیانگرم، چونکە هەر خێرا بیرۆکەی نوێیان بەدوادادێت و فەرامۆشدەکرێن. ناتوانم ئەندێشەکانم لە یەکتری جودابکەمەوە.

کەم ڕێدەکەوێت بتوانم ئەو شتەم لەیادبێت کە کەمێک لەوەوبەر بیرم لێکردۆتەوە، چونکە بەرلەوەی فریابکەوم و بیر لە سروشێک بکەمەوە، دەتوێتەوە و دەگۆڕێت، زۆرجاریش دەبێتە بیرۆکەیەکی باشتر. بەڵام ئەویش سروشتێکی کەمخایەنی هەیە و ناچارم هەوڵێکی زۆر بەم بۆ ئەوەی لەناو بورکانی هەڵچووی بیرۆکە نوێیەکانمدا ڕزگارییبکەم.

سەرلەنوێ مێشکم لێوانلێوە لە دەنگ. هەستدەکەم بوومەتە لانەی ڕەوەیەک ڕۆحی توند مەزاج و خانەکانی مێشکم بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی پێکەوە قسەبکەن. مێشکم جێگای ئەو هەمووەی تێدا نابێتەوە و دەبێت هەندێکی لێوە بێتە دەرەوە. دیارە بڕێک ئەندێشەی زیادە لە مێشکمدایە و لەبەرئەوە ناچارم خۆم بەتاڵبکەمەوە. ناچارم تاوناتاوێک دانیشم و لەڕێگەی قەڵەم و کاغەزەوە بیرۆکەکانم هەڵڕێژم...

کە دوو سەعاتێک لەمەوبەر خەبەرم بووەوە، دڵنیابووم کە وردترین و پڕاوپڕترین پێناسەی ژیانم لەلا گەڵاڵەبووە. ئێستاکە هێندە دڵنیا نیم لەو پێناسەیە، بەڵام بەهەرحاڵ لە دەفتەری تێبینیەکانمدا جێگایەکی



**گونجاوم داناوە بۆ ئەو پەندە پڕمانا و پڕ حیکمەتە نوێیە. گومانم نیە کە بەئاسانی دەتوانم بیگۆڕمەوە بە نانخواردنێکی نایابی ئێوارە، وە ئەگەر بشتوانم بەکەسێکی بەناوبانگی خاوەن ناوی بفرۆشم، ئەوا لەوانەیە بیخەنە ناو چاپی داهاتووی وتە بەنرخەکانەوە.**

**سەرئەنجام وا بڕیارمدا کە ببم بە چی. لەسەر ئەو شتەش کە هەمیشە هەر کردوومە دەمەوێت بەردەوامبم، بەڵام لە ئێستا بەدواوە دەمەوێت لەسەری بژیم. من پێویستیم بەوە نیە بەناوبانگ ببم، ئەگەرچی ئەوەش مەرجێکی گرنگە، بەڵام لەبەرامبەردا بواری ئەوەم هەیە کە یەکجار دەوڵەمەندبم.**

دڵم تەنگ دەبێت کە لاپەڕەکانی دەفتەری یاداشتە کۆنەکەم هەڵئەدەمەوە. ئەو کۆپلانەی سەرەوە یەک بەدوای یەکدا دەگەڕێنەوە بۆ ڕۆژانی 10 و 12 ی مانگی 12ی ساڵی 1971، ئەو کاتە تەمەنم 19 ساڵ بوو. چەند حەفتەیەک لەووبەر "ماریا" سەفەریکردبوو بۆ ستۆکهۆڵم، سێ چوار حەفتەیەک بوو دوو گیانبوو. لە ساڵانی دوابەدوای سەفەرەکەشیەوە تەنها چەند جارێکی کەم بینیمەوە، بەڵام ئێستاکە 26 ساڵی ڕەبەقە چاوم پێی نەکەوتووە. نازانم لە کوێ دەژی، تەنانەت ناشزانم هێشتام هەر لە ژیاندایە یان مردووە.
خۆزگە ئێستاکە لە کونێکەوە چاوی لێم دەبوو. ناچاربووم سەرلەبەیانیەک خۆم فرێدەمە ناو فڕۆکەیەکەوە و لە هەموو شتێک هەڵبێم. لەدواجاردا فشاری دەرەوەم هێندەی فشاری ناوەوەم وەستایەوە، لەوێدا بۆ یەکەمین جار هەستم بە هاوسەنگیەک کرد. ئێستاکە ڕوونتر بیردەکەمەوە. ئەگەر هێندە ئاگاداربم و خۆم زۆر







دەرنەخەم، ئەوا لەوانەیە بۆم بلوێت چەند حەفتەیەکی تریش لێرە بمێنمەوە، هەڵبەتە پێش ئەوەی تۆڕەکە بەتەواوەتی چواردەورم بتەنێت.

بێگومان دڵم بەوە خۆشە کە هەر هیچ نەبێت توانیم بەسەلامەتی لە پێشانگای کتێبەکەدا تێی بقوچێنم. هەتاوەکو فڕۆکەخانەکەش ئەوان دوام کەوتن، بەڵام لەوە دەچێت نەیانتوانیبێت بزانن سواری چ فڕۆکەیەک بووم. لە شاری "بۆلۆگنا"وە بلیتی یەکەمین فڕۆکەم کڕی کە لەو شارەوە دەردەچوو. «بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت دەزانن بەرەو کوێ دەتانەوێت سەفەرکەن؟» سەرم ڕاوەشاند و لەوەڵامدا وتم «هەر ئەوەندەم دەوێت کە دورکەومەوە، دەمەوێت سواری یەکەمین فڕۆکە ببم و تەواو». ئەوجا ئافرەتەکە سەری ڕاوەشاند، دواتریش پێکەنی و وتی «خەڵکانی وەک ئێوە کەمن، بەڵام بڕوام پێبکە ژمارەتان زیاتر و زۆرتر دەبێت». کاتێکیش بلیتەکەم وەرگرت وتی؛ «ئاخر... بەهەرحاڵ هیوای پشوویەکی خۆشت بۆ دەخوازم! بێگومان شایانی پشوویەکی ئاوهان».
خۆزگە دەیزانی، بریا دەیزانی کە من شایانی چیم.
بیست خولەکێک پاش ئەوەی فڕۆکەکەم فڕی، فڕۆکەیەکی تر بەرەو شاری "فرانکفۆرت" دەفڕی. من لەناو ئەو فڕۆکەیەدا نەبووم. بێگومان مەزەنەی ئەوەیان دەکرد کە من بە شەرمەزاری و ترسەوە بەرەو "ئۆسلۆ" بگەڕێمەوە. بەڵام کەسێکی شەرمەزار شتێکی باش ناکات گەر کورتترین ڕێگای ماڵەوە بگرێتە بەر.





لەم خوارانەوە لەسەر قەراغ دەریایەک ژوورێکم لە ئوتێلێکی کۆندا بەکرێ گرتووە. دانیشتووم و چاوم بڕیوەتە دەریاکە، قەڵایەکی دێرین لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەردین دەبینم. ماسیگرەکان و بەلەمە شینەکانیان دەبینم، هەندێکیان هێشتام لە بەندەرەکەدان و تۆڕەکانیان ڕادەکێشنەوە ناو بەلەمەکانیانەوە، هەندێکی تریشیان بە خۆیان و بەشە ڕاوەکەیانەوە بەرەو شۆستەی بەندەرەکە ملدەنێن.

زەویەکەی ژێر پێم بە خشتی کاشی سیرامیک داپۆشراوە. قاچم سەرمایەتی، سێ جوت گۆرەویم لەپێکردووە، بەڵام ساردی و شێی کاشیەکە هێشتام هەر دەیدات لە قاچم. ئەگەر ماوەیەکی تر هەروا ساردبێت، ئەوا بەتانی سەر جێگا گەورەکە ڕادەکێشم، قەدیدەکەم و وەک سەرینێکی بەرپێ لەژێر مێزی نوسینەکەدا دایدەنێم.

من هەروا بەرێکەوتێک لەم شوێنەدا گیرسامەوە. ڕێی تێدەچوو یەکەمین فرۆکە لە "بۆلۆگنا"وە بەرەو شاری لەندەن یان پاریس بفڕیایە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە ئەمە بەنرخە بۆم کە ئێستاکە لەکاتی نوسیندا لەسەر مێزێکی نوسینی کۆن دانیشتووم کە گەلێ ساڵ لەوەبەر نەرویجیەکی تر لەسەری دانیشتوە و شتی لەسەر نوسیوە، ئەویش دورەوڵات و ئاوارە بوو. ئێستاکە خۆم لە یەکێک لەو شارە ئەوروپیانەدا دەبینمەوە کە دەستپێشکەربوون لە بەرهەمهێنانی کاغەزدا. ئێستاکەش پاشماوەکانی شوێنی کاغەز دروستکردنە کۆنەکە وەک مرواریەکی بەرچاو لە خواروی دۆڵەکەوە ماوەتەوە. بێگومان دەبێت سەردانێکیان بکەم. بەڵام بەشێوەیکی گشتی دەشێ لە ئوتێلەکەدا بمێنمەوە. ئەو ژورەی کە گرتوومە نانخواردنی بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارەشی لەگەڵدایە.





پێموانیە کەسێک هەبێت لەم ناوەدا کە ناوی "جاڵجاڵۆکەکەی" بیستبێت. لێرە تەنها هەر باس باسی لیمۆ و گەشتیاریە و خۆشبەختانەش ئێستاکە وەرزی ئەوانە نیە. تاکوتەرا گەشتیار دەبینم بەپێی پەتی بە قەراغی ئاوەکەدا دەڕۆن، بەڵام هێشتام کاتی چوونە ناو ئاو نەهاتووە و لیمۆکانیش دەبێت چەند حەفتەیەکی تر بەدارەکانەوە بە هەڵواسراوی بمێننەوە.

ژورەکەم تەلەفونی تێدایە، بەڵام هیچ برادەرێکم نیە تا ڕازی خۆمی بۆ هەڵڕێژم. من لەدوای سەفەرەکەی ماریاوە هیچ برادەرێکم نەگرتووە. لە ڕاستیشدا من کەسێکی دۆست پەروەرنیم و ناشکرێت وەک کەسێکی ڕێزدار ناو ببرێم، بەڵام بەهەرحاڵ ناسیاوێکم هەیە کە حەزناکات مەرگی من ببینێت. ئەو بوو کە پێی وتم لە "کۆریرێ دیللا سیرا"دا وتارێک بڵاوکراوەتەوە و لەوە دەچێت بقەومێت. منیش بڕیارمدا سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر خۆم ونبکەم و بۆی دەربچم. لە ڕێگامدا بەرەو ئێرە کاتێکی باشم لەبەردەستدا بوو بۆ ئەوەی ئاوڕێک لە ڕابووردوی خۆم بدەمەوە. مەگەر تەنها خۆم بە تەواوەتی بزانم کە چیم کردووە.

بڕیارمداوە هەموو شتێک بخەمەڕوو. من بۆ ئەوە دەنوسم کە لە خۆم تێبگەم، هەتا لە تواناشمدابێت بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە شتەکان دەنوسم. ئەوەش مانای ئەوە نیە کە من جێگای متمانە بم. ئەو کەسەی کە بەدەمی خۆی دەڵێت من بەڕاست و دروستی دەربارەی ژیانم دەنوسم، لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا هەر بەرلەوەی ئازایانە دەست بەسەفەرەکەی بکات، کەشتیەکەی نقومبووە.





ئێستاکە ئاوها لێرەدا دانیشتووم و بیردەکەمەوە، لەم کاتەدا پیاوێکی بچکۆلە بە ژورەکەدا دێت و دەچێت. وەک درێژی و باڵا تەنها یەک مەتر دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی تەواوە و گەورەیە. ئەو پیاوە بچکۆلەیە چاکەت و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی لەبەردایە و جوتێ پێڵاوی چەرمی رەشی بریقەداری لە پێدایە، کڵاوێکی لبادی سەوز و قوچی لەسەرکردووە. بەژورەکەدا دەڕوات و گۆچانە حەیزەرانە بچکۆلەکەی بەملاولادا ڕادەوەشێنێت. جارجارێک بە گۆچانەکەی دەستی ئاماژەم بۆ دەکات، مەبەستیشی لەوەیە کە دەبێت دەست بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەم بکەم.
ئەو پیاوە بچکۆلە کڵاو قوچەبوو کە هانیدام هەموو ئەو شتانە بخەمە ڕوو کە لە یادمن.

بێگومان کاتێک کە یادەوەریەکانم دەکەوێتە بەردەستی خەڵکی، ئەو کاتە کوشتنم کەمێک قورستر دەبێت. ئەگەر تەنها خەڵکی وەک پسکەپسکێکیش بڵێن چاپکردنی یادەوەریەکانم نزیک بۆتەوە، ئەوا لەو بڕوایەدام بەغیرەتترین کەسیشیان ترسی لێبنیشێ. منیش لای خۆمەوە هەوڵدەدەم ئەو جۆرە پسکەپسکانە بڵاوبکەمەوە، بەڵکو خێراتر دەستبکەم بە نوسین.
وەک ئاگاداریەک دەڵێم من کۆمەڵێک کاسێتی "دیکتافۆن"م بەباشی لە سندووقی بانکێکدا پاراستووە، ناشمەوێت ناوی ئەو شوێنە بهێنم، بەڵام هەموو شتەکانم بە ڕێکوپێکی لە شوێنی خۆیاندایە. نزیکەی سەد دەنگێکم لەسەر ئەو کاسێتە بچکۆلانە تۆمارکردووە، هەمووشی هی ئەو کەسانەن کە دانیان بەوەدا داناوە کە هۆیەکی باشیان پێیە بۆ ئەوەی بمکوژن. هەندێکیان بە ئاشکرا هەڕەشەیان لێکردووم،



دەنگی هەر هەموویشیانم لەسەر کاسێتەکان هەیە. منیش یەک بەدوای یەک ژمارەم خستۆتە سەر کاسێتەکان، هەر لە ژمارەی (I)ەوە هەتا ژمارەی (XXXVIII) ڕۆیشتووە. جگەلەوەش پێرستێکی زۆر بەسەلیقەم بۆ دارشتووە و زۆر بە ئاسانی دەکرێت دەنگی کەسێکی دیاریکراو لەناو کاسێتەکاندا بدۆزرێتەوە. من خۆم پێشبینی ئەوەم کردبوو... کەسانێکیش هەن کە بەوە دەڵێن فێڵبازی، بەڵام دڵنیام لەوەی بەهۆی مقۆمقۆکردن لەسەر ئەو کاسێتە بچکۆلانانە بوو کە یەک دوو ساڵی ڕابووردوو توانیم بە زیندوویی بمێنمەوە. گومانیشم نیە کە بەهای ئەو کاسێتە بچکۆلە بێوێنانە لەگەڵ نوسینی ئەم تێبینیانەدا زۆر زیاتر دەبێت.
مەبەستم لەوە نیە کە نوسین و ئاشکراکردنی ئەم نهێنیە تایبەتیانەم گەرانتی ئەوەم بدەنێ کە بە ڕاشکاوی بژیم و بچم، تەنانەت کاسێتەکانیش ناتوانن جۆرە گەرانتیەکی ئاوهام بدەنێ. وام لە خەیاڵدایە لێرەوە بەرەو خواروی ئەمریکا سەفەربکەم یان ڕووبکەمە وڵاتێک لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات، بەڵام لەکاتی ئێستاکەدا تەنها بیر لە دوورگەیەکی ناو ئۆقیانوسی ئارام دەکەمەوە. خۆ من لە هەموو بارودۆخێکدا هەر دابڕاو و تەنیام، من هەمیشە هەر دورەپەرێزبووم. وای بۆدەچم ژیانی تەنهایی لەسەر دوورگەیەکی بچکۆلەی ئۆقیانوسی ئارامدا خۆشترێک بێت لە ژیانی تەنهایی ناو شارێکی گەورە.
ڕاستە سەرئەنجام پیاوێکی دەوڵەمەندم لێدەرچوو، بەڵام من ئەوەم بەلاوە سەیرنیە. لەوانەیە لە هەموو مێژوودا من یەکەمین کەسبووبم کە بەو کارە هەستابم، بەهەرحاڵ دیارە بەو شێوە بەرفراوانەی کە من کردوومە. بازاڕەکە سنووری بۆ نەبوو و منیش بەردەوام دەمتوانی کەرەسەیان بخەمە بەردەست. کارەکەم نەک تەنها ناپاسایی نەبوو،





بەڵکو لەسەروئەوەشەوە باجێکی زۆریشم لێدەدا. بەدەرلەوەش بەشی ژیانی خۆمم پەیدا دەکرد و ساڵانەش وەک هەموو پیشەیەکی تر گەر پێویست بوایە باقی باجی خۆمم لێدەدا. کاری مامەڵە و ئاڵوگۆڕیەکانم لەگەڵ مشتەریەکانیشمدا شتێکی نایاسایی نەبوو، تەنها ئەوەندە بوو کە بووە مایەی شەرمەزاریان.

من هێندە دەزانم کە لەئێستا بەدواوە پیاوێکی بێ ئۆقرە و بێ ئارامم، بەو شێوەیەش لە زۆربەی خەڵکی هەژارترم. بەڵام شێوەی ژیانم بەلاوە خۆشبوو و نەمدەویست ئەو ژیانەم بگۆڕمەوە بە ژیانی مامۆستایەک. نەشمدەویست وەک نوسەرێک ژیانم بەسەربەرم. من هەرگیز نەمتوانیوە ژیانێکی تایبەت بژیم.

پیاوە بچکۆلەکە دەمشڵەژێنێت. تەنها ڕێگەش بۆ ئەوەی سەرنجمی لەسەر لابەرم ئەوەیە کە خێراتر بنوسم. دەمەوێت لەو شوێنەوە دەست پێبکەم کە بیرمدێتەوە.

## "پیتەر"ە پچکۆلەی جاڵجاڵۆکە[1]

من خۆم لەو بڕوایەدام کە سەردەمێکی منداڵی ئاسودە و خۆشم بەسەربردبێت، بەڵام دایکم لەو بڕوایەدا نەبوو. هێشتام بەرلەوەی لە قوتابخانەدا وەربگیرێم، هەواڵی هەڵسوکەوتە ناکۆمەڵایەتیەکانی منیان بەگوێیدادا.

[1] هاوکات ناوی گۆرانیەکی منداڵانە.





یەکەمین جار کە دایکمیان بۆ گفتوگۆیەکی گرنگ بانگهێشکرد، ئەو کاتەبوو کە من لە باخچەی ساوایان بووم. منداڵەکان سەرقاڵی یاریکردنی خۆیان بوون، منیش بەدرێژایی ئەو پێش نیوەڕۆیە هەر دانیشتبووم و چاوم تێبڕیبوون. بەڵام مەزاجم پەست و توند نەبوو. من چێژم لە تەماشاکردنی ژیانی پڕلەچالاکی ئەو منداڵانە دەبینی. زۆربەی منداڵان پێیان خۆشە تەماشای بەچکە پشیلە و تەیری کەناری و "هامستەر"[2] بکەن، منیش پێم خۆشبوو، بەڵام بەلامەوە خۆشتربوو لە منداڵەکان وردببمەوە. جگەلەوەش من بەڕێوەم دەبردن، من بڕیاری هەموو ئەو شتانەم دەدا کە دەیانکرد و دەیانوت. ئەوان خۆیان ئەوەیان نەدەزانی، تەنانەت مامۆستاکەشمان پەی بەوە نەدەبرد. هەندێ جار تام لێدەهات، لەبەرئەوە ناچاربووم لە ماڵەوە بمامایەتەوە و گوێ بۆ نرخی بۆرسەکان شلبکەم. ئەو ڕۆژانە باخچەی ساوایان بەتەواوەتی خامۆشبوو و هیچ شتێکی وای تێدا ڕوونەدەدا، تەنها ئەوەندە نەبێت کە منداڵەکان جلوبەرگی دەرەوەیان لەبەردەکرد و دایاندەکەندەوە، لەبەریاندەکرد و دایاندەکەندەوە. من بەخیلیم پێنەدەبردن. وابزانم تەنانەت نانی نیوەڕۆشیان نەدەخوارد. تەنها ڕۆژی یەکشەممان باوکمم دەبینی. ڕۆژێکیان پێکەوە ڕۆیشتین بۆ سێرک. زۆرم بەلاوە خۆشبوو، بەڵام کە هاتمەوە ماڵەوە نەخشەی سێرکێکی تایبەت بە خۆمم داڕشت، وە زۆریش باشتربوو لەو سێرکەی کە لەگەڵ باوکمدا بینیم. ئەو کاتە هێشتام فێری نوسین نەبووبووم، بەڵام سێرکێکی نایابی پڕبەدڵی خۆمم لە مێشکمدا خوڵقاند. هێندە سەخت نەبوو. وێنەی سێرکەکەی خۆشم کێشا، تەنها بە هێڵکاری

[2] گیاندارێکی شیردەرە و لە کەروێشک و مشک دەچێت.





کێشانی خێمە و گەورەکانیشەوە نەوەستام، بەڵکو وێنەی هەموو ئاژەڵ و پاڵەوانەکانی سێرکەکەشم کێشا. من وێنەکێشانەکەم بەلاوە سەختبوو، چونکە لەو بوارەدا هێندە بەهرەمەند نەبووم، لەبەرئەوە زۆر بەرلەوەی دەستبکەم بە قوتابخانە، وازم لە وێنەکێشان هێنا.

لەسەر فەرشە گەورەکە دانیشتبووم و بەئاستەم دەجوڵامەوە. دایکیشم زوو زوو دەیوت «ئەوە تۆ بیر لەچی دەکەیتەوە؟» منیش راست و دروست وەڵامم دایەوە و وتم «یاری سێرک دەکەم» دواتریش ئەو وتی «ئەی بۆ یارییەکی تر نەکەین؟»

منیش وتم؛ «ئەو کچەی کە خۆی بە جۆلانەکەدا هەڵواسیوە ناوی "پەنینا مەنینا"یە. ئەو کچی بەرێوەبەری سێرکەکەیە. بەلام هیچ کەسێک لە سێرکەکەدا ئەو راستیە نازانێت، خۆشی نازانێت، تەنانەت بەرێوەبەری سێرکەکەش بێئاگایە لەو راستیە»

دایکم بە سەرنجەوە گوێی بۆ شلکردبووم. دەنگی رادیۆکەی کزکرد و منیش لەسەر قسەکانم بەردەوامبووم؛ «رۆژێک لە رۆژان لە جۆلانەکەوە دەکەوێتە خوارەوە و ملی دەشکێت. ئەوەش دواهەمین نمایشی سێرکەکە دەبێت لەو شارەدا، چونکە لەوە بەدواوە هیچ کەسێک نایەوێت بلیتی ئەو سێرکە بکرێت. بەرێوەبەری سێرکەکە بەسەر ئەو کچە داماوەدا دەچەمێتەوە و زریزە باریکەکەی ملی کچەکە دەبینێت. بە زریزەکەوە چاوەزارێکی پێوە هەڵواسراوە کە لە زەرەک دروستکراوە و لەناویدا جاڵجاڵۆکەیەکی بەبەردبووی تێدایە کە تەمەنی چەندەها ملیۆن ساڵ دەبێت. لێرەشەوە بەرێوەبەری سێرکەکە ئەوەی بۆ روونەبێتەوە کە "پەنینا مەنینا" کچی خۆیەتی، چونکە کاتی خۆی کە ئەو کچە لەدایک بووە، خۆی ئەو چاوەزارە دەگمەن و بێوێنەیەی بۆ کریوە»





دایکم وەک نارەزایی دەربرینێک وتی؛ «کەواتە بەلایەنی کەمەوە هیچ نەبێت دەزانی کە کچێکی هەیە»

منیش بۆم روونکردەوە و وتم؛ «بەڵێ، بەلام لەو بروایەدابوو کە خنکابێت. چونکە کچی بەرێوەبەری سێرکەکە لەو کاتەدا کە تەمەنی ساڵ و نیوێک بووە، کەوتۆتە ناو روباری "ئاکەرس"ەوە. ئەو کاتە ناوی "ئانا لیس"بووە. دواتریش بەرێوەبەری سێرکەکە نەیدەزانی کە ماوە»

دایکم بەتەواوەتی سەریسورما. لەوە دەچوو باوەر بە چیرۆکەکەم نەکات، لەبەرئەوە وتم؛ «بەلام خۆشبەختانە ژنێکی فالگرەوە لەناو ئاوە ساردەکەدا رزگاری دەکات، ئەو ژنە بەتەنها لە "نیودالن"دا لەناو کەرەڤانەیەکی پەمەیدا دەژیا. لەو رۆژەشەوە کچی بەرێوەبەری سێرکەکە لەگەڵ ئەو ژنە فالگرەوەیەدا لەناو کەرەڤانەکەدا ژیانی بەسەردەبرد»

دایکم جگەرەیەکی بۆ داگیرساند. دیاربوو نائارامبوو، بە خۆی و جلوبەرگە تەسکەکەی بەریەوە بە هێواشی دەهات و دەچوو؛ «بەراستی لە کەرەڤانەیەکدا دەژیان؟»

من سەرم بۆ لەقاند؛ «کچەی بەرێوەبەر هەر لەکاتی لەدایک بوونیەوە لە کەرەڤانەیەکی سێرکدا دەژیا. لەبەرئەوە بەلایەوە زۆر زۆر سەیردەبوو ئەگەر لە پرێکدا بیانگواستایەتەوە ناو یەکێک لە ئەپارتمانەکانی باڵەخانە مۆدێرنەکان. ژنەی فالگرەوەکە نەیدەزانی ناوی کچەکە چیە، بەلام بەناوی "پەنینا مەنینا"وە بانگی دەکرد و لەوە بەدواشەوە ئەو ناوەی بەسەردا دابرا»

لەوێدا دایکم پرسیارێکی کرد و وتی؛ «ئەی چۆن گەرایەوە بۆ ناو سێرکەکە؟»





منیش لە وەڵامدا وتم؛ «کە گەورەبوو. ئەمەیان تێگەیشتنی ئاسانە،
کە گەورەبوو خۆی دەڕۆیشت بۆ سێرک. سەختیش نەبوو بۆی، چونکە
ئەو کاتە هێشتام ئیفلیج نەبووبوو!»
دایکم بەرەنگاری قسەکەمی کرد و وتی؛ «ئێ خۆ ئەو لەبیری چووبۆوە
کە کچی بەڕێوەبەری سێرکەکەیە»
خەریکبوو دەست لەچیرۆکەکەم هەڵبگرم. ئەوە یەکەم جار نەبوو کە
دایکم نائومێدم بکات، جارجارێک دایکم زۆر بەساکارانە
بیریدەکردەوە.
«ئێ باسی ئەوەمان کرد... من وتم ئەو نەیدەزانی کە کچی
بەڕێوەبەری سێرکەکەیە و بەڕێوەبەری سێرکەکەش ئەوەی نەدەزانی.
بێگومان کچەکەی خۆی ناناسێتەوە، چونکە لەو کاتەوەی تەمەنی ساڵ
و نیوێک بووە ئەو چاوی پێنەکەوتووە»
لەوێدا دایکم وایدەزانی دادەمێنم و ناچارم بیر لە دواتری چیرۆکەکەم
بکەمەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێک پێویستم بە بیرکردنەوە نەبوو. لەسەر
گێڕانەوەکەم بەردەوامبووم؛ «هەمان ئەو ڕۆژەی کە ژنە فاڵگرەوەکە
کچی بەڕێوەبەری سێرکەکەی لە ڕوبارەکەدا دەرهێنا، تەماشای تۆپە
کریستاڵەکەی کرد و پێشبینی ئەوەی کرد کە ئەو کچە بچکۆلەیە
دەبێتە پاڵەوانێکی سێرکی بەناوبانگ، بەو شێوەیەش ڕۆژێک لەڕۆژان
خۆی بەپێی خۆی ڕووی لە جیهانی سێرک کرد. هەموو ئەو شتانەی کە
فاڵگرەوەیەکی ڕاستەقینە لە تۆپە کریستاڵەکەیدا دەیبینێ، کتومت
دێنە دی. هەرلەبەرئەوەش بوو کە ژنە فاڵگرەوەکە ناوێکی تایبەت بە
سێرکی بە کچەکە بەخشی، هەروا بۆدڵنیایش هەندێ هونەری تایبەت
بە جۆلانە و پاڵەوانبازی فێرکرد»







لەسەر پیانۆ سەوزەکەمان تەپڵەکێکی جگەرەی لێبوو، دایکم
جگەرەکەی تێدا کوژاندەوە و دواتر وتی؛ «بەڵام چ پێویستی دەکرد
ژنە فاڵگرەوەکە فێری هونەری سێرکی بکات»
قسەکەم پێبڕی؛ «ئەو کاتەی کە "پەنینا مەنینا" ڕۆیشت بۆ سێرکەکە
و توانای خۆی نیشاندان، یەکسەر وەک کارمەندێکی سێرک
دایانمەزراند. پاش ماوەیەکی کەمیش هێندەی "ئابووت و کۆستیللۆ"
ناوبانگی دەکرد. بەڵام بەڕێوەبەری سێرکەکە ئەو کاتە نەیدەزانی کە
ئەوە کچی خۆیەتی. ئەگەر ئەو ڕاستیەی بزانیبایە، ئەوا بێگومان
نەیدەهێشت ئەو هەموو هونەرە پڕمەترسیانە ئەنجامبدات»
دایکم وتی؛ «وابزانم ئیتر من دەستهەڵدەگرم. تاقەتی پیاسەیەکی ناو
باخچەکەت هەیە؟»
بەڵام من لەسەر باسەکەم بەردەوامبووم؛ «جگەلەوەش ژنە
فاڵگرەوەکە لە تۆپە کریستاڵەکەیدا ئەوەشی بینیبوو کە "پەنینا
مەنینا" ڕۆژێک لەڕۆژان لە سێرکەکەدا ملی خۆی دەشکێنێت... هیچ
کەسێک ناتوانێت بەهیچ شێوەیەک بەرەنگاری بکات لەبەردەم
پێشبینیەکدا کە هەر بێتەدی. لەبەرئەوە ژنە فاڵگرەوەکە هەموو
شتەکانی کۆدەکاتەوە و دەگوێزێتەوە بۆ سوید»
دایکم چوو شتێک لە چێشتخانەکە بهێنێت. سەلکە کەلەرمێکی
گەورەی بەدەستەوە گرتبوو و دەمی داپچڕیبوو. بەلایەنی کەمەوە ئەو
سەلکە کەلەرمە لەو تۆپە کریستاڵە نەدەچوو؛
«ئەی بۆچی گواستیەوە بۆ سوید؟»
لەوەوپێش بیرم لەوەش کردبۆوە. لەوەڵامدا وتم؛ «بۆئەوەی
بەڕێوەبەری سێرکەکە و ژنە فاڵگرەوەوەکە شەڕ لەسەرئەوە نەکەن
کە "پەنینا مەنینا" لەلای کامیان بمێنێتەوە، چونکە وەک پێشبینی





کردبوو ملی خۆی دەشکێنێت و ئەو کاتە بێگومان پێویستی بە کەسێک دەبێت کە ئاگای لێبێت»

دایکم وەک پرسیارێک وتی؛ «باشە، ژنە فاڵگرەوەکە دەیزانی کە بەرێوەبەری سێرکەکە باوکی کچەکەیە؟»

«نەخێر، ئەو کاتە بۆی دەرکەوت کە "پەنینا مەنینا" چوو بۆ سێرک. تەنها ئەو کاتە لە تۆپە کریستاڵەکەیدا ئەو ڕاستیەی بینی کە کچەکە ڕێک لەدوای مل شکاندنەکەیەوە بەباوکی شاد دەبێتەوە، لێرەشەوە ژنە فاڵگرەوەکە وای بەباشزانی کەرەڤانەکەی بگوێزێتەوە بۆ سوید. پێی باشبوو کە "پەنینا مەنینا" لە دواجاردا بە باوکی شاد دەبێتەوە، بەڵام بەلایەوە شتێکی خراپبوو کە دبوایە ملی بشکایە بۆ ئەوەی باوکی بیناسیایەتەوە»

لەوێدا نەمدەزانی بە چ شێوەیەک بەردەوامی بە چیرۆکەکەم بدەم. نەک لەبەرئەوەی کە سەختبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، چەندەها بواری جیاوازم لەبەردەستدابوو. وتم؛ «دواتر "پەنینا مەنینا" لەسەر کورسیەکی تایبەت بە کەمئەندامان ژیان بەسەردەبات و لە سێرکەکەدا پەشمەک دەفرۆشێت. پەشمەکێکی زۆر تایبەتیە و هەموو ئەوانەش کە لەو پەشمەکە دەخۆن لە ڕادەبەدەر بە گاڵتەبازەکانی سێرکەکە پێدەکەن، لە پێکەنیندا خەریکە هەناسەیان سواربێت. کەرەتێکیشیان بەڕاستی کوڕێکی بچکۆلە هەناسەی سواردەبێت. دواتر کە دێتەوە سەرخۆی دەڵێت؛ "پێم خۆشبوو کە هێندە زۆر بە گاڵتەبازەکان پێکەنیم، بەڵام زۆرم بەلاوە خۆشنەبوو کە هەناسەم بۆ نەدەدرا"»

لەڕاستیدا لێرەدا ئەو چیرۆکەی کە دەربارەی "پەنینا مەنینا"بوو کۆتایی پێهات، چونکە دەستمکرد بە باسکردنی ئەو کوڕەی کە لەبەر



پێکەنین هەناسەی بۆ نەدرابوو. جگە لەوەش چەندەها گاڵتەبازی تری سێرکەکەشم لەبەردەستابوو کە بیریان لێبکەمەوە، وەک وتم خۆم بەرپرسیاری هەموو سێرکەکەبووم.

دایکم ئەوەی نەدەزانی. وتی؛ «بەڵام خۆ "پەنینا مەنینا" دایکی هەبوو؟»

منیش لەوەڵامدا وتم _لەڕاستیدا وابزانم قیژاندم_؛ «نەخێر، چونکە دایکی مردبوو!»

ئەوجا دەستمکرد بەگریان، وابزانم یەک سەعاتی ڕەبەق گریام. دایکیشم، وەک هەمیشە، دڵنەوایی دەدامەوە. من چیرۆکە غەمگینەکەم نەیخستمە گریان، بەڵکو گریانەکەم لەبەرئەوەبوو کە لە فەنتاسیای خۆم دەترسام. بەدەرلەوەش لە پیاوە بچکۆلەکەش دەترسام کە گۆچانە حەیزەرانەکەی بەدەستەوەبوو. لەو کاتەدا کە من چیرۆکەکەم دەگێڕایەوە، لەسەر سنووقە ئێرانیەکە دانیشتبوو و تەماشای قەوانەکانی دایکمی دەکرد. بەڵام دواتر بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. تەنها من دەمبینی.

یەکەمین جار ئەو پیاوە کڵاو سەوزەم لە خەوێکدا بینی. بەڵام لە خەوەکە هاتە دەرەوە و لەو کاتەوە بەدوامەوەیە. ئەو لەو بڕوایەشدایە کە دەسەڵاتی بەسەر مندا هەبێت.

فەنتاسی کردن هەر زۆر ئاسان بوو، وەک ئەوە وابوو کە لەسەر سەهۆڵێکی تەنک سەمابکەیت، وەک ئەوە وابوو لەسەر نوکی پەنجە لەسەر تویژاڵێکی ناسک خۆت وەرچەرخێنیت و تویژاڵەکەش لەسەر ئاوێکی یەکجار قوڵ بێت. هەمیشە لەژێر رووکەشەکەشیەوە شتێکی سارد و تاریک و نادیاری لێبوو.





*

من هەرگیز بەلامەوە سەخت نەبووە کە فەنتاسی و هەقیقەت لەیەکتر جودابکەمەوە. بەڵکو گرفتەکە لەوەدابوو کە یادوەری فەنتاسی و یادوەری هەقیقەت لەیەکتر جیابکەمەوە. ئەوەش شتێکی تەواو جیاوازە. من هەمیشە دەمتوانی ئەو شتانە جودابکەمەوە کە بەڕاستی دەمبینین و ئەو شتانەش کە بەخەیاڵ وامدەزانی دەیانبینیم. بەلام بەهەرحاڵ لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا سەختە بۆم ڕووداوە ڕاستەقینەکان لەو ڕووداوانە جودابکەمەوە کە بەخەیاڵ دامرشتبوون. هێزی وەبیرهاتنەوەم لەتوانایدا نیە ئەو شتانەی کە بینیوومن و گوێم لێبوون لەو شتانە جودابکاتەوە کە خۆم لەخەیاڵی خۆمدا هەڵمبەستبوون. من تەنها یەک یادوەریم هەیە و لەوێدا دەبێت جێگای هەردوو مۆرکە هەستیەکانی ڕابووردو و فەنتاسیە کۆنەکانمی تێدا ببێتەوە. تێکەڵەی ئەو دوو لایەنەش ئەو شتە پێکدەهێنێت کە پێی دەوترێت یادوەری. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ئەو دوو لایەنە تێکەڵدەکەم، ئەو کاتانە هەستدەکەم خەتای یادوەریمە کە لاوازە. لێرەشەوە لە باشترین حاڵەتدا دەربڕینەکانم ورد دەرناچن. چونکە جارجارێک شتێکم وەک تاقیکردنەوەیەکی ڕاستی بیردێتەوە، هەرچەندە لە هەقیقەتدا شتێک بووە کە بەخەو بینیومە، بەلام هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خاوەنی یادوەریەکی باشم. من هەمیشە کە یەکێک لەو ڕووداوانەم بیردەکەوێتەوە کە تەنها لە ئاگایی مندا ڕوویانداوە، هەستدەکەم سەرکەوتنێکم بەسەر یادوەریمدا بەدەستهێناوە.



زۆر جار بەتەنها لە ماڵەوە دەبووم. دایکم تا پاشنیوەڕوانێکی درەنگ لە خانەی شارەوانی کاری دەکرد، هەندێ جاریش سەردانی برادەرەکانی دەکرد. من خۆشم هیچ برادەرێکم نەبوو، چونکە حەزمدەکرد سەربەستبم. ئەو شتانەی کە بەتەنها دەمتوانی بیانکەم، هێندە زۆر بوون کە بەهیچ جۆرێک نەدەکرا بەراوردیانبکەم لەگەڵ ئەو شتانەی کە لەگەڵ خەڵکانی تردا دەمکردن.

هەمیشە وام پێخۆشبوو کە تەنهابم. لە هەموو سەردەمی منداڵیمدا تەنها چەند جارێکی کەمم بیردەکەوێتەوە کە بێتاقەتبووبم، هەموو ئەو جارانەش لەگەڵ منداڵێکی هاوتەمەنی خۆمدا بووم. بیرمدێت یاریکردن لەگەڵیاندا سەخت بوو، یاریە خاوە خاوەکانیان بێزاریدەکردم. هەندێ جاریش دەموت «دەبێت بەپەلە بگەڕێمەوە ماڵەوە، چونکە میوانم دێت»، بەلام ڕاستم نەدەکرد.

من هەرگیز ئەو ڕۆژەم بیرناچێتەوە کە بۆ یەکەمین جار کۆمەڵێک کوڕ لە دەرگاکەیان داین و دەیانویست لەگەڵیاندا یاریبکەم. جلوبەرگی پیسیان لەبەردابوو، یەکێکیان چڵم بە لوتیدا هاتبووە خوارەوە، پرسیارێکیان لێکردم و وتیان "حەزدەکەیت لەگەڵماندا یاری "کاوبۆ و هندیە سورەکان" بکەیت؟". درۆیەکم دۆزیەوە و وتم "سکم دێشێ"، هەندێ جاری تریش بەس بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا یاری نەکەم، هۆکاری جوانترم بۆ دەهۆنینەوە. هیچ خۆشیەکم لە یاری "کاوبۆ و هندیە سورەکان" نەدەبینی کە لەنێوان تەنافی جلەکان و ماشێنەکاندا دەیانکرد. من زۆر بەشێوەیەکی باشتر ئەو یاریەم لە فەنتاسی خۆمدا دەکرد؛ لەوێدا چەندەها ئەسپی جوان و تەوری هندیم هەبوو، چەندەها تفەنگ و تیروکەوان و کاوبۆ و سەرۆک هۆز و پزیشکی







جادووگەرم بەکاردەهێنا. دەمتوانی لە ژوورەکەدا یان لە چێشتخانەکەدا دابنیشم و بەبێ ئەوەی بجوڵێمەوە قەشەنگترین و خۆشترین شەڕی نێوان هندیە سورەکان و کاوبۆکان بهێنمە بەرچاوم، هەمیشەش لایەنگری هندیە سورەکانبووم. ئەمڕۆکە تاڕادەیەک هەموو لایەنەکان پشتگیری هندیە سورەکان دەکەن، بەڵام تازە درەنگە. هەر لەو کاتەوەی کە تەمەنم سێ چوار ساڵانبوو حەزمدەکرد ئەمریکیەکان بەرامبەرێکی بەتوانایان هەبێت. ئەگەر هەوڵوتەقەلای من نەبوایە، لەوانەیە ئەمڕۆکە تەنانەت یەک شوێنی ئارام و پڕئاسایش نەبوایە کە هندیە سورەکانی تێدا بژین.

کورەکان چەندەها جاریتریش هاتنەوە بۆلام. دەیانویست یاری هەڵماتێن و جۆجۆ و فتبۆڵێنیان لەگەڵدا بکەم، پێیانخۆشبوو پێکەوە بەری سنجو بخەینە ناو قامیشی بۆشەوە و فووی پیابکەین و بیگرینە یەکتری، بەڵام لەگەڵئەوەشدا هەرزوو دەستیان لە بێزارکردنم هەڵگرت و بەڕاکردن بە پلیکانەکاندا دەچوونە خوارەوە. هێندەی دێتەوە یادم لە تەمەنی هەشت نۆ ساڵیدا چیتر هیچ کەسێک لە دەرگای نەدەدام بۆ ئەوەی یاری لەگەڵدا بکەم. هەندێ جار لەپشت پەردە پەڕەپەڕەکەی چێشتخانەکەوە لەسەر کورسیەک دادەنیشتم و بەدزیەوە سەیری منداڵە هاوتەمەنەکانی خۆمم دەکرد. وەک شتێکی کاتی بەلامەوە خەمڕەوێنبوو، بەڵام قەت هەستم نەدەکرد پێویستم بەوە بێت بە جەستە لەگەڵیاندابم.

ئەو شێوازی ژیانەم لەگەڵ تەمەنی باڵقبوونمدا شیرازەی تێکچوو. لەو کاتەوەی کە تەمەنم گەیشتە دوانزە ساڵ، زۆر شت هەبوون کە حەزمدەکرد لەگەڵ کچێکی هاوتەمەنی خۆمدا بیکەم _بەلاشمەوە ئاسایی بوو گەر چەندەها ساڵیش لە خۆم بەتەمەنتربوایە.



ئارەزووەکانم نائارامی کردبووم، بەڵام هەرگیز رووینەدا کە کچێک لەدەرگام بدات و بانگم بکاتە دەرەوە. هیچ لاریەکەم نەدەبوو ئەگەر لەگەڵ کچێکدا کە دڵم بۆی لێبدایە پیاسەیەکی قەراغ ئاوم بکردایە، یان لەگەڵیدا بچوومایەتە لای دەریاچەی "سەلەمەندەر"ەوە.

ئەو کاتەش کە بەقوڵی تاسەی شتێکی ڕاستەقینەم کرد، بۆ یەکەمین جاربوو لە ژیانمدا کە هەستم بە تەنهایی کرد. تەنهایی و تاسەکردن دوو دیوی هەمان بابەتن.

*

ئەو کاتانەی بەتەنها لە ماڵەوە دەبووم، بەردەوام خەریکی تەلەفونکاری بووم و تاڕادەیەکیش تەنها هەر بۆ "ڕاپواردن" بەکارم دەهێنا. تەکسیەکان لەسەری سەرەوەی لیستەی ڕابواردنەکەمدابوون. کەرەتێکیان شەش تەکسیم بەیەکەوە بۆ ماڵێکی بەرامبەرمان بانگکرد. بەلامەوە خۆشبوو لەسەر پەنجەرەی چێشتخانەکەمان دابنیشم و تەماشای ئەو هەموو تەکسیانە بکەم کە دەهاتنە کۆڵانەکەوە. هێندەی نەبرد شۆفێری تەکسیەکان لە ماشێنەکانیان دابەزین و کەوتنە قسەکردن لەگەڵ یەکتری، بێگومان مەزەنەی ئاهەنگێکی قاوەخواردنەوەی گەورەیان دەکرد و لەو خەیاڵەدابوون هەموو میوانەکان بگەیەننەوە ماڵی خۆیان. دواجار یەکێکیان بەرەو ڕاڕەوی باڵەخانەکە ڕۆیشت و زەنگی دەرگای قاتی خوارەوەی لێدا. بەڵام هیچ کەسێک بەناوی "خانم نیلسن"ەوە لەو خانوەدا نەدەژیا. ئەوان بەئاگا نەبوون لەو ڕاستیە، بەڵام من دەمزانی. کەمێک لەوێدا مانەوە و لە داخا دەستیان بەملاولادا بادەدا، دواتریش سواری





ماشێنەکانیان بوونەوە و بەپەلە ونبوون. بەڵام یەکێک لە شۆفێرەکان کەمێک زیاتر مایەوە و هەر سەیری ئەملاولای خۆی دەکرد، هەر دەتوت لەسەر تەختەی شانۆیەک وەستاوە، بەڵام تەماشاکەرانی نەدەبینی. لەوانەیە بیری لەوە کردبێتەوە کە تەنها خودا بتوانێت بیبینێت. من دانیشتبووم لە پەرەکەی پەردەکەوە تەماشامدەکرد. پێکەنینم دەهات، قومێک شەربەتی پرتەقاڵم لە پەرداخەکەی خۆمدا خواردەوە، بەڵام پیاوەکە هەر لەشوێنی خۆیدا وەستابوو. ئێ خۆ هەر هیچ نەبێت دەیتوانی بچێت لە ماشێنەکەیدا دابنیشێت و ئامێری ژماردنی پارەکەی بکوژانایەتەوە.

ئەوەشم بەلاوە خۆشبوو کە تەلەفونبکەم بۆ تەکسی و بیانئێرم بۆ شوێنێکی تری شارەکە. پێمخۆشبوو بیر لەوە بکەمەوە کە تەکسیەکان دەکەونە جوڵە و بە شارەکەدا دەخولێنەوە، هەرچەندە نەشمدەتوانی بەچاوی خۆم بیانبینم. من زۆر بەڕوونی لە مێشکی خۆمدا دەمبینین، لەو بروایەدام گەر بەڕاستیش بمبینیایە هەر ئەوەندەم پێخۆشبوایە. هەندێ جار تەلەفونم بۆ ماشێنی فریاگوزاری و ئاگرکوژێنەوەش دەکرد. یەک کەڕەتیش تەلەفونم بۆ پۆلیس کرد و وتم پیاوێکی مردووم لە کێڵگەکەدا بینیوە. ناچاربووم ناوی خۆم و ناونیشان و ناوی قوتابخانەکەشمیان پێبڵێم. منیش بەبێ هیچ گرفتێک لە خۆمەوە هەمووم بۆ هەڵبەستن. دەمزانی کە ماشێنی پۆلیسەکە بەناچاری دەبێت بەلای باڵەخانەکەی ئێمەدا تێپەڕێت، هەڵبەتە بۆئەوەی بگاتە لای کێڵگەکە. پاش هەشت خولەکی ڕێک ماشێنێکی پۆلیس پەیدابوو، دوو خولەکیش بەدوایدا ماشێنێکی فریاگوزاری هات. ئەوانە هەموویان ماشێنی من بوون.





هەموو ئەوانە وەک یادەوەری ڕووداوێکی ڕاستەقینە لە مێشکمدایە. من هیچ گومانێکم لەوە نیە. تەلەفونە ڕەشەکەی سەرمێزە بچکۆلەکەی داڵانەکە بەردەوام فریویدەدام. جارجارێک هەروا لەسەر کورسیەکە دادەنیشتم و هەر لە خۆمەوە تەلەفونم بۆ یەکێک دەکرد. زۆرینەی جارەکان کە پێش کاتژمێری چوار تەلەفونم دەکرد، ئافرەتێک تەلەفونەکەی هەڵدەگرت، کاتێکیش کە دەکەوتمە قسەکردن لەگەڵیدا، دەنگی خۆمم لێدەگۆڕی و پرسیاری جیاوازم لێدەکرد بۆ نمونە لێمدەپرسی؛ "زوو زوو لەگەڵ مێردەکەتا دەخەویت"، یاخود دەموت "جگە لە مێردەکەت لەگەڵ کەسی تریشدا دەخەویت؟" یان خۆمم وەک ڕاوێژکاری بەرهەمی "سابا دی لۆکس" پێدەناساند. ئەو کاتانەشم دەژمارد کە لەگەڵ ئافرەتەکاندا قسەم دەکرد. زۆرینەی جارەکان لە چەند چرکەیەک تێنەدەپەڕی، بەڵام کەڕەتێکیان زیاتر لە نیو سەعات لەگەڵ ئافرەتێکدا قسەمکرد، تائەو کاتەی تاقەتم هەبوو قسەم لەگەڵدا کرد. بەڵام خۆ دەبوایە سنورێکیشم بۆ خۆم دابنایە، لە دواجاردا پرسیارێکی زۆر بێشەرمانەم لێکرد و ناچارانە کەوتە بۆڵەبۆڵ و وتی؛ «ئەمە یەکەمین کەڕەتە کە گوێم لەشتی وابێت». لەدڵی خۆمدا وتم بێگومان گوێت لە شتی ئەوها نەبووە، بەڵام ئیدی ئەو تەلەفونەکەی داخستەوە. من پێم وابوو کە ئافرەتێکی بەختەوەربووبێت، چونکە بواری بۆ ڕەخسا کە زیاتر لە نیو سەعات لەگەڵمدا قسەبکات.

تاوناتاوێکیش چیرۆکی دوورودرێژم بۆ ئەو ئافرەتانە دەهۆنیەوە کە قسەم لەگەڵیاندا دەکرد. بۆ نمونە دەموت من تەمەنم تەنها حەوت ساڵە، بەڵام دایک و باوکم بەپاپۆڕ سەفەریانکردووە بۆ لەندەن و بۆ ماوەی نۆ ڕۆژ دەبێت بەتەنها بیگوزەرێنم. زیاتریش دەموت؛





یەخچاڵێکمان کڕیوە و دایکم پڕی کردووە لە خواردن بۆم، بەڵام ناوێرم هیچ شتێک دەربهێنم و بیخۆم، چونکە دەترسم چەقۆ تیژەکان بەکاربهێنم و شوێنێکی خۆم بریندار بکەم. یان بە شێوەیەکی تر دەستم بەقسەکانم دەکرد و دەموت باوکم چووە بۆ ڕاوە قەتێ و دایکیشم نەخۆشە و لە جێگادا کەوتووە، هێندە نەخۆشە کە ناتوانێت قسەبکات. ئەوانیش لەڕادەبەدەر دەستی یارمەتیان بۆ درێژدەکردم، هەڵبەتە گەر تەنها ناو و ناونیشانی خۆمم بدایە بە ئافرەتەکان. بەڵام بێگومان نەمدەویست ئەو زانیاریە تایبەتیانەی خۆمیان بخەمە بەردەست. لەبەرئەوە وام بەباشدەزانی بڵێم پیاوێکی بچکۆلە لە ماڵەکەماندایە و هەروا بۆ خۆشی فریویدام کە تەلەفونتان بۆ بکەم. دەموت باڵای تەنها یەک مەترە و لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری ماڵەکە ڕادەکات. دواتریش دەموت؛ «ئەگەر بەقسەی ئەو نەکەم، بە گۆچانەکەی لێمدەدات»

کەڕەتێکیان دایکم لەسەر پارەی تەلەفون کردی بە بۆڵەبۆڵ. زۆر زۆر توڕە بوو، منیش یەکسەر دانم بە کارەکەی خۆمدا نا. وتم من ڕۆژانە تەلەفون بۆ بەدالە دەکەم بۆئەوەی بزانم کاتژمێر چەندە، هەرچەندە خۆشم ئەوە دەزانم. پێشموت هەندێ جار شەش حەوت کەڕەت لەسەریەک تەلەفون بۆ کاتژمێر دەکەم، چونکە بێتاقەتم. بەشێوەیەک خۆم نیشانی دایکمدا وەک ئەوەی کە نەزانم ئەو ئافرەتەی کاتژمێرەکە دەڵێت، ئافرەتێکی ڕاستەقینە نیە. وتم ئاخر ئەمویست قسەی لەگەڵدا بکەم، بۆیە بەردەوام تەلەفونم بۆ دەکرد. یەکسەر دایکم بەخشیمی. من خۆشم لەو بڕوایەدابووم کە بمبەخشێت. لەو ڕۆژەوە لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە ڕۆژانە لە دووجار زیاتر تەلەفون نەکەم. من ئەو پەیمانەم بردەسەر، تەنانەت پێشم وانەبوو کە شتێکی





باشم لەدەستدابێت. لەڕاستیدا هەستمدەکرد شتێکی باشبوو کە ئەوە ڕوویدا، چونکە لەوەبەدواوە دەبوایە زۆر بەباشی بیرم لەوە بکردایەتەوە کە تەلەفون بۆ چ کەسێک بکەم. تاڕادەیەک هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە دەمویست تەلەفونیان بۆ بکەم، وەک کردنی تەلەفونەکە بەلامەوە خۆشبوو و چێژم لێدەبینی. ئیدی لەو کاتە بەدواوە ژمێریاری[3] تەلەفونەکەمان چیتر بە خێرایی نەدەخولایەوە.

من لە سەدا پەنجا دڵنیام لەوەی کە کەڕەتێکیان لەگەڵ "ئاینە گێردهارسن"ی سەرۆک وەزیراندا قسەم کرد. بەڵام ڕێشی تێدەچێت کە یادوەریەکی فەنتاسیم بێت و هیچی تر. بەڵام لە سەدا سەد دڵنیام لەوەی کە تەلەفونم بۆ کارگەی "نۆرا" کرد، چونکە ساردیەکی "سۆلۆ"م کڕیبوو و تامێکی ترشاوی دەدا. بەتەواوەتی بیرم دێتەوە، چونکە چەند ڕۆژێک دواتر سنوقێک ساردی "سۆلۆ"یان بۆ هێنامە بەر دەرگا. بەدایکیشم وت کە ئەو سنوقە ساردیەم لە پێشبڕکێیەکدا بردۆتەوە کە دووکاندارەکە سازی کردبوو. چەندەها پرسیاری لێکردم، بەڵام من پێمخۆشبوو، چونکە بەردەوام دەبوایە وەڵامی پرسیارەکانیم بدۆزیبایەتەوە. وابزانم دایکیشم ئەو جۆرە گفتوگۆیە زیرەکانەی پێخۆشبوو. هەتاوەکو بەتەواوەتیش دڵنیا نەبوو لەوەی کە ڕاستی دەڵێم، وازی لێنەهێنام.

کەڕەتێکیشیان بەتەلەفون باسێکی سەرنجڕاکێشەرم لەگەڵ "ئۆلاو"ی پاشادا سازدا. ڕێکەوتین پێکەوە گەشتێکی تێروتەسەل بۆ ناوچەیەکی

---

[3] تەلەفونە کۆنەکان ژمێریارێکی تایبەتی هەبوو کە هەموو ئەو یەکانەی دەژمارد کە بەکاردەهێنران.و





بەفراوی ڕێکبخەین و خلیسکێنەی سەر بەفر بکەین، لەبەرئەوەی هیچمان کەسێکی وامان نەدەناسی کە حەزبکەین لەگەڵیدا سەفەرێکی ئاوها بکەین. لە تەلەفونەکەدا پێی وتم کە پاشایەتی شتێکی ناخۆشە، دواتریش پرسیارێکی لێکردم و وتی "بە بڕوای تۆ شتێکی منداڵانە دەکەم ئەگەر قیتارێکی کارەبایی یەکجار گەورە بکڕم و لە هۆڵی سەمای کۆشکدا دایبنێم؟" منیش وتم؛ "هەتا بڵێیت بیرۆکەیەکی باشە، بەڵام بە مەرجێک ڕێگەم پێبدرێت کە لە دانانی قیتارەکەدا بەشداربم". پەیمانیدا و وتی کەواتە دەبێت قیتارێکی "مێرکلین" بێت، وە بەلایەنی کەمەوە دەبێت چوار جار لە قیتارە کارەباییەکەی "مۆزەخانەی تەکنیکی" گەورەتر بێت. من دەمزانی کە پاشا زۆر زۆر لە مۆزەخانەی تەکنیکی دەوڵەمەندترە. تەنانەت من خۆم خاوەنی مەکینەیەکی هەڵم و سێتێکی میکانۆ بووم، بەڵام قیتاری "مێرکلین"م نەبوو.

من لەسەدا 99 دڵنیام کە هەموو ئەو بەسەرهاتەی پەیوەندی بە پاشاوە هەیە، یادوەریەکی فەنتاسیی خۆمە. بەڵام ئەوە مانای ئەوە نابەخشێت کە ڕاست نیە. ئەو قیتارە کارەباییەی کە من و پاشا چەند حەفتەیەک دوای قسەکانمان لە کۆشکەکەدا دامانمەزراند، هەروەکو مانگ و خۆر ڕاستەقینەبوو. هەتاوەکو ئەمڕۆکەش وێنەیەکی وردی شێوازی دانانی دەزگاکەم لە بەرچاودایە. تا ئێستاکەش تونێلەکان و قەدپاڵی شاخەکان دەبینم، تائەم کاتەش شوێنی گۆڕینی سکەکان و شۆستەی قیتارەکان بەڕوونی لەمێشکمدایە. کە تەواوبووین نزیکەی پەنجا مەکینەی قیتار ڕاکێشانمان هەبوو، زۆربەی هەرە زۆریشیان گڵۆپی پێوەبوو.





ڕۆژێکیان کوڕە گەورەکەی پاشا هاتە هۆڵی سەمای کۆشکەوە و داوای لێکردین هەموو ئەو ناوە پاکبکەینەوە، چونکە دەیویست لەو هۆڵە گەورەیەدا ئاهەنگێک بۆ گەنجان سازبکات. کوڕە گەورەی پاشا پانزە ساڵ لەمن گەورەتربوو و ڕێزێکی زۆری هەبوو لەلام، بەڵام فەرمانکردنی بەسەر پاشادا وەک شتێکی ناهەقانە دەهاتە بەرچاوم. هەر هیچ نەبێت ئەو کارەی شکاندنی هەموو داب و نەریتێکبوو. من و پاشاش نەمانویست دەمودەست قیتارەکە لابەرین، لەبەرئەوە کوڕی پاشا ڕۆیشت و پاش ماوەیەکی کەم بە خۆی و بتڵێک مەشروبی "کەفیر"ەوە[4] گەڕایەوە، بتڵەکەی گرتە سکەی قیتارەکە و وردوخاشبوو، شلەی "کەفیر"ی ترش بەسەر هەموو دەزگاکەدا بڵاوبووەوە. دیمەنێکی ساردی زستانە باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشا، بەڵام جیاوازتربوو لە دیمەن و بۆنی ڕۆژێکی یەکشەممەی سەر کۆمەڵە گردەکانی "هۆلمنکۆلن". لەو ڕۆژەوە ئیدی یاری قیتار لە کۆشکدا کۆتایی پێهات.

*

وەک وتم دایکم لە شارەوانی کاریدەکرد، هەرلەبەر ئەو هۆیە زوو زوو بلیتی خۆڕایی شانۆگەریان پێدەبەخشی. هەمیشەش دوو بلیتی وەردەگرت، لەکاتێکیشدا کەدایک و باوکم چارەی یەکتریان نەدەویست، ناچاردەبووم من لەگەڵیدا بڕۆم. بەو شێوەیەش پێویستی نەدەکرد بەدوای دایەنێکدا بگەڕێت کە ئاگای لێمبێت. من لەوەوپێش زۆرم لەو دایەنانە شەکەت و ماندوو کردبوو.

[4] خواردنەوەیەکی قەفقازیە لە ترشاندنی شیری مانگا دێتەبەرهەم.





هەمیشە کە دەڕۆیشتین بۆ شانۆگەریەک جلوبەرگی نایابمان لەبەردەکرد. دایکم بەرلەوەی بڕیاربدات چ چاکەتێک یان ماکسیەک لەبەربکات، زۆرینەی جارەکان نمایشێکی بچکۆلەی جلی مۆدەی بۆ دەنوانم. دایکم پێیدەوتم پیاوە بچکۆلەکەی خۆم. من یارمەتیم دەدا کە چاکەتە درێژەکەی دابکەنێت و لەشوێنی جل هەڵواسینەکەی شانۆ دەمدا بە کارمەندەکە. شقارتەکەی لە گیرفانی چاکەتەکەی منداب‌وو و هەر منیش جگەرەم بۆ دادەگیرساند، لە پشووەکانیشدا کە لەگەڵ یەکێکدا سەرقاڵی قسەدەبوو، من دەچووم لەسەرەدا دەوەستام و خواردنەوەیەکم دەکڕی. کەرەتێکیان ویستم ساردیەکی "سۆلۆ" بۆ خۆم بکرم و پەرداخێک "سینزانۆ"ش بۆ دایکم، بەڵام ئافرەتی سەر بارەکە پەرداخە مەشروبەکەی دایکمی نەدامێ، هەرچەندە دایکم تەنها دوو مەترێک لەولا مێزی بارەکەوە وەستابوو و یەک لەسەریەک چاوی لێدادەگرت. ئافرەتی سەر بارەکە وتی "بۆم نیە مەشروبی "سینزانۆ" بە منداڵ بفرۆشم"، دایکیشم ناچاربوو تەشریف بهێنێتە لای بارەکە و پەرداخەکەی وەربگرێت. دایکم توڕەبوو. کەمبوون ئەو منداڵانەی کە دەهاتنە ئەو شانۆگەریانە و دایکیشم دەیزانی کە ئافرەتی بارەکە زۆر بەباشی من دەناسێ.

ئەو کاتانەش کە لە سینەما یان شانۆیەک دەگەڕاینەوە، دەکەوتمە باسکردنی فیلمەکە یان شانۆگەریەکە و ڕای خۆمم بە دایکم دەوت، پێشم دەوت بە چ شێوەیەک دەکرا باشترێک ببێت. هەندێ جار ڕاست و ڕەوان دەموت شانۆگەریەکی خراپ بوو. قەت نەمدەوت شانۆگەریەکی بێزارکەربوو، چونکە بەڕاستی هەرگیز لەشانۆدا بێتاقەت نەدەبووم. تەنانەت بینینی خراپترین شانۆگەریشم بەلاوە سەرنجراکێشەربوو، هەر هیچ نەبێت مرۆڤی ڕاستەقینە ڕۆڵەکانیان دەبینی، ئەگەر





شانۆگەریەکە هەر یەکجار پەڕپوتیش بوایە، ئەو کاتەش هەر بەقازانجی من دەشکایەوە، چونکە لەڕێگای ماڵەوەدا بابەتێکی زۆرمان دەکەوتە بەردەست کە تاوتوێیان بکەین.

دایکم پێی ناخۆشبوو کە دەموت شانۆگەریەکی خراپبوو، وابزانم وای پێباشتربوو کە بڵێم شانۆگەریەکی بێزارکەربوو.

زۆرجاریش کە لە شانۆگەریەک یان لە سینەما دەگەڕاینەوە، لە چێشتخانەکەماندا دادەنیشتین و بەردەوامیمان بە قسەکانمان دەدا. دایکم مۆمی دادەگیرساند و هەندێ خواردنی خۆشی لێدەنا. بۆ نمونە خواردنی هەر زۆر ئاسایی وەک باستورمە و نان و خەیاری سوێرکراوی دادەنا، بەڵام خۆشترین خواردن بەلای منەوە خواردنی "تەتار"[5] بوو لەگەڵ زەردێنەی کاڵ و "شەفەلە"دا[6]. بەبڕوای دایکم ئەو کاتە من هێشتام کاتی ئەوەم نەهاتبوو کە بتوانم شەفەلە بخۆم، ئێمە زۆر کەرەت باسی ئەوەمان دەکرد، بەڵام وابزانم لە ناخیدا زۆری پێخۆشبوو کە من حەزم لەو جۆرە خواردنانەبوو. ئەو بەس ئەوەی پێناخۆشدەبوو کە دەموت شانۆگەریەکی خراپبوو، یان کە دەموت فلان یان فیسار دەرهێنەر، دەرهێنەرێکی قۆڕە.

من هەمیشە پرۆگرامەکانم بەوردی دەخوێندەوە، چونکە بۆ من نوسرابوون، بێگومان ناوی هەموو ئەکتەرە گرنگەکانیشم دەزانی. دایکم پێی وابوو لەتامم دەرکردبێت، چونکە دواتر فێری ناوی ئەو

[5] گۆشتی گای بێچەوریە و زۆر بە وردی لە قیمەی دەدەن، دواتر بە شێوەی هەمبەرگر دەیخەنە سەر پارچەیەک نان و بە کاڵی دەخورێت.

[6] دەوەنیکە بەرەکەی لە خەیاری بچکۆلە دەچێت و دەکرێتە ترشیات.

کەسانەش بووم کە دیکۆری شانۆکانیان دەکێشا. بەڵام ئەو منی بە پیاوە بچکۆلەکەی خۆی دەزانی، کەواتە بەڕاستی دەبوایە پیاوە بچکۆلەکەی ئەو بوومایە. جارجارێک ئەگەر جیرەجیرێکی کەم لەسەر شانۆکە ڕوویبدایە، خێرا بەچرپە ناوی یاریدەدەری دەرهێنەرەکەم بە گوێی دایکمدا دەچرپاند.

کەرەتێکیان لە شانۆگەری "خانەی بووکەکان"دا، ماکسیەکەی بەری "نۆرا" کەوتە خوارەوە. ماکسیەکەی ڕێک لەبەرچاوی "دکتۆر ڕانک"دا خزایە خوارەوە. هەردووکیان لە ژورەکەدا بەتەنها بوون، وە دواهەمین قسەی "دکتۆر ڕانک"یش ئەو حاڵەتە کۆمیدیەی دوپاتکردەوە کە ڕێک لەو بەشەدا ڕوویدا کە "نۆرا" کراسەکەی لێ خزایە خوارەوە، پرسیاری لێکرد و وتی؛ «ئەی ئەو شتە قەشەنگانەی تر چین کە کەمێکی تر دەیانبینم؟» "نۆرا"ش لەوەڵامدا وتی؛ «چاوتان بە یەک تۆزی تریش ناکەوێت، چونکە ئێوە کەسێکی دڵپاک و میهرەبان نین». لەدوای ئەوەوە خۆی لەدەستی "دکتۆر ڕانک" ڕزگارکرد و یەکسەر کراسەکەی کەوتە خوارەوە. منیش خۆم بەلای دایکمدا چەمانەوە و ناوی ئەو کەسەم بە گوێدا چرپان کە ئەرکی جلوبەرگی شانۆکەی لە ئەستۆدابوو.

ئێوارەیەکیان تادرەنگانێک لەگەڵ دایکمدا دانیشتبووین و ناوەڕۆکی شانۆگەریەکمان تاوتوێ دەکرد، ئەو ئێوارەیە پێموت کە شێوەی دەموچاوی لە "جاکلین کەنەدی" دەچێت. وابزانم پێی خۆشبوو کە وام پێوت، بەڕاستیش شتێک نەبوو کە هەروا بۆ ستایش و مەرایی کردنی پێم وتبێت. لەبەرچاوی مندا تا ڕادەیەکی زۆر لە "جاکلین کەنەدی" دەچوو.







لەتەمەنی یانزە ساڵیدا لەگەڵ دایکمدا فیلمی "گڵۆپەکانی شار"ی "شاپلن"م بینی. ئەو فیلمە گەورەی کردم. لەوێدا کاتێک کە "کلایر برووم"م لە ڕۆڵی سەماکەرێکی بێبەختی بالێتدا بینی، بۆ یەکەمین جار بۆم دەرکەوت کە پڕبەدڵ حەزم لەوەیە لەگەڵ کچێکدا تێکەڵبم کە بەتەمەن زۆر لە خۆم گەورەتر بێت. دووهەم جاریش ئەو کاتەبوو کە "ئاندری هێبورن"نم بینی کە ڕۆڵی "ئێلیزا"ی لە فیلمی "ئافرەتە بێ وێنەکەم"دا دەبینی. دایکم بلیتی یەکەمین ڕۆژی نمایشکردنی فیلمەکەی لە نەرویجدا پێبەخشرابوو.

من بەتایبەتی حەزم لە "شاپلن" بوو، وە بەتایبەتیش مۆسیقای فیلمەکەی، بەرلە هەموو شتێکیش پارچە مۆسیقاکەی فیلمی "گڵۆپەکانی شار"کەی. هەرچەندە ڕتمی سەرەتایی مۆسیقاکە هاووێنەی ڕتمی سەرەتای کۆنسێرتی پیانۆی "چایکۆفسکی"بوو لە پەیژەی مۆسیقی سەرەکی "B"دا. لە میلۆدی "خەندە"ی "سەردەمە مۆدێرنەکان"یشدا هەمان شتم دەبینی؛ کتومت تەنها گۆڕانکاریەکی "خراپ و بێتامی" پارچە مۆسیقایەکی فۆلکلۆری ڕووسیبوو. جگەلەوانەش گومانم لە "شاپلن" دەکرد کە هەندێک بیرۆکەی مۆسیقی لە "پۆتشینی"ەوە دزیبێت؛ بەهەرحاڵ مۆسیقاکەی ئەویش هەروەک "پۆتشینی" هەستبزوێنەربوو. بەڵام لە هەموو بارێکدا لایەنێکی باشیە کە "شاپلن" ڕێگەی بە خۆی داوە سروشی لە ئاوازداهێنەرەکانی ترەوە بۆ بێت، چونکە من "چایکۆفسکی" و "پۆتشینی"شم خۆشدەویست، دایکیشم هەروەها. کەرەتێکیشیان چووین بۆ ئۆپێرا و تەماشای نمایشی ئۆپێرای "ئافرەتە پەپولەکە"مان کرد. هەوڵمدا نەگریم، بەڵام زۆر سەختبوو بەلامەوە. من قورگم لەبەرئەوە پڕنەبوو لە هەنسک کە "پینکەرتۆن" ئافرەتە پەپولەکە بەجێدەهێڵێت، لەبەرئەوەش نەبوو کە





ئافرەتەکە لەکۆتاییدا خۆی کوشت، من هەرلەسەرەتای بەشی دووهەمەوە زانیم بەو جۆرە کۆتایی دێت. بەڵکو مۆسیقاکە کاریتێکردم، هەر لەبەشی یەکەمەوە خەریکبوو بمخاتە گریان، ڕێک لەو کاتەوە دڵم پڕبوو کە "ئافرەتە پەپولەکە" لەگەڵ ئافرەتە گۆرانی بێژەکانی تردا بەرەو لوتکەی گردەکە سەردەکەوتن. ئەو کاتە تەمەنم تەنها دوانزە ساڵ بوو، بەڵام تا ئێستاکەش بەڕوونی وێنەی ئەو ئافرەتانەم لەبەرچاودایە کە بە خۆیان و چەترە هاوینیە ڕەنگاوڕەنگەکانیانەوە بەدەم گۆرانیەوە لە ڕێگاکەی "ناگاساکی"یەوە سەردەکەوتن.

لە ماڵەوە بە قەوان وە بە دەنگی "جوسی بیۆرلین و فیکتۆریا دی لۆس ئەنجلیس" ئۆپێرای "لا بۆهێمە"مان[7] لێدەدا، لەبەشی چوارەمدا "میمی" نەخۆشە و "موسێتا" بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشێت، دایکم هەمیشە لەو کاتەدا دەستی دەکرد بە لوشکەلوشک. منیش دەچوومە ژورێکی تر، بەڵام دەرگاکەم دانەدەخست. حەزم نەدەکرد گوێم لە گریانی دایکم بێت، بەڵام پێمخۆشبوو گوێ بۆ مۆسیقاکە شلبکەم، جارجارێکیش منیش دڵم تەنگدەبوو یەک و دوو فرمێسکم بۆ هەڵدەڕشت.

هەتاوەکو ئەو کاتەی "گڵۆپەکانی شار"ی "شاپلن"م بینی، چایکۆفسکی و پۆتشینی تەنها دوو بلیمەتبوون کە دەمناسین. زۆرجار ئەو کاتانەی کە بەتەنها لە ماڵەوە دەبووم دواهەمین بەشی سەمفۆنیای "پاتێتیکیو"م لێدەدا. بۆ من مایەی شەرمەزاریەکی زۆر دەبوو ئەگەر دایکم پێی بزانیبامایە. هێندە گەورەبووبووم کە حەزم لە خواردنی

[7] یەکێکە لە ئۆپێرا بەناوبانگەکانی پۆتشینی.و





"شەفەلە" ببێت، بەڵام من خۆشم دان بەوەدا دەنێم کە هێشتام بچکۆلەبووم بۆ ئەوەی سەرسامی مۆسیقای کلاسیکی بم. هاوکات کە مۆسیقاکەم بەبەرزترین دەنگ لێدەدا، گوێیەکم لەلای قادرمەی سەر داڵانەکەبوو، بۆئەوەی گوێم لە دەنگی پێی دایکم بێت ئەگەر بە پلیکانەکاندا سەربکەوێت. تاوناتاوێکیش پیاوە بچکۆلەکە لەبەردەم دەرگای دەرەوەدا گوێ قوڵاخ دەوەستا، بۆ ئەوەی بزانێت کەس بە پلیکانەکاندا سەردەکەوێت یان نا.

لەفەرهەنگێکی گشتیدا هەندێ شتم دەربارەی چایکۆفسکی خوێندەوە. چەند ڕۆژێکی کەم دوای ئەوەی بۆ یەکەمین جار سەمفۆنی "پاتێتیکیو"ی پێشکەشکرد، بەنەخۆشی کۆلێرا مرد. ئەوە گەورە ترین شاکاری ژیانیبوو. پاش نمایشکردنی ئەو سەمفۆنیە، چیتر بەلایەوە گرنگ نەبوو کە ئاگاداری خۆی بێت ئاوی پاکژ بخواتەوە. ئەو مۆسیقای هێمنکردنەوەی ڕۆحی کۆچکردووی خۆی نوسیەوە و ئیدی هیچ تۆنێکی پێنەما. ئەو لەم ژیانەدا تەواوبووبوو. منیش کە گوێم بۆ دواهەمین بەشی ئەو سەمفۆنیایە شلدەکرد، تۆزێک هەستمدەکرد کە هیچ شتێک لەم ژیانەدا نەماوەتەوە بۆ من.

من و دایکم هەرگیز باسی مردنمان نەدەکرد. هەرگیزیش باسی کچانم بۆ دایکم نەدەگێڕایەوە. من هەروەک چۆن وریابووم و بە دزیەوە گوێم لە سەمفۆنی "پاتێتیکیو" دەگرت، بەهەمان شێوەش گۆڤارێکی نیوەڕووتم لەدایکم دەشاردەوە.

تەمەنم تەنها حەوت ساڵ بوو کە فیلمی "لە ڕۆژهەڵاتی بەهەشتەوە"مان بینی، "جەمیس دیان" ڕۆڵی "کاڵ"ی دەبینی. دایکم خەریکبوو بەتەواوەتی تێکبچێت کە لە کۆتایی فیلمەکەدا





دەستگیرانەکەی "کاڵ" ناچاربوو لە باوکی "کاڵ" بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆشەویستی خۆی نیشانی کوڕەکەی بدات. دەستگیرانەکەی وتی؛ «ئازاردەچێژیت ئەگەر بزانیت کەس خۆشی ناوێیت. ئەو هەستە مرۆڤ دەکاتە شتێکی بەد. خۆشەویستی خۆتانی نیشانبدە. هەوڵبدە! تکات لێدەکەم!»

باوکی "کاڵ" بۆیە ڕقی لە کوڕەکەی بوو، چونکە وای هەستدەکرد کە کوڕەکەی پشتگیری دایکی کردبێت، هەڵبەتە ئەو کوڕەکەی و مێردەکەی بەجێی هێشتبوو و ببووە سۆزانیەکی بێهەستی قەحبەخانەیەک. دواتر باوکی بەرلەمردنی فریای ئەوەدەکەوێت کە لەگەڵ کوڕەکەی خۆیدا تەبا ببێتەوە. داوا لە کوڕەکەی دەکات کە ڕوخسەت بە پەرستارەکە بدات و بە کوڕەکەی دەڵێت؛ «دەمەوێت تۆ ئاگات لەمن بێت». هەروەک ئەوە وابوو کە بڵێت خۆشمدەوێت.

باسکردنی ئەو فیلمە بەلای دایکمەوە سەختبوو. من ئەوەندە تێدەگەیشتم کە دایکم داوای لە باوکم کرد کە بڕوات و بەجێمان بهێڵێت. ئەو کاتە ئەو شتانە هێندە ئاسایی و باو نەبوو. هێندە زۆر نەتدەبینی کە دایکێک باوکی منداڵێکی بچکۆلە لە خانوەکەیاندا فڕێبداتە دەرەوە.

ئەو ئێوارەیە بەرلەوەی بخەوین، دایکم پێشنیاری ئەوەی کرد کە باوکم بۆ نانخواردنی ئێوارەی یەکشەممە بانگ بکەین. من پێشنیارەکەیم بەلاوە باش بوو، بەڵام نەشبوو بە هیچ، زۆر پەرۆشیش نەبووم داوا لە دایکم بکەم کە تەلەفونی بۆ بکات و بانگی بکات.

هەروەک شتێکی خەوئاسا و نادیار بیرمدێتەوە بەرلەوەی باوکم بگوێزێتەوە، شتێک لە ماڵەکەماندا ڕوویدا. دەکرێت بەبێئەوەی خودی خەوێکمان بیربێتەوە، هێندەمان بێتەوەیاد کە خەوەکەمان خۆش بووە





یان ناخۆش. من هێندەم دەزانی کە ئەو شتەی هەوڵمدەدا لەبیری خۆمی بەرمەوە، شتێکی سارد و ڕەقبوو. زیرەکانەش دەمتوانی هێندە زۆر پاڵی پێوەبنێم کە چیتر ئەو شتەم لەیادنەبوو کە دەمویست لەبیری خۆمی بەرمەوە.

هێندەم لە یادبوو کە کتومت لەو کاتەدا چەند خەونێکی پڕنهێنیم بە پیاوێکەوە دەبینی، کە بەباڵا ڕێک بەقەد خۆمبوو، بەڵام پیاوێکی تەواو و گەورەبوو، کڵاوی لەسەردەکرد و گۆچانێکیشی بەدەستەوەبوو، لەپڕێکدا بەیانیەکیان بەڕۆژی ڕووناک لە ئاپارتمانەکەماندا بینیم هاتوچۆی دەکرد. هەر ئەو کاتەش هاتە ماڵەکەمانەوە کە باوکم گواستیەوە.

ئەو کاتە لەدڵی خۆمدا دەموت لەوانەیە کەسێک لە وڵاتی خەوندا هەبێت و بیری ئەو پیاوە بکات. چونکە ڕێیتێدەچوو ئەو پیاوە بچکۆلەیەش هاوسەر و منداڵی جێهێشتبێت، یان لەوانەیە بەهۆی ڕەفتاری خراپەوە لەو حکایەتە دەرکرابێتە دەرەوە کە تێیدابووە. بەڵام خۆ پێشدەچێت لە نێوان دوو هەقیقەتدا هاتوچۆیکردبێت. من بیرم بۆ ئەوە دەچوو کە ئەو پیاوە بچکۆلەیە هەموو شەوێک لەگەڵ خەوتنی مندا، بە خێرایی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خەون. ئەوەم بەلاوە سەیر نەبوو، چونکە بەلایەنی کەمەوە خۆم لە کاتی خەوتنمدا سەفەرمدەکرد بۆ وڵاتی خەون. بەڵام ئەوەم بەلاوە سەیربوو کە ئەو پیاوە پچکۆلەیە بەڕۆژی ڕووناک دەیتوانی لە ئەپارتمانەکەماندا بێت و بچێت و پیاسەبکات.

*





لە پۆلەکەماندا جگە لە من هیچ کەسێکی تر دایک و باوکی لە یەکتر جیانەبووبوونەوە. بەڵام باوکی یەکێک لە کچەکان کۆمۆنیستبوو، باوکی "هانس ئۆلاو"یش لە زینداندابوو.
من بەلامەوە ئاساییبوو کە دایک و باوکم جیابووبوونەوە، چونکە زیاتر پێمخۆشبوو لەیەک کاتدا لەگەڵ "یەکێکیان"دابم. جگەلەوەش وابزانم ئەو دیاریانەی کە دایک و باوکی من لە ڕۆژی جەژنی لەدایک بوونی مەسیحدا پێیان دەبەخشیم، گرانتربوون لەو دیاریانەی کە منداڵەکانی تر لە دایک و باوکیانەوە وەریاندەگرت. من هەمیشە لەو جەژنەدا دوو دیاریم وەردەگرت. دایک و باوکم نەیاندەتوانی پێکەوە دیاری ئەو جەژنەم بۆبکڕن، نەک هەرئەوەندەش، بەڵکو وابزانم پێشبڕکێی ئەوەیانبوو کە کامیان دیاری جوانترم پێشکەشبکات. هەرگیزیش هیچ دیاریەکیان بۆ یەکتری نەدەکڕی.
باوکم لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ تەماشاکردنی ڕاکردنی سەربەفر و پێشبڕکێی خۆهەڵدانی سەر بەفر. ئەو شارەزاییەکی تەواوی لە پێشبڕکێی سەربەفر و خەملاندنی پلەی یاریزانەکاندا هەبوو. خەتای ئەوی تێدا نیە کە دواتر من بووم بەو مرۆڤەی کە ئەمڕۆکە هەم. لەسەر بەرزاییەکانی "هۆلمنکۆلن" بووین تەماشای ئەو سێ یاریزانەکەمان کرد کە هەرسێکیان ناوەکانیان بە پیتی "ت" دەستیپێدەکرد؛ "تۆرالف ئینگان"، "تۆربیۆن ئیوگسیت" و "تۆرگیر برانتزێگ". ئەو کاتە هێشتام "وایرکۆلاس" پەیدا نەبووبوو. ئاسان دەهاتە بەرچاو. لەپێش "وایرکۆلاس"یشەوە بەبێ هیچ گرفتێک دەیانتوانی لەسەر بەرزاییە بە بەفرداپۆشراوەکەوە خۆیانهەڵبدەن.
لە تەمەنی هەست ساڵیدا لەگەڵ باوکمدا بە پاپۆڕەکەی دانیمارک بەرەو کۆبنهاگن ڕۆیشتین. تەنها یەک ئێوارە لەوێ ماینەوە، بەڵام





لەبەرامبەردا چووین بۆ شاری یارییەکەی کۆبنهاگن. من لەو بڕوایەدابووم کە لەوەوپێش شاری یاریم بینیبێت، بەڵام شاری یاریەکەی کۆبنهاگن شتێکی تەواو جیاوازتربوو لە شاری یاری "ئیڤارس"ی وڵاتی خۆمان. هەستمدەکرد گەشتیارێکم و لە یەکێک لە وڵاتانی دواکەوتووە هاتووم. لەدڵی خۆمدا دەموت ئەگەر منداڵانی دانیمارکی بێن بۆ نەرویج و سەردانی شاری یاری "ئیڤارس"بکەن، ئاخۆ بە چ شێوەیەک نەرویجیەکان ببینن، من نەمدەوێرا بیر لەوە بکەمەوە.
باوکم باشترین مەزاجی هەبوو. وابزانم نەختێک شانازی بەوەوە دەکرد کە توانی من بەرێتە دەرەوەی وڵات و هێندە دورم خاتەوە لە دایکم. لە پاپۆڕەکەدا هەر بەشێوەی پیاوێکی بەهێز و بەتوانا وتی؛ "بێگومان شتێکی باشە گەر دایکت چەند ڕۆژێک بۆ خۆی بەتەنها بێت". ئەوە ڕاست نەبوو. من دڵنیابووم کە حەزی دەکرد لەگەڵماندا بێت بۆ کۆبنهاگن، بەڵام ئاشکرایە کە شتی وا بەهیچ جۆرێک نەدەکرا، چونکە باوکم دەمێکبوو پێشنیاری کردبوو کە تەنها خۆم و خۆی ئەو سەفەرە بکەین. وای بۆ دەچم کە لە ماوەی سەفەرەکەماندا باوکم هەستیکرد کە من پێمخۆشتردەبوو ئەگەر دایکیشم لەگەڵماندا بهاتایە بۆ شاری یاریەکەی کۆبنهاگن. ئەو کاتە هەردووکمان بەناو ئەو هەموو خەڵکەدا دەڕۆیشتین و باسی ئەو شتانەمان دەکرد کە دەمانبینین، یان ئەو شتانەی کە بیرمان لێدەکردنەوە. زۆرجار من و دایکم کتومت بیرمان لە هەمان شت دەکردەوە. دەشمانتوانی لە کافیتیریایەک دابنیشین و باسی خۆش خۆش دابمەزرێنین.
باوکم گیرفانی پڕبوو لە پارەی دانیمارکی و دەیویست هەموو یاریەکان تاقیبکەینەوە؛ دەیویست سواری ماشێنی کارەبایی و "قیتاری



خێو" و چەرخ و فەلەکە گەورەکە ببین، گەرەکی بوو کورسی کورسی و خلێسکێنە و "تونێلی خۆشەویستی"ش تاقیبکەینەوە. ڕاستە ئەو کاتە تەمەنم تەنها هەشت ساڵبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شەرمم دەکرد لەگەڵ باوکمدا بە "تونێلی خۆشەویستی"دا بڕۆم، جگەلەوەش بۆنی دەمی دەهات. قێزم لەوە دەکردەوە کە لەگەڵ باوکمدا لەبەلەمێکی بچکۆلەدا دانیشم و بە تونێلێکی پڕلە گوڵی کاغەز و ڕەنگی پاستیلدا بڕۆم و گوێ بۆ چەهچەهەی دەستکردی بولبول بگرم. وابزانم ئەویش کەمێک شەرمەزاربوو، بەهەرحاڵ بەدرێژایی ئەو ڕێگایە تەنانەت یەک وشەشی لەدەم نەهاتە دەرەوە. من لەوە دەترسام کە لە پڕێکدا باوەشم پیابکات و باسی جوانی ئەو ناوەم بۆ بکات و بڵێت «ئێرە زۆر جوانە، وانیە؟... بەڕاستی تۆش لەو بڕوایەدا نیت پیتەر؟» لە هەموو شتێک ناخۆشتر ئەوەبوو کە بەتەواوەتی لەو بڕوایەدابووم کە ڕێک پەرۆشی ئەوە بوو کە بیکات. تەنها ئەوەندەبوو کە نەیدەوێرا دەستبخاتە سەرشانم، چونکە دەیزانی کە من حەزم بەوە نیە. لەوانەشە هەرلەبەر ئەوەبووبێت کە هەردووکمان بێدەنگ بووین و هیچمان نەدەوت.

من زیاتر لەبەرخاتری باوکم بوو کە ڕازیبووم هەموو یاریەکان تاقیبکەمەوە. دەنا لە ڕاستیدا من زیاتر خولیای ئەوەبووم بەشاری یاریەکەدا بسوڕێمەوە و بزانم چ شتێکی تێدایە. من بڕیارمدابوو سەرنجی هەموو شتێک بدەم، هەر هەموو شتێک، تەنانەت دوکانی یانسیبە بچکۆلەکان و شوێنی فرۆشتنی خواردنە سەفەریەکانیش. هەر لە یەکەمین چرکەوە زانیم کە دواتر بەهۆی سەردانەکەمەوە ئیشێکی گەورە دەکەوێتە سەرشانم. سروشێکی زۆرم بۆ هات. بەشاری یاریەکەدا هاتوچۆم دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە پاش ماوەیەکی





کەم دەگەڕێمەوە ماڵەوە و نایابترین شاری یاری دروستدەکەم. لەو کاتەدا چیتر وێنەم نەدەکێشا، لەبەرئەوە ناچاربووم تا ئەو پەڕی ڕادە خۆم بگوشم و هەموو وردەکاریەکی شتەکانم لەیادبێت. لە دواجاردا توانیم وێنەیەکی پڕوپڕی شاری یاری کۆبنهاگن لە مێشکمدا بخوڵقێنم، بەڵام ناچاربووم سکێچی شوێنەکان لە مێشکمدا بکێشم، ناچاربووم هەر هەمووی لەبەربکەم. بەلامەوە سەختبوو سەرنجی تەواوەتیم بە شتەکان ببەخشم، چونکە تاوناتاوێک دەبوایە تەماشای باوکم بکردایە و شتێکم پێ بوتایە، هەتاوەکو ئەو هەستەی لا دروست نەبێت کە من سەفەرەکەمانم بەدڵ نیە. ڕێک پێشئەوەی شوێنەکە بەجێبهێڵین بوکێکی پەڕۆیینم بردەوە، پڵنگێکی سووربوو. منیش بەکچێکم بەخشی کە دەگریا، باوکم وایزانی لەبەر میهرەبانی پێیدەبەخشم، چونکە ئەو بەهیچ جۆرێک نەیدەزانی کە من حەزم لە پڵنگێکی سووری پەڕۆیین نیە. ئەگەر دایکم منی بدیبایە کە بوکێکی ئاوها دەبەمەوە، ئەوا قاقای پێکەنینێکی خۆی ئاسایی لێ بەرزدەبووەوە.

هێشتام هەر لە شاری یارییەکە بووین کە شوێنی "قیتارێکی خێو"م بنیاتنا، هەموو شتێکی تێدابوو، هەرلە پەیکەرە لەرزۆکەکانەوە هەتا خێو و جنۆکەکان. بەڵام من لە ناوەڕاستی تونێلەکەدا مرۆڤێکی ڕاستەقینەشم دانا. کابرایەکی ئاسایی پاڵتۆ لەبەربوو و کڵاوێکی لەسەردابوو، جارجارێک هەڵدەسایە سەرپێ و گوێزەرێکی دادەکرمان. بەمەزەنەی من ئەو خەڵکانەی کە سواری "قیتاری خێو"ەکە ببن و لەناکاودا لە تونێلەکەدا چاویان بەمرۆڤێکی ڕاستەقینە بکەوێت، ئەوا زیاتر دەترسن و زەرنەقیان دەچێت. لە هەندێ شوێندا لەوانەیە بینینی مرۆڤێک هێندەی بینینی خێوێک ترسناکبێت، بەلایەنی کەمەوە





لە تونێلی "قیتاری خێو"دا بەو شێوەیە دەبێت. خێو فەنتاسیایەکی پەتیە، وە ئەگەر لەناو فەنتاسیدا شتێکی ڕاستەقینە دەربکەوێت، ئەوا هەروەک ئەوە ترسناک دەبێت کە شێوەیەکی فەنتاسی لە هەقیقەتدا دەربکەوێت.

یەکەم جار کە لەدەرەوەی خەونەکانمدا ئەو پیاوە بچکۆلەیەم بەخۆی و گۆچانە حەیزەرانەکەیەوە بینی، زۆر ترسام، بەڵام پاش ماوەیەکی زۆرکەم ڕاهاتم پێی. بێگومان ترسمان لێدەنیشێت ئەگەر لە پڕێکدا چەند پەرییەکی بچکۆلە و جنۆکەیەک لەدارستانێکدا ببینین، بەڵام درەنگ یان زوو پێیان ڕادێین. ناچارین پێیان ڕابێین.

کەڕەتێکیان لە خەونمدا جزدانێکم دۆزیەوە چوار دۆلاری زیوینی تێدابوو. ئەگەر ئەو کاتەی کە خەبەرم بووەوە پارەکەم لە دەستدا بوایە، ئەوا لەترساندا دەتۆقام. ئەو کاتە ناچاردەبووم قەناعەت بەخۆم بێنم کە هێشتام هەر خەوتووم و دەبوایە هەوڵم بدایە کەڕەتێکی تر لەخەو هەڵبسامایەتەوە.

زۆرجار کە خەون دەبینین وا هەستدەکەین کە بەخەبەرین، بەڵام کە ناخەوین بەتەواوەتی دەزانین کە بەخەبەرین. من وەک تیۆریەک دەموت ئەو پیاوە بچکۆلەیەی گۆچانەکەی پێیە لە شوێنێکی وڵاتی خەوندا خەوتووە و خەو بەوەوە دەبینێت کە لە شوێنێکی ڕاستەقینەدایە. من هەر ئەو کاتەی کە لە شاری یاریەکە بووم بە باڵا لەو درێژتریکبووم. لەو کاتەوە ناوی "پیاوە یەک مەتریەکە"م لێنا، چونکە باڵای لە مەترێک تێنەدەپەڕی.

من هیچ شتێکم دەربارەی ئەو یاریانەی کە خۆم دامهێنابوون بۆ باوکم نەگێڕایەوە، چونکە من نەمدەویست گلەیی لێبکەم و بڵێم



سەفەرەکەمان ناخۆشبوو. لەوانەیە ناهەقبێت کە هەموو سروشەکانم لەدوای سەفەرەکەمانەوە بەسەر دایکمدا شکایەوە. ئەو زیاتر و زۆرتر بەخیلی بە باوکم دەبرد، چونکە ئەو منی برد بۆ کۆبنهاگن. پاش چەند ڕۆژێکیش کە گەڕامەوە ماڵەوە وتی؛ «شاری یاری مێشکی داگیرکردوویت». منیش لە وەڵامدا وتم «لەوانەیە لەبەرئەوەبێت کە لە ژیانێکی ڕابووردومدا خۆم شارێکی یاری گەورە بووبم». دایکم بەدەم پێکەنینەوە وتی؛ «مەبەستت لەوەیە کە لەژیانێکی ڕابووردودا لە شارێکی یاری کارت کردبێت». سەرم بۆ ڕاوەشاند و جەختم لەسەر قسەکەم کردەوە و وتم؛ «من خۆم لەوەوپێش سەرتاپای شارێکی یاریبووم».

*

من بە منداڵی تێهەڵدانی زۆرم خواردووە. دایک و باوکم لێیان نەدەدام. وامبزانم بە هۆی جیابوونەوەکەیانەوە بوو کە دەستیان بۆ درێژنەدەکردم، هەرلەبەرئەوەش کە پێکەوە لەژێر سەقفێکدا نەدەژیان، هەرگیز نەیاندەتوانی لەسەر سزادانی من تەبابن. دایکم سوور دەیزانی ئەگەر لەگەڵمدا خراپ بێت، ئەوا باوکم یەکەمین کەس دەبێت کە پێی بزانێت. تاوناتاوێکیش تەلەفونم بۆ باوکم دەکرد و داوام لێدەکرد کە یەک دوو سەعاتێک درەنگتر بخەوم وەک لەو کاتەی کە دایکم دانابوو بۆم. ئەو هەمیشە ڕازی دەبوو، چونکە دەیزانی کە لە هەمان کاتدا دڵی من خۆش دەکات و دڵی دایکیشمی پێ پەستدەکرد، لەبەرئەوە بێ سێ و دوو ڕازی دەبوو. دایکم پارەی دەدامێ، بەڵام ڕێدەکەوت کە پێویستم بە پارەی تریش بوو، ئەو





کاتانەش تەلەفونم بۆ باوکم دەکرد. باوکم قەت لێم تورە نەدەبوو. ئەو لە حەفتەیەکدا تەنها یەک ڕۆژ دەیبینیم. هەردووکیشمان لەسەر ئەوە تەبابووین کە بەسبێت.

کورەکانی قوتابخانە لێیاندەدام، ئەوەندەشی نەدەهێنا کە فشەفشی پێوە بکەن، چونکە من نە کورێکی کەتەبووم و نە بەهێزیشبووم. ناویان نابووم "پیتەرە بچکۆلەی جاڵجاڵۆکە". ئەو کاتەی کە منداڵترێک بووم کەرەتێکیان لەگەڵ باوکمدا چووین بۆ مۆزەخانەی جیۆلۆجی، لەوێدا پارچەیەک "زەرەک"م بینی جاڵجاڵۆکەیەکی بەبەردبووی تێدابوو کە تەمەنی دەگەڕایەوە بۆ چەند ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر، منیش دواتر باسی ئەو جاڵجاڵۆکەیەم لە پۆلەکەماندا گێڕایەوە. ئێمە لەپۆلدا شتێک دەربارەی کارەبا فێربووین، منیش بە قوتابییەکانم وت کە وشەی کارەبا لەوشەی یۆنانی بەرامبەر بە وشەی "زەرەک"ەوە[8] هاتووە. لەو ڕۆژەوە ئیتر ناوی "پیتەرە بچکۆلەی جاڵجاڵۆکە"یان بەسەردا دابریم.

ڕاستە من بەلەش و لار بچکۆلەبووم، بەڵام دەمم درێژبوو. هەر لەسەر ئەوەش تێهەڵدانم دەخوارد. من بەتایبەتیش ئەو کاتانە زوو وەڵامم دەدایەوە کە کەسێکی گەورە لە نزیکمەوەبوایە، یان ئەو کاتانەی کە خەریکبوو خۆم هەڵدەدایە ناو پاسێکەوە، یان ئەو وەختانەی کە خەریکبوو دەچوومە ناو دالانی بیناکەمانەوە. سروشتی ئەو کاتەی کە تیایدا دەژیام بەلامەوە هێندە بەهێزبوو کە نەمدەتوانی لە یەک ڕۆژ دورتر بیربکەمەوە. من لەو شتەدا زیرەک نەبووم کە بەزمانی

[8] لە ڕاستیدا لە زمانی کوردیشدا وشەی 'کارەبا' و 'مووری کارەبا' بەرامبەر بە 'زەرەک' دادەنرێت.





ئەمڕۆکە پێی دەڵێن "پلاندانانی داهاتوو". هەرگیز تاقەتی ئەوەم نەبوو کە خشتەی چالاکیەکانی داهاتووم دابرێژم، چونکە لە هەموو بارێکدا هەمان ئەو کورانەم دەبینیەوە و هەموو کاتێکیش لەوناوەدا کەسێکی گەورەی لێنەبوو.

من لەچاو منداڵانی هاوتەمەنمدا زۆر زیرەکانەتر دەمتوانی باسی خۆم بکەم، لە گێڕانەوەی چیرۆکیشدا من لەوان باشترێک بووم. من تەنانەت لەچاو زۆرینەی ئەو منداڵانەشدا کە سێ چوار پۆل لە پێشمەوە بوون، بەزمانێکی پاراوتر و ئاسانتر دەمتوانی بیرکردنەوەکانم بخەمەڕوو. لەسەر ئەوەش لێدانی باشم دەخوارد. ئەو کاتە هەر زۆر کەم گرنگیان بە ئازادی ڕادەربڕین دەدا. ئێمە لە قوتابخانەدا شتیان دەربارەی مافی مرۆڤ فێردەکردین، بەڵام هەرگیز پێیان نەدەوتین کە ئازادی ڕادەربڕین تەنانەت لەنێوان منداڵانیشدا بێسنوورە.

کەرەتێکیان "ڕاگنار" پاڵی پێوە نام و سەرم بەر پایەی تەنافێکی جل وشککردنەوە کەوت، زۆر خراپ سەرم بریناربوو. هەرکە خوێنەکەم بینی بەسەرمدا هاتە خوارەوە، کەوتمە وتنی هەموو ئەو شتانەی کە لە کاتی ئاساییدا نەمدەوێرا بیاندرکێنم و تەنها لای خۆم دەمهێشتنەوە. هەندێ ڕاستی هەستبزوێنەرم دەربارەی خێزانەکەیان هەڵڕشت، بۆ نمونە وتم "باوکی "ڕاگنار" هەمیشە لەگەڵ خەڵکی پیس و چەپەڵ و بێکاردا لەسەر کورسیەکانی سەر جادەکان مەشروب دەخواتەوە"، بەڵام لەوێدا ڕاگنار خۆی بۆ هەڵنەدام. بەلایەنی کەمەوە خۆ دەیتوانی وەڵامم بداتەوە، بەڵام ئەو نەیدەتوانی هەروا بەئاسانی بیروڕای خۆی دەرببڕێت، هەروا وەستابوو و تەماشای خوێنەکەی





سەرمی دەکرد. دواتریش پێم وت "تۆ کەسێکی ترسنۆکیت، چونکە ناوێریت وەڵامم بدەیتەوە، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە هەموو ئەو شتانەی کە دەیڵێم ڕاستین". هەروەها وتم "کەرەتێکیان چاوم لێبوو گوی سەگی دەخوارد". بەوەشەوە نەوەستام، ئینجا وتم "دایکی مێزێکی گەورەی منداڵ پاککردنەوەی لە ژوری دانیشتنەکەیان داناوە و ناچارە لەوێدا پاکی بکاتەوە، چونکە میز و گو دەکات بەخۆیدا. هەموو کەسێکیش دەزانێت کە تا ئێستاکەش دایکی دایبی دەکرێت، هێندە زۆریش دەکرێت کە نرخەکەی بۆ دادەشکێنن". خوێن لەسەرمەوە فیچقەی دەکرد. چوار پێنج کوڕی تریش وەستابوون و بەسەرنجەوە تەماشایان دەکردم. دەستم خستە سەر سەرم و هەستمکرد سەرتاپای سەرم تەڕبووە. سەرمام بوو. ئینجا وتم "هەموو خەڵکی گەڕەکەکە دەزانن کە باوکی "ڕاگنار" وەختی خۆی لادێیی بووە". زیاتریش وتم "من دەزانم بۆچی باوکی ڕووی کردۆتە شار". ئەوە نهێنیەک بوو، وابزانم "ڕاگنار"یش نەیبیستبوو، بەڵام من لەوێدا بڕیارمدا بیدرکێنم. وتم "باوکی ڕاگنار ناچاربوو بگوێزێتەوە بۆ ئۆسلۆ، چونکە کاتی خۆی گرتیان، لەسەرئەوەش گیرا چونکە سواری مەڕەکان بووبوو. ئەوەندە سواری مەڕەکان بووبوو، زۆربەیان نەخۆشکەوتبوون، بەڕاستی نەخۆشکەوتبوون و یەکێکیشیان مرداربووبووەوە. ئەو شتانەش هێندە زۆر ڕوونادەن، تەنانەت لە "هادەلان"یشدا زۆر دەگمەن شتی وا ڕوودەدات". هەردوابەدوای ئەو بەشەی دواتر کە لە دەمم هاتە دەرەوە، هەر هەموویان ڕایانکرد. دڵنیانەبووم لەبەر مەڕەکانی "هادەلان" ڕایانکرد، یان لەبەر خوێنەکەی سەرم کە فیچقەی دەکرد. بەهەرحاڵ لەسەر قیرەکەی بەردەمم گۆمێکی خوێن دروستبووبوو. سەرم لەوە دەسوڕما کە خوێنی سەر هێندە خەست و خۆڵ بێت، چونکە





وامدەزانی خوێنی سەر لەچاو خوێنی تردا ڕەنگێکی ئاڵتر و ڕوونتری هەبێت. بۆ کەمێک چاوم لەسەر دیمەنی خوێنەکە هەڵگرت و تەماشای ناوە بریقەدارەکەی سەر تەختەی دەرگای ژێرزەمینەکەم کرد. بە خەتێکی سەوزی گەورە لێی نوسرابوو "ژوری پەناگا"، ویستم ئەو دوو وشەیە بە پێچەوانەوە بخوێنمەوە، بەڵام پیتە سەوزەکان سەری گێژدەکردم. لەناکاودا پیاوە یەک مەتریەکەم بینی، لەسەری کۆڵانەکەوە بەپەلە بەرەوڕووم دەهات. ئەو کاتە من باڵام بست و نیوێک لەو درێژتربوو. بەچاوێکی پڕلە ترسەوە تەماشایەکی کردم، بە گۆچانە حەیزەرانەکەی ئاماژەی بۆ سەرم کرد و بەدەنگێکی بەرز وتی؛ «ئێ! ئەی ئێستاکە چی لێبکەین؟»

شەرمم دەکرد بڕۆمەوەماڵەوە بۆ لای دایکم، چونکە دەمزانی کە دایکم حەزی لە بینینی خوێن نیە، بەتایبەتیش خوێنی من. بەڵام لە هەمان کاتیشدا هیچ چارەیەکی ترم شک نەدەبرد. هەرکە پێم خستە ئەودیو دەرگای ماڵەوە، خێرا دایکم دوو خاولی لەسەرەوە پێچام، هەر لە عەرەب دەچووم، دواتریش بە تەکسیەک خۆمان گەیاندە لای دکتۆرێکی خەفەر، ئەویش حەوت تەقەڵی لە سەرمدا. دکتۆرەکە وتی "ئەمە گەورەترین برینی ئەمڕۆیە". ئینجا گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە و شلکێنەمان خوارد.

ئەوە یادوەریەکی ڕاستەقینەیە. تائێستاکەش لەسەرو چاوی چەپمەوە و ڕێک لەو شوێنەی کە قژم لەسەر ناوچەوانم کۆتایی هاتووە، شوێن برینێکی درێژ بەسەرمەوەیە. ئەوەش تەنها شوێن برینی لەشم نیە، من دووچاری چەندەها "نیشانەی تایبەتی" لەو جۆرە بووم. بەڵام ئێستاکە چیتر ئەو "نیشانە تایبەتی"انە لە پاسپۆرتی خەڵکیدا نانوسن.





بێگومان دایکم دەیویست بزانێت بە چی وام لێهاتووە. منیش وتم لەگەڵ کوڕێکی نەناسیاودا شەڕم کردووە، چونکە دەیوت باوکم سواری مەڕدەبێت. دایکم ڕەحمی تلیسایەوە و بەزەیی بە باوکمدا دەهاتەوە. ئەو خۆشی زۆرجار زەمی باوکمی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سنوورێکی بۆ خۆی دانابوو. وابزانم دایکم وەک قارەمانێک منی دەبینی، کە لەسەر شەرەفی باوکم شەڕم کردبوو، چونکە وتی؛ «باش تێدەگەم کە تورەبوویت، پیتەر. شتی ئاوها ناوترێت». منیش لەگەڵ قسەکانیدا تەبابووم.

من قەت قسەی خەڵکیم نەدەگێڕایەوە. بەلای منەوە قسە گێڕانەوە وەک لاسایی کردنەوەی ڕوداوێکی هەقیقی وابوو. من وەک تورەهاتێک دەمبینی. قسە هێنان و بردن و شەڕفرۆشتن بۆ ئەو منداڵانە باشبوو کە نەیاندەتوانی بەزمانێکی ڕەوان خۆیان باسی خۆیان بکەن.

*

نەختە نەختە ئەرکی ماڵەوەیان پێدەداین، لەو کاتەوە ئیتر کەمتر تێهەڵدانم دەخوارد. چونکە من یارمەتی منداڵانی تری پۆلەکەمانم دەدا و ئەرکی ماڵەوەیانم بۆ دەنوسینەوە. من هەرگیز لەگەڵ قوتابیانی پۆلەکەمدا دانەدەنیشتم ئەرکی ماڵەوە ڕاپەڕێنم، چونکە ئەوە بەلامەوە شتێکی زۆر ناخۆشبوو، بەدەرلەوەش لەوە دەترسام کە ببنە هاوڕێم. بەڵام زۆر کەرەت ڕوویدەدا لەپێشدا ئەرکی ماڵەوەی خۆمم تەواودەکرد و دواتریش هەمان شتم دووجاری تر دەنوسیەوە. وەڵامە زیادەکانیشم یان بە یەکێک لە قوتابیانی پۆلەکەم دەبەخشی،





یان دەمفرۆشت بە پارچەیەک شوکولاتە یان دەمگۆڕیەوە بە ئاسکریمێک.

بەشێوەیەکی ئاسایی سێ چوار بابەتی داڕشتنیان دەداینێ کە لە نێوانیاندا یەکێکیان هەڵبژێرین و لەسەری بنوسین. بۆ نمونە کاتێک کە داڕشتنێکم دەربارەی بابەتی "وەک حەکایەت" دەهۆنیەوە، حەزمدەکرد وەڵامی ئەو داڕشتنەش بدەمەوە کە ناوی "لەو کاتەدا کە تاریکی داهات" بوو، بەڵام بۆم نەبوو وەڵامی دوو داڕشتن بدەمەوە، لەبەرئەوە ناچاربووم یەکێکیان بە "تۆرە" یان "ڕاگنار" ببەشم.

یاریدەدانی "تۆرە" و "ڕاگنار" بیرۆکەیەکی باشبوو، چونکە لەوەبەدواوە شەڕیان پێنەدەفرۆشتم. بەپلەی یەکەمیش لەبەرئەوە نەبوو کە سوپاسی ئیشەکەم بکەن، بەڵکو تاڕادەیەک لەوە دەترسان کە من بە هەموو پۆلەکە بڵێم کە داڕشتنەکەیان دەنوسمەوە. من خۆم بە هیچ جۆرێک لە مامۆستاکەمان نەدەترسام کە ئەو ڕاستیەی پێ بڵێم. خەتای من نەبوو کە هەر قوتابیەی دەبوایە وەڵامی یەک داڕشتنی بدایەتەوە. منیش نەبووم کە وەڵامەکانی "تۆرە" و "ڕاگنار"م دەدایە دەستی مامۆستا. ئێ ئەوان خۆیان داڕشتنی خۆیان دەنوسیەوە. بێگومان هەر واشبوو.

من هەرگیز وەڵامە زیادەکانم بەدەستمەوە نەدەگرت و دەرم نەدەخستن، بەڵام هێدی هێدی هەندێک لە قوتابیانی پۆلەکە خۆیان دەهاتن بۆ لام و داوایان لێدەکردم کە بیانکرنەوە. منیش لەگەڵیاندا دەکەوتمە مامەڵە، هەمیشەش لەسەر پارە یان شوکولاتە نەبوو، نەخێر... جاری وابوو لەبەرامبەر "نیشاندانی ئازایەتی"دا دەمگۆڕینەوە. مەرجیش نەبوو کە شتێکی یەکجار گەورە بێت، بەڵکو هەر ئەوەندە بەسبوو کە لە گەرمەی وانەی ئیشی دەستدا بوێرن یەک





دوو وشەی قۆڕ و بێشەرمانە بڵێن، یان زاتبکەن تۆپەڵێک بەفر بخەنە سەر کورسی مامۆستا.

هەتاوەکو پۆلەکانی دواتریش کە گەورەتر بووبووین کۆمەکی قوتابیەکانی ترم دەکرد و ئەرکی ماڵەوەیانم دەنوسیەوە، من یەکێک لە "نیشاندانی ئازایەتی" کوڕێکی پۆلەکەم بیردێتەوە کە دەبوایە تەرەقەی سوخمەی یەکێک لە کچەکانی پۆلەکەی بکردایەتەوە. بێگومان ئەو کاتە چەند کچێکی کەمی پۆلەکە گەیشتبوونە ئەوەی سوخمە ببەستن، ئەوانەش جوانترین کچی پۆلەکە نەبوون. ئەگەر کەسێکیش ئەو شتەی نەکردبایە کەلەسەری ڕێککەوتبووین، ئەوا ئەو کاتە دەکەوتە "زۆنی مەترسیەوە"، هەموو کەسێکیش ئەوەی دەزانی، چونکە لەدواجاردا لەوانەبوو کە ناچارمکەن هەموو شتێک بۆ مامۆستاکان بگێڕمەوە و بڵێم «من ئەرکی ماڵەوەی "ئیوڤین" یان "هانس ئۆلاڤ"م نوسیوەتەوە.

وەڵامدانەوەی ئەرکی ماڵەوە تەنها وانەی زمانی نەرویجی نەدەگرتەوە، بەڵکو وەڵامی وانەی جوگرافیا و ئاینی مەسیحی و مێژووی شوێنەکانی جیهان و ماتماتیکیشم پێشنیاردەکرد. تەنها ئەوەندەبوو کە دەبوایە زۆر لە وەڵامەکانی خۆمەوە نزیک نەبوونایە. بۆ نمونە من یەکەمجار وەڵامی پرسیارەکانی ماتماتیکی خۆمم بە بێ هیچ هەڵەیەک دەدایەوە، دوای ئەوەش وەڵامدانەوەی یەک دوو ڕاهێنانی تر هێندە کاتێکی زۆری نەدەبردم، بەڵام ناچاربووم چەند هەڵەیەکی گونجاوی تێبئاخنم. چونکە بەهیچ جۆرێک ڕێی تێنەدەچوو کە "تۆرە" ڕاهێنانێکی بێ هەڵە بداتەوە دەستی مامۆستا. "تۆرە"



ئەوەندەی بەسبوو کە 7[9] بهێنێت، واتە من ناچاربووم وەڵامێکی بۆ بنوسمەوە کە 7 بهێنێت. وە ئەگەر یەکێکی تریش بیویستایە 7 بهێنێت، ئەوا ئەوسا دەبوایە وەڵامەکەی ئەویش لە هەمان ئاستدا بوایە، بەڵام بێگومان دەبوایە هەندێ هەڵەی ترم بخستایەتە وەڵامەکەیەوە.

زۆرجار واڕێدەکەوت کە دەبوایە وەڵامەکانم بەشێوەیەک بدایەتەوە کە نمرەی 5 یان 6 بهێنن. تەنانەت لەو ئاستەشدا بازاڕم هەبوو. من باش لەوە تێدەگەیشتم کە "ئارنە" و "لیزبێت" تاقەتیان نەبوو ڕاهێنانەکانیان بنوسنەوە، چونکە هەرگیز لە نمرەی 5 یان 6 زیاتریان وەرنەدەگرت، بەڵام من هیچ شتێکم لەبەرامبەری ئەو وەڵامەدا وەرنەدەگرت کە تەنها نمرەی 5 بهێنێت. بێگومان منیش دەبوایە سنوورێکم هەبوایە. من هەر ئەوەندەی کە ڕێگام پێدەدرا ئەو هەموو وەڵامە بدەمەوە، هەستم دەکرد هەقی خۆمم بە زیادەوە وەرگرتووە. بەتایبەتیش چێژم لە تێئاخنینی ئەو هەموو هەڵەیە دەکرد لە ڕاهێنانەکاندا. من لەوێدا داهێنانم زیاتر دەبینی وەک لەوەی وەڵامێکی بێ هەڵە بنوسمەوە. لەوێدا پێویستیم بە فەنتاسیای زیاتربوو.

ئەو کاتانەی کە بەڕاستی پێویستیم بە پارەدەبوو و دایک و باوکیشم ئەوە نەبوون قسەیان لەگەڵدا بکرێت، چونکە نەیاندەویست لە پارەی ڕۆژانەکەم زیاترم بدەنێ، ڕوویدەدا کە وەڵامێک بدەمەوە کە 10 یان 11 بهێنێت. بیرمە کەرەتێکیان ڕاهێنانێکی جوگرافیام ئەنجامدا کە نمرەی 13 بهێنێت. بۆ "هێگە"بوو، ئەو کاتە پێشبڕکێیەکی سەماکردن

[9] بەرزترین نمرەی ئێرە '13'یە.





له قوتابخانەی سەمای "ئۆسە و فین"دا دەگێڕدرا، ئەویش بەتەواوەتی سەرقاڵی مەشقکردنی سەمای "سامبا" و "چا چا چا" بوو. کاتێک ئەو جۆرە ڕاهێنانەیان دەدامێ بەئانقەست یەک دوو هەڵەی بچوکم دەخستە ناو وەڵامەکانی خۆمەوە، بەو شێوەیەیش نمرەی 10م دەهێنا و نمرەیەکی زیاترم لە وەڵامەکەی تر وەرنەدەگرت. لەو کاتانەشدا مامۆستاکەمان شتێکی لەم بابەتەی لەسەر وەڵامەکەم دەنوسی؛ "لەوەدەچێت کەمێک بێ سەرنج بووبیت، پیتەر؟"، من پێکەنینم بەو جۆرە شتانە دەهات. هەر لە سەرەتای ساڵی شەستەکانەوە هەندێک لە مامۆستاکان پەیڕەوی ئەو شتەیان دەکرد کە دواتر ناوی "هەڵسەنگاندنی تایبەتی فێرکردن"یان لێنا. "هەڵساندنێکی تایبەتی بوو کە لەسەر وەڵامێکی 10 نمرەیی منیان دەنوسی "سەرنجت کەم بووە"، بەڵام ئەگەر "لیزبێت" هەمان ئەو وەڵامەی منی بدایەتەوە، ئەوا ئەو کاتە مامۆستاکەمان لەسەری دەنوسی "پیرۆزبایت لێدەکەم لیزبێت! دەست خۆش، تا بڵێیت وەڵامێکی باشت داوەتەوە". مامۆستاکەمان ئەوەی نەدەزانی کە من هەروا بۆ خۆشی وەڵامێکی ناتەواوم داوەتەوە. ئەو هێندەی نەدەزانی کە من گزیم لە خۆم کردووە بۆ ئەوەی نمرەیەکی خراپ بهێنم.

دواتر دەبوایە "هێگە" بە دەنگی بەرز لەبەرچاوی پۆلەکەدا وەڵامە نایابەکەی وانەی جوگرافیای بخوێندایەتەوە. وابزانم ئەو چاوەڕوانی ئەوە نەبوو، بەڵام مامۆستاکەمان سوربوو لەسەرئەوەی یەکسەر بڕواتە سەر مێز و کورسیەکەی ئەو و دەستبکات بە خوێندنەوە. خۆشی چوو لە جێگاکەی "هێگە"دا دانیشت، ڕێک لەتەنیشتی منەوە بوو. من لەسەر مێزی سێهەمی ڕیزی ناوەڕاستدا دادەنیشتم، "هێگە"ش لەلای ڕاستمەوە دادەنیشت، بەڵام لەو کاتەدا مامۆستاکەمان لە شوێنەکەیدا





دانیشتبوو. دواتر "هێگە" دەستی کرد بە خوێندنەوە. "هێگە" کچێک بوو لەو قوتابیانەی پۆلەکەمان کە دەستێکی باڵای لە خوێندنەوەدا هەبوو بەدەنگی بەرز، بەڵام لەوێدا زۆر بە دەنگێکی نزم دەیخوێندەوە و مامۆستا ناچاربوو داوای لێبکات کەمێک دەنگی بەرزبکاتەوە. "هێگە" کەمێک دەنگی بۆ بەرزکردەوە، بەڵام کەمێک دواتر بەشێکی پەڕاند و ناچاربوو سەرلەنوێ دەستپێبکاتەوە. چەند جارێک بەلاچاو تەماشایکردم، منیش یەک کەڕەت بەدزیەوە بەپەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپم وەڵامم دایەوە. لەگەڵ تەواوبوونیشیدا مامۆستاکەمان چەپڵەیەکی بۆ لێدا، نەک لەبەرئەوەی کە بەشێوەیەکی جوان خوێندیەوە، بەڵکو لەبەر باشی ناواخنی وەڵامەکەی بوو، ئینجا منیش چەپڵەیەکم بۆ لێدا. لەو کاتەدا کە "هێگە" لەسەر مێزی مامۆستا هاتە خوارەوە، پرسیارێکم لە مامۆستا کرد و وتم "هێندە کاتمان ماوە کە "هێگە" سەمایەکی "چاچاچا"مان پێشکەشبکات؟" ئەویش بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وتی؛ "ئەوەیان بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین". لەوێدا لەوەدەچوو "هێگە" حەزبکات سەرم لێبکاتەوە، بەڵام نەیوێرا. وابزانم لەوە دەترسا کە لەپڕێکدا ڕاستیەکەی ئاشکرابکەم و بڵێم منی میهرەبان وەڵامەکەیم نوسیوەتەوە، چونکە ئەو زۆر بە گوڕ سەرقاڵی مەشقکردنەکەی بوو بۆ پێشبڕکێی سەماکەی. من قەت نەمدەویست شتێکی ئاوها بکەم، چونکە "هێگە" بەڕێکوپێکی پارەی خۆی دەدا. ئەو لەبەرامبەری وەڵامەکەدا دوو کرۆن و نیوی دابوومێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام هەر نائارامبوو. ئەو نەیدەزانی کە من چەندەها جاری تریش ڕاهێنانی قوتابیەکانی تری پۆلەکەم نوسیوەتەوە. بەڕاستی ئەوە یەکەمین جار نەبوو کە دابنیشم گوێ بۆ هونەرە بەرزەکەی خۆم شلبکەم کە بەدەنگێکی بەرز لەسەر مێزی مامۆستاوە





دەخوێنرایەوە. ئەوەش هەستێکی خراپی پێنەدەبەخشیم، بەپێچەوانەوە من چێژم لێدەبینی. من یاریدەدەرێکی باشبووم. من بەرپرسیاری هەموو پۆلەکەبووم.

دواتر لە قوتابخانەی ناوەندیشدا من و "هێگە" لە هەمان پۆلدا بووین. کەرەتێکیان لە پۆلی یەکدا گرەوێکی خۆشمان کرد؛ مامۆستایەکمان هەبوو ناوی "لایلا نییەن" بوو، پارەیەکی زۆری لە یانسیبدا بردبۆوە. بەو پارەیە فیاتێکی نوێی مۆدێلی 500ی پێکڕی. من وتم کۆمەڵێک لە کوڕان بەئاسانی دەتوانن ئەو سەیارە بچکۆلەیە بەرزبکەنەوە و لەدەرگا گەورەکەی قوتابخانەوە بیهێننە ژورەوە و لە هۆڵی کۆبونەوەی قوتابیاندا دایبنێن. "هێگە" پێی خۆشبوو گەر شتێکی وامان بکرایە، بەڵام پێی وانەبوو کەرێتیەکی ئاوها گەورە بکەین. منیش بەهەلم زانی و وتم "ئەگەر لەم حەفتەیەدا فیاتەکەی "لایلا" لە هۆڵی کۆبونەوەی قوتابیاندا ببینین، ئەوا دەبێت پەیمانم بدەیتێ کە پیاسەیەکی ڕۆمانسی ناو دارستانەکەم لەگەڵدا بکەیت. وە ئەگەر نەمانتوانی ئەوا ڕاهێنانی یەک مانگی بیرکاریت لەسەر من دەبێت". پاش دوو ڕۆژ ماشێنەکە لە هۆڵەکەدابوو. هەموو کارەکەش لە ماوەی دە خولەکدا ئەنجامدرا، ڕێک لە پشووی نانخواردندا هێنامان و دەمانزانی مامۆستاکان کۆبونەوەیان هەیە. بەدەر لەوەش فریا کەوتین پارچە قوماشێکی شینی کاڵ بەشێوەی قردێلەیەک بە فیاتە سورە بچکۆلەکەوە ببەستین، لەوە بەدواشەوە بەڕاستی لە دیاریەکی یانسیب دەچوو. بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە هەرگیز بۆی دەرنەکەوت کە کێ ئەو فێڵە بچکۆلەیەی کردووە، بەڵام "هێگە" ناچاربوو لەگەڵمدا پیاسەیەکی ناو دارستانەکە بکات. بەهیچ شێوەیەکیش خۆی لەو پەیمانە نەدزیەوە کە ڕێککەوتبووین لەسەری؛ "پیاسەیەکی ڕۆمانسی



ناو دارستانەکە". "هێگە" کچێکی بێئەقڵ نەبوو، ئەو زۆر بەباشی دەیزانی کە من جارجارێک چەندە فێڵبازم، ئەوەندەشی دەزانی کە من تەنها لەبەر خاتری ئەو، ماشێنێکم لەگەڵ چەند کەسێکدا هەڵگرت و گەیاندمە هۆڵی کۆبونەوەی قوتابیان. لەلای "لیندەرئوتکۆللن"ەوە چووینە ناو کوخێکی دارینی بچکۆلەوە کە شوێنی ئامێر کۆکردنەوەبوو. ئەوە یەکەمین جاربوو کە لەگەڵ ئافرەتێکی ڕووتدا ببم. هەردووکمان تەمەنمان تەنها چواردەساڵ بوو، بەڵام لەشولاری ئەو بەتەواوەتی پێگەیشتبوو. دەست لێدانی ئەو لە هەموو ئەو شتانە خۆشتربوو کە لە ژیانمدا دەستم لێدابوون.

هەندێ جار کۆمەکی مامۆستاکانیشم دەکرد. من بەردەوام پێشنیاری بابەتی داڕشتن و ئەرکی ماڵەوەی خۆش خۆشم دەخستە بەردەستیان. یەک دوو جارێکیش پێشنیازی خۆمم پێشکەشی مامۆستای بیرکاری کرد کە ڕاهێنانەکانی پۆلەکە بەشێوەیەکی باشتر دابڕێژێت. هەندێ جاریش داوام لە مامۆستا دەکرد کە وردتر بابەتێکمان بۆ ڕونبکاتەوە یان زیاتر بچێتە قوڵایی ئەو بابەتەی کە لە پۆلدا باسی دەکرد. بۆ نمونە ئەگەر باسی مێژووی میسرمان بکردایە، ئەوا ئەو کاتە داوام لە مامۆستاکە دەکرد کە باسی "بەردەکەی شاری ڕەشید"مان[10] بۆ بکات.

[10] لە شاری ڕەشیدی میسردا لەساڵی 1799دا بەردێکی بەنرخی کۆنیان دۆزیەوە. نوسراوی سەر ئەو بەردە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 196ی پێش زاین و بنچینەی زمانی میسری و یۆنانی کۆنی لەسەربوو، دواتر 'شامپۆلین' لەڕێگەی ئەو نوسراوانەوە لە ساڵی 1822دا کۆدی زمانی 'هیرۆگلیفی' میسری پێکردەوە.

بەماموستاکەم وت "ئەگەر ئەو بەردە نەبوایە ئەوا توێژەرەوەکان نەیاندەتوانی نوسراوی "هیرۆگلیفی" بخوێننەوە، لێرەشەوە نەدەکرا بزانین خەڵکی میسری کۆن بە چ شێوەیک بیریانکردۆتەوە". یان ئەو کاتەی کە ماموستا باسی "کۆپرینکۆس"ی بۆ دەکردین، پرسیاری زیاترم لێدەکرد و دەمویست کەمێک دەربارەی "کیپلەر" و "نیوتن"یشمان بۆ باسبکات، چونکە وەک ئاشکرایە "کۆپرینکۆس" لە هەموو بۆچوونەکانیدا ڕاست نەبوو.

من هەر لە تەمەنی 12_11 ساڵیەوە خوێنەرێکی باشبووم. لە ماڵەوە هەردوو "لەکسیکۆن"[11]ی "سەلەمونسن" و "ئاشەهاو"مان هەبوو، هەردووکیان لە دوو توێی 43 بەندا بوون. کردنەوە و خوێندنەوەی "ئینسایکلۆپیدیا"یەکیش بەتەواوەتی کەوتبووە سەر وزە و تاقەتم. من لە سێ باردا تەماشای ئەو فەرهەنگە گشتیەم دەکرد؛ کاتێک کە پێویستیم بە بابەتێکی دیاریکراوبوو، زۆر جاریش پەیوەندی بە شتێکەوە بوو کە بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بیرم لێکردبۆوە، یان بۆ ماوەیەکی زۆر بەچەپ و بەڕاستدا هەر دەمخوێندەوە و پێویستیم بە فەرهەنگێک بوو، یان جاری واهەبوو حەزمدەکرد سەرتاپای بەندێکی فەرهەنگەکە بخوێنمەوە، بۆ نمونە بەندی 12 ی "ئاشەهاو" هەر لە "کڤام"ەوە تا "مادیرا"، یان بەندی "XVIII" "سەلەمۆنسن" لە "نۆرلانسباد"ەوە تا "پیارلەئیوەنە". بەدەرلەوانەش لەسەر ڕەفەکانی کتێبخانەکەی ژوری دانیشتنیش دایکم چەندەها کتێبی سەنجڕاکێشەری تری دانابوو. من زیاتر شاکارە گەورەکانم بەلاوە مەستبوو، ئەو کتێبانەی کە زانیاریەکی زۆری دەربارەی بابەتێکی

---

[11] فەرهەنگی گشتی بە وردەکاری و وێنەوە.





دیاریکراو تێدابوو، هەروەک "جیهانی هونەر"، "جیهانی مۆیسقا"، "لەشی مرۆڤ"، کتێبی "مێژووی ئەدەبیاتی جیهانی"یەکەی "فرانسیس بووڵ"، یان کتێبی "مێژووی ئەدەبیاتی نەروەیجی"یەکەی "بووڵ، پاشێ و وینسنس و هۆیم"، یان "فەرهەنگی ڕەچەڵەکی وشەکانی زمانی نەرویجی و دانیمارکی"یەکەی "فالک و تۆرپ". تەمەنم دوانزە ساڵانبوو کە دایکم کتێبی "چیرۆکی ژیانم"ی "شارلی شاپلن"ی کڕی. هەرچەندە کتێبێکی هێندە بابەتی نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک جۆرە ئینسایکلۆپیدیایەک وابوو بۆم. دایکم بەردەوام پێی دەوتم "بیرت بێت لەپاش خوێندنەوە هەموو کتێبەکان بخەیتەوە شوێنی خۆیان"، هەتا ڕۆژێکیان بڕیاریدا کە بۆم نەبێت لەیەک کاتدا لە چوار کتێب زیاتر لە ژورەکەمدا دانێم. ئەو دەیوت "خۆ لە یەک کاتدا ناتوانیت لە یەک کتێب زیاتر بخوێنیتەوە، ئیتر ئەو هەمووەت بۆچیە؟". ئەو لەوە تێنەدەگەیشت کە من هەندێ جار لە چەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە بابەتێکم بەراورد دەکرد. وابزانم دایکم هێندە گرنگی بە ڕەخنەگرتن لە سەرچاوەکان نەدەدا.

پاش ئەوەی ماموستاکەمان باسی پێخەمبەرەکانی ئاینی مەسیحی بۆ کردین، داوالێکرد لە لاپەڕەی پێخەمبەر "ئیسایە"دا[12] تەماشای بەشی 7 و ئایەتی ژمارە 14 بکات. ویستم جیاوازی نێوان "کچێکی گەنج" و کچێک کە خاوەنی "کچێنی" خۆی بێت بۆ هەموو پۆلەکە ڕوونبکاتەوە، چونکە وام مەزەنە دەکرد کە ماموستاکەمان بەلایەنی کەمەوە هێندە بزانێت کە وشەی "عیبری" بەرامبەر "کچێک کە کچێنی خۆی لەدەست نەدابێت" لەو ئایەتەدا کتومت مانای "کچێکی گەنج"

---

[12] یەکێکە لە پێخەمبەرەکان.







دەبەخشێت![13]. من لەوەوپێش ئەو بابەتەم هەر بەرێکەوت لە فەرهەنگە گشتیەکەی "سەلەمونسن"دا بەرچاوکەوتبوو. دواتریش بە مامۆستاکەمانم وت "بەڵام لەوەدەچێت کاتی خۆی "ماتیۆس" و "لۆکاس" بەشێوەیەکی ورد و بنچینەیی تێکستە عیبریەکەیان نەخوێندبێتەوە. لەوانەیە دەقە وەرگێڕدراوە یۆنانیەکەیان بەلاوە بەسبووبێت. ئەو دەقە ناوی "سێپتواجینتا" بوو، من پێکەنینم بەو ناوە دەهات. لەبنەڕەتدا وشەی "سێپتواجینتا" وشەیەکی لاتینیە و واتا 70، کاتی خۆی 70 مامۆستای جولەکە لە ماوەی 70 ڕۆژدا "پەیمان نامەی کۆن"یان وەرگێڕایە سەر زمانی یۆنانی، هەر لەبەرئەوەشبوو کە ئەو ناوەیان بەسەر دەقە وەرگێڕدراوە یۆنانیەکەدا چەسپاند. من هەموو ئەو شتانەم بە مامۆستاکەمان وت.

مامۆستاکان هەموو کەرەتێک ئەو شێوازەی منیان بەلاوە خۆشنەبوو کە بابەتی زیادەم پێ دەخستە سەر وانەکانیان، هەرچەندە من زۆر گرنگیم بەوەدەدا کە ڕاستیان نەکەمەوە، بەتایبەتیش کە هەندێ جار بەتەواوی شتێکی هەڵەیان دەوت. هەرچەندە مامۆستاکەمان پێی لەسەر بیروڕای باوی کڵێسە و پەرەگرافی فێرکردنی گشتی قوتابخانە دادەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من وێرام هێرش بکەمە سەر بیروباوەڕی ئاینی دەربارەی "منداڵبوون لە کچێکەوە"، چونکە بەبڕوای من هەڵەیەک ڕوویداوە لە دەقە وەرگێڕدراوەکەی "سێپتواجینتا"دا. جارجارێکیش شتی هەرزۆر ئاساییم دەوت، بەڵام نەیدەهێشت قسەبکەم، بۆ نمونە کەرەتێکیان وتم بەپێی گێڕانەوەکانی

[13] هەڵبەتە لێرەدا مەبەستی لە مەریەمی'عەزراء'ە.



"جۆهانس"[14] مەسیح بۆ ماوەی سێ ساڵ لەناو خەڵکیدا چالاکبووە، بەڵام بەپێی سەرگوزشتەی سیانەکەی تر تەنها یەک ساڵ لەناو خەڵکیدا بووە.

لە وانەی زانیاری سێکسیشدا بەلای منەوە مایەی شەرمەزاریبوو کە مامۆستا وشەی "ئەندامی نێرینە"ی پیاوی بۆ بەشێکی دیاریکراوی لەش بەکاردەهێنا، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتانەدا کە باسی جوتبوون و زاوزێی دەکرا. من دەموت وشەی "ئەندامی نێرینە" بەتەواوەتی باوی نەماوە، بەتایبەتیش لەباسە سێکسیەکاندا. مامۆستاش پرسیاری لێدەکردم و دەیوت «ئەی بە بڕوای تۆ چ وشەیەک بەکاربهێنم؟» ئەو کەسێکی کراوەبوو و جگەلەوەش کەسێکی بەخۆبوو و باڵای نزیکەی دوو مەترێک دەبوو. بەڵام لەو کاتەدا هیچ وەڵامێکی پێنەبوو. منیش وەڵامی پرسیارەکەیم دایەوە و وتم؛ «نازانم، بەڵام لایەنی کەم هەوڵبدە وشەیەکی تر بدۆزیتەوە. بەڵام با وشەیەکی لاتینی نەبێت».

من هەرگیز ئەو جۆرە ئامۆژگاریانەم لە پۆلدا نەدەوت. چونکە بەڕاستی حەزم نەدەکرد کە خۆم بە جۆرێک پیشانی قوتابیەکانی تر بدەم کە من زیرەکترێکم لەوان، یان ئەوە دەربخەم کە هەندێ جار لە مامۆستاکانیش زیرەکترێکم. من هەمیشە لە حەوشەی قوتابخانەدا قسەم لەگەڵ مامۆستاکاندا دەکرد، یان لە کاتی هاتنە ژورەوە و چوونە دەرەوەیاندا وە بەبێ هیچ مەرامێک بیروڕای خۆمم پێدەوتن. ئەوەشم لەبەرئەوە نەدەکرد کە خۆمیان لێ نزیک بکەمەوە، لەبەرئەوەش نەبوو وای نیشانبدەم کە گرنگیەکی زیاد لەڕادە

[14] یەکێکە لەو چوار نوسەرەی کە کاتی خۆی 'پەیمان نامەی نوێ'یان نوسیەوە، سیانەکەی تریش ناویان 'ماتیۆس' و مارکۆس' و 'لۆکاس'بووە.



دەبەخشم بە ئەرکی ماڵەوە. تا ڕادەیەک بەپێچەوانەوەبوو، هەندێ جار وامنیشاندەدان کە کەمتر حەزم لە ئەرکی ماڵەوەبێت. هەستمدەکرد بەو شێوەیە خۆشترێک بێت.
کەواتە لەوانەیە کتومت هەر تەنها لەبەر دڵسۆزی بووبێت کە ئامۆژگاریم دەکردن؟ نەخێر، ئەوەشیان نەبوو. من بۆیە تاوناتاوێک ئامۆژگاری باشم پێشکەشی مامۆستاکان دەکرد، چونکە شێوەی بەرپەرچدانەوەیانم بەلاوە خۆشبوو. پێم خۆشبوو بیانبینم کە خۆیان دەنوێنن. خنەم بە بینینی لەنجەولاریان دەهات.

*

من هەموو حەفتەیەک لەڕۆژی شەمماندا گوێم بۆ بەرنامەی منداڵان شلدەکرد و لەو بارەیەشەوە تەنها منداڵ نەبووم. هەموو منداڵانی نەرویجی گوێیان بۆ بەرنامەی منداڵانی شەممان دەگرت. من دواتر لە ئاکارێکی ڕەسمیدا خوێندمەوە کە لە نێوان ساڵانی 1950 و 1960دا لەسەدا 98ی منداڵانی نەرویجی گوێگری ئەو بەرنامەیەبوون. دەکرێت بڵێین تا بڵێیت ئەوە بینینێکی کۆنسەرڤاتیڤی بووە.
ئێمە لەو شتەدا دەژیاین کە توێژەرە کەلتوریەکان پێی دەڵێن "یەکبوونی کەلتوری". هەموو منداڵێک کە نرخی خۆی بزانیبایە گوێی بۆ "سامپا" و "ڕێگای بەرو شاری "ئارگا" شلدەکرد، گوێی لە "کارلسن" و "فاونتلێرۆی بەگزادەی بچوک" دەگرت. هەمووان کتێبەکانی "دێبسی" و "پۆلیسە ئافرەتەکە" و "پێنج کتێبەکە"مان دەخوێندەوە. ئێمە لەلایەن "لاوریتز جۆهانسن" و "تۆربیۆن ئاینە" و ئالف پخێوسن" و "ئانە کات فێستلی"ەوە پەروەردە کراین. جگەلەوەش هەمومان





لەڕێگەی کەناڵە جیاوازەکانەوە بنەمایەکی هاوبەشمان هەبوو. لەڕێگەی ڕاپۆرتە دورودرێژەکانی پێشبینیکردنی کەش وهەواوە کە لە ئینستتیوتی کەشناسیەوە بڵاودەکرایەوە، لەڕێگەی گوێگرتن بۆ تێبینیە وشک و برنگەکانی بۆرسە و بەرنامەی بەزم و خۆشیەکانی ڕۆژانی شەممان کە لە "ستۆدیۆ گەورەکانی مارینلیوست"ەوە بەخشدەکرانەوە، لەڕێگەی بەرنامەی ڕادیۆی وەک "کۆنسێرتی داواکراو" و "ڕاپۆرتی هاتوچۆی ڕۆژانە" و "دیکی دیک دیکینس" و "ترس و سامی شاری شیکاگۆ"وە. هەموو ئەو نەرویجیانەی کە هاوتەمەنی منن هەمان بنەمای کەلتوریان هەیە. ئێمە وەک"یەک" خێزانی گەورە وابووین.
هەموو شەممەیەک لەگەڵ بەرنامەی منداڵاندا پارچەیەک شوکولاتەی نیو کرۆن بایی و شوشەیەکی بچکۆلەی ساردی "سۆلۆ"یان پێدەداین، جگەلەوانەش یان پاکەتێک پسکیتیان دەداینێ کە شێوەی پیتەکانی لەسەربوو، یان پاکەتێکی پچکۆلەی کشمیش، یان کیسەیەک فستقیان دەخستە بەردەممان. هەندێ جاریش کشمیش و فستقیان دەداینێ و ئێمەش تێکەڵمان دەکردن. شیرینی ڕۆژی شەممان هەروەک خواردنی نیوەڕوانی قوتابخانە شتێکی دیاریکراوبوو. خواردنی نیوەڕوانی قوتابخانە ڕەسمەیەکان پێکهاتبوون لە شیری چەور، نانی ڕەق بە پەنیری بزنەوە، پارچەیەک نانی ئاسایی و جگەری کوڵاو و مرەبا و سەندەویچێک. هەندێ جار لەکاتی نانخواردندا دەکەوتمە پرسیارکردنی ئەوانی تر و دەمویست بزانم ئەوان لە ڕۆژی شەمماندا لەکاتی بەرنامەی منداڵاندا چی دەخۆن. بۆمدەرکەوت کە هەموویان کتومت هەمان ئەو شتانەیان دەخوارد کە من دەمخواردن. من بەلامەوە ناخۆشبوو کە شێوە پلانێکی نادیار لەنێوان دایکان و باوکاندا بوونی

هەبوو. دواتریش بۆمدەرکەوت کە "یەکبوونی کەلتوری" چ کاریگەریەکی قوڵی هەیە.

ڕێشدەکەوت کە کرۆنێکیان دەدایێ و خۆمان دەچووینە دوکانەکە بۆ ئەوەی شیرینی ڕۆژی شەممانی پێبکرین. بێگومان زۆر خۆشتربوو لەتێکەڵە باوەکەی فستق و کشمیش و پسکیتەکەی ماڵەوە. ئەو کاتە بە کرۆنێک دە پارچە شوکلاتەی بچکۆلەمان پێدەکڕی. تەنانەت بە دە "ئیورە"ش [15] شتی پێدەکردرا، دەمانتوانی "جەلی"یەک یان دوو نوقوڵ یان نەعنایەکی شیرینمان پێبکرییایە، دەشمانتوانی دوو شوکلاتەی پێنج "ئیورە"یی یان چوار بنێشتی پێبکرین. واتە بە کرۆنێک دەمانتوانی سێ پارچە شوکلاتەی بچکۆلە و دوو جەلی و دوو نوقوڵ و نەعنایەکی شیرین و چوار شوکلاتەی پێنج "ئیورە"یی و چوار بنێشتی پێبکرین. دەشمانتوانی پسکیتێکی 25 "ئیورە"یی و شەربەتێکی 25 ئورەیی پێبکرین و لەگەڵیشیدا بۆ نمونە داوای دوو پارچە شوکلاتەی بچکۆلە و دوو جەلی و نەعنایەکی شیرین بکەین. من پارەکەی خۆمم باش بەکاردەهێنا و شتی زۆرم پێدەکڕی. بەدەر لەوەش جارجارێک دزیەکی پچکۆلەم لە دایکم دەکرد، دەستم دەکرد بە گیرفانی پاڵتۆکەیدا و پارەی وردەم دەدزی، بەتایبەتیش ئەو کاتانە زەفەرم دەهێنا کە لە گەرماوەکەماندا خەریکی ڕازانەوەی خۆی دەبوو، یان کە پاش نیوەڕوان سەرخەویکی دەشکاند، یان کە لە ژوری دانیشتندا گوێی بۆ ئۆپێرای "لا بۆهیمە" شلدەکرت. من ویژدانم ئازاری نەدەدام کە یەک دوو پارەی ئاسنم لە دایکم دەدزی، چونکە تەنها لەو کاتانەدا دەستم دەکرد بە گیرفانیدا کە بۆ ماوەیەک تەلەفونم بەکارنەهێنابوو.

[15] یەک کرۆن سەد 'ئیورە'یە و لە جێگەی فلسی کۆن دادەنرێت.









چوار تەلەفون یەکسانبوو بە یەک کرۆن _من هەر لەو کاتەوە مرۆڤێک بووم کە حەزم بە کەمێک ڕێکوپێکی دەکرد. زۆر بە وریاییشەوە دزیم لەدایکم دەکرد، لەو کاتانەدا کە دەستم دەکرد بە گیرفانیدا، هەوڵمدەدا کلیل و پارە ئاسنەکان بەریەک نەکەون و زرنگەیان نەیەت. لەو کاتەدا کە پارەکەم لولدەکرد، پیاوە یەک مەتریەکە لەتەنیشتمەوە دەوەستا و تەماشای دەکردم، بەڵام ئەو هیچی نەدەگێڕایەوە. گەر کرۆنێک یان نیو کرۆنیەکی زیادەم پێبوایە، ئەو کاتە ئاسانترێک دەمتوانی شیرینی ڕۆژی شەممانی پێ هەڵبژێرم.

هەموو کەسێک وەکو ئێمە ڕادیۆیەکی مۆدێرنی نەبوو. ئێمە دەستبەرداری ڕادیۆ کۆنەکەمان بووین و ڕادیۆیەکی تازەباوەتی "تانبێرگ هولدرا"مان کڕی. لە ژوری دانیشتندا چەند ڕەفەیەکمان بەدیوارەکەوە هەڵواسیبوو کە لەداری ساج دروستکرابوون، ڕادیۆکەمان لەسەر یەکێک لەو ڕەفانە دانابوو، دوو بڵنگۆ و ئارێلێکیشی پێوەبوو. بەو شێوەیەش دەنگەکەی زۆر لە ڕادیۆ کۆنەکان خۆشتربوو. لە ژێر ڕەفەی ڕادیۆکە و گرامافۆنەکەدا، هەموو قەوانەکانی دایکمان دانابوو. زۆربەیان قەوانە کۆنەکانبوون، بەڵام کۆمەڵێک قەوانی مۆدێرن و "گۆرانی تاک"ی خۆشی تیدابوو. هەموو کەرەتێک کە بۆ بەرنامەی منداڵانی ڕۆژی شەممان کیسەیەک شیرینیم دەکڕی، لەتەنیشت یەکێک لە بڵنگۆکانەوە لەسەر سندوقە ئێرانیەکە دادەنیشتم و بەڕیز شیرینی و نوقڵەکانم لەسەر ڕادیۆکە دادەنا. وە ئەگەر شیرینی زیاتریش هەبوایە، مەبەستم لەو کاتانەیە کە پارەیەکی زیاترم بەکاربهێنایە وەک لەوەی بۆم براوبۆوە، بەدزیەوە ڕیزێکی بچکۆلەی شوکولاتە و جەلیم لەسەر ڕەفەی قەوانەکانی خوارەوە دادەنا و لەپێش هەموو شتێکیشدا ئەو ڕیزەم دەخوارد.





گەورەکانیش بۆ بەر قاوەی ڕۆژی شەممان شتێکیان بۆ خۆیان دەکڕی.
من لە قوتابخانەدا لە کاتی نانخواردنی نیوەڕواندا بەباشی لەو بابەتەشم کۆڵیبووەوە، هێندە تێگەیشتم کە دایک و باوکانی تریش تاڕادەیەکی یەکجار زۆر هەمان ئەو شتانەیان دەخوارد کە لە ماڵی ئێمەدا دەخوران. گەورەکان جەلی میوەی 25 "ئیورە"یی گەورەیان دەخوارد، پارچە شوکلاتەی بەتامی کۆنیاک و دوو جۆر مارکەی شیرینی تایبەتیان دادەنا. ئەگەر پێش نیوەڕوانیش میوانیان بهاتایە، ئەوا سەمونی خڕی تازە و زەڵاتەی ئیتاڵییان دەخوارد، وە ئەگەر بیانویستایە هەر زۆر باش بخۆن، ئەوا سەمونی درێژیان دەکڕی و پارچەی گۆشتی گای سورەوەکراو و زەڵاتەی ڕۆبیان و جگەری هاڕاوی فڕن و گۆشتی ڕانی بەرازی کوڵاویان دەخستە سەر پارچەی سەمونی گەورە گەورە و دەیانخوارد.
دایکم وایدەزانی من بۆیە دادەنیشتم و گوێ بۆ بەرنامەی منداڵان شلدەکەم، چونکە بەلامەوە خۆشە. بەڵام نەیدەزانی کە من دانیشتبووم و نوقمی بیرکردنەوەکانی خۆم بووم. ئەو پەی بەوە نەدەبرد کە من لەسەر سنووقەکە دانیشتووم و لەوە ڕادەمێنم کە بە چ شێوەیەک بەرنامەی منداڵان بەشێوەیەکی زۆر باشتر پێشکەش بکرێت. لەو کاتەدا کە هەموو شەممانێک بەرنامەیەکی ڕادیۆ سەرنجی هەموو منداڵانی نەرویجی ڕادەکێشا، هەستمدەکرد دەکرا بێ پایان ئەو بەرنامەیە باشتر بکرێت. من خۆم لەلایەن خۆمەوە چەپکێک پێشنیاری بەرنامەی نایابم داڕشتبوو _هەر لە پێشبڕکێی گوێگران و نوکتە و چیرۆکی خێوەکانەوە هەتا چیرۆکی ئاژەڵان و چیرۆکی ڕاستەقینە و شانۆگەری کورتی کۆمێدی و درامای تایبەت بەڕادیۆ، من هەر خۆشم هەموویانم هۆنیبووەوە. کاتی هەموو بەشەکانیشم دەژمارد و هیچ





کاتێک لە 60 خولەک تێنەدەپەڕی. هەمووی بەرنامەی بەسوود و زانیاری باش باشبوون. من سەرم لەوە دەسوڕما کە لەماوەی 60 خولەکدا چەندە زۆر دەتوانیت بڵێیت، بەتایبەتیش ئەگەر هەستی ڕەخنەگرتنت هەبێت. من هەمیشە ئەو هەستەم هەبوو، بەڵام بەداخەوە هەموو کاتێک "لاوریتز جۆهانسن" ئەو هەستەی نەبوو. تەنانەت پیاوێکی وەک "ئالف پخێوسن"یش دەبوایە پرسیاری لە خوێ بکردایە و بیوتایە ئەم منداڵانە چەند جار دابنیشن و گوێ لەوە بگرن کە من دوو "ئیورە"ییەک دەخەمە ناو دەخیلەکەمەوە. "وڵت دیزنی" هەستی ڕەخنەگرتنی هەبوو، ئەو بەهرەیەکی یەزدانی هەبوو و گەردوونی خۆی ئافەریدەکرد. بەشێوەیەکی گشتی من و "وڵت دیزنی" چەندەها شتی هاوبەشمان لەنێواندا هەبوو. کاتی خۆی ئەویش، بەرلەوەی ببێتە خاوەنی "وڵاتی دیزنی" خۆی، سروشی لە شاری یاریەکەی کۆبنهاگنەوە وەرگرتبوو. من چەندەها چیرۆکی خۆشمەزەی "ئاندەرسی مراوی"م لەلا گەڵاڵەبووبوو، ویستیشم بیاننێرم بۆ "وڵت دیزنی"، بەڵام ئەو بابەتە هەرگیز نەبوو بە هیچ.
پێشنیاری بەرنامەکانیشم نەنارد بۆ ڕادیوی نەرویجی. بێگومان ئەگەر بمناردنایە ئەوا کاربەدەستانی ڕادیۆ لێیان قبووڵدەکردم، بەڵام هەستم دەکرد پێویستم بەوە نەبێت کە بۆ ماوەی یەک سەعاتی ڕەبەق گوێ بۆ بەرنامەیەک بگرم کە خۆم لەوەوپێش لەمێشکمدا دامڕشتبوو. بەو شێوەیەش هەموو بیرۆکە نایابەکانم لەلای خۆم دەهێشتەوە. هەموو کەسێک بیرۆکەی باشی بۆ نایەت. باشترین نمونەی ئەوەش لە گەشەکردنی تەلەفیزۆندا دەبینرێت.





ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمین جار تەلەفیزۆن لەساڵی 1960دا یەکەمین بەرنامەی ڕەسمی پەخشکردەوە، من بەمیوانی چوومە لای دراوسێیەکمان و گوێم بۆ وتاری سەرۆک وەزیران گرت، ئەو وتەیەکی بەبۆنەی کردنەوەی تەلەفیزۆنەوە خوێندەوە. سەرۆک وەزیران "ئاینە گێرهاردسن" لە وتارەکەیدا وتی "بێگومان خەڵکانێکی زۆر نیگەرانی ئەوەن کە تەلەفیزۆن بەشێوەیەکی خراپ بێتە ناو ژیانی منداڵ و خێزانەوە. خەڵکانێکی زۆر لەوە دەترسن کە تەماشاکردنی تەلەفیزۆن نەهێڵێت منداڵەکانیان وانەکانیان ئامادەبکەن، ڕێگەش لەوە بگرێت کە بڕۆنە دەرەوە و یاری بکەن و هەوای پاک هەڵمژن". دواتریش وتی "بەڵام وابزانم تەلەفیزۆنیش هەروەکو ڕادیۆ وایە. بێگومان کە شتێکی نوێ دێتە ئاراوە، خەڵکی دەیانەوێت زۆرترین سودی لێ ببینن". بەڵام"ئاینە گێرهاردسن" لەو بڕوایەدابوو کە ئەوە شتێکی کاتی بێت و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا خۆی بۆ خۆی بەرەو باشتر گۆڕانکاری بەسەردا بێت، هەربۆیە وتی؛ "ئێمە هێدی هێدی فێری هەڵبژاردن و جیاکردنەوە دەبین. دەبێت نەختە نەختە فێربین و باشترێک ئەو شتانە هەڵبژێرین کە بەهایەکی تایبەتیمان پێدەبەخشن. دەبێت ئەوەندە فێربین کە ئەگەر بەرنامەیەک لە تەلەفیزۆندا نیشاندرا و بەلامانەوە گرنگ نەبوو، تەلەفیزۆنەکەمان بکوژێنینەوە. تەنها ئەو کاتە تەلەفیزۆن بەڕاستی خۆشی و سوود دەگەیەنێت". "گێرهاردسن" هیوای وابوو تەلەفیزۆن ڕۆڵێکی نوێ لە فێرکردن و ڕۆشنکردنەوەی خەڵکیدا ببینێت، ببێتە ئامێرێک و لە ڕێگەیەوە زانیاری پێ بڵاوبکرێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات. ئەو چاوەڕوانبوو تەلەفیزۆن ببێتە کلیلی کردنەوەی بەهای نوێی فیکری و ڕۆحی، جەختی لەسەر گرنگی لایەنی چۆنیەتی بەرنامەکانیش دەکردەوە و دەیوت دەبێت مەرجی



تایبەتی و سەختیان لەسەربێت، بەتایبەتیش ئەو بەرنامانەی کە بۆ منداڵان و گەنجان پێشکەشدەکرێن.

"ئاینە گێرهاردسن" مرۆڤێکبوو کە یەکجار گەشبینبوو بەرامبەر داهاتوو. جگەلەوەش کەسێکی باشبوو و خۆشبەختانە هێندە نەژیا هەتا بەچاوی خۆی بەرەلایی کەناڵە تەلەفیزۆنیەکان ببینێت. ئەگەر ئەمڕۆکە "ئاینە گێرهاردسن" بژیایایە، ئەوا لەچەندین کەناڵی جیاوازدا دەیتوانی یەکێک لەم بەرنامانە هەڵبژێرێت؛ کۆمەڵەیەکی بێپایانی "زنجیرە قۆرەکانی ئەڵقە تەلەفیزۆنیە دورودرێژکان" و بەرنامەی "ڕووداوە ڕاستەقینەکانی تەلەفیزۆن". هێندەشی دەبینی کە کەناڵە تەلەفیزۆنیەکان چەندە زیرەکانە لەبواری چۆنایەتی بەرنامەکانیاندا بەربەرەکانێی یەکتری دەکەن، بەتایبەتیش ئەو بەرنامانەی کە منداڵان و گەنجان تەماشایان دەکەن. بەچاوی خۆشی دەیبینی کە چەندە زیرەکانە دەتوانین ئەو بەرنامانە هەڵبژێرین کە بەهایەکی تایبەتیان هەیە بەلای ئێمەوە.

وەک وتم خۆمکردە میوانی ئەو دراوسێیەمان کە تەلەفیزۆنێکی کڕیبوو. من بەبێ هیچ شەرمکردنێک خۆم خۆمم بانگهێشکرد. ئەو کاتە تەمەنم هەشت ساڵ بوو، تازە پشووی هاوین تەواوبووبوو و دەرچووبووم بۆ پۆلی دوو. من ناچاربووم لە یەکەمین چرکەوە ئاگام لەو میدیایە نوێیە بێت.

دراوسێکەمان منداڵی نەبوو، منیش ئەوەم بەدڵبوو. وابزانم ژنیشی نەبوو، بەلایەنی کەمەوە من هەرگیز لەگەڵ هیچ ئافرەتێکدا نەمدەبینی، بەڵام سەگێکی گەورەی "لابرادۆر"ی هەبوو و ناوی نابوو "ڤاڵدەمار". من کەمێک پێش ئەوەی یەکەمین بەرنامەی ڕەسمی





تەلەفیزۆن پەخشبکرێت خۆم گەیاندە ماڵی دراوسێکەمان، هەر بۆئەوەی فریابکەوم نەختێک یاری لەگەڵ "ڤاڵدەمار"دا بکەم، چونکە دەمزانی دراوسێکەمان ئەوەی پێخۆشبوو. پرسیارێکم لە دراوسێکەمان کرد و وتم "بەبڕوای تۆ سەگ دەتوانێت بیربکاتەوە؟" ئەو هیچ گومانێکی لەوە نەبوو کە دەتوانن بیربکەنەوە. ئەو دەیوت "من هەر بەچاوی ڤاڵدەماردا دەزانم کە خەو دەبینێت یان نا، تەنانەت لە شێوەی جوڵانی کلکیشیدا ئەوە دەبینم". منیش وەڵامم دایەوە و وتم ؛«وایە بەڵام بێگومان یان خەو بە ئێسقانێکەوە دەبینێت یان بە خواردنێکی تایبەتی سەگەوە، لەوانەشە خەو بە گەماڵێکەوە ببینێت، بەڵام پێم وانیە سەگێک بتوانێت بۆ نمونە خەو بە نمایشی شانۆگەریەکەوە ببینێت». زیاتریش وتم "سەگ ناتوانێت قسەبکات، لەبەرئەوەش لەو بڕوایەدا نیم کە بتوانن خەو بە شتی گەورە گەورەوە ببینن". دراوسێکەمان دەیوت ڤاڵدەمار بەئاسانی دەتوانێت ئەوەندەم تێبگەیەنێت کە برسیەتی یان دەیەوێت پیسی بکات، دەشیوت زۆر بە ئاسانیش دەیبینم کە دڵی خۆشبێت یان کە دڵتەنگبێت یان کە بترسێت. بەڵام من لەسەر بڕواکەم سوربووم و وتم؛ «بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت چیرۆک بگێڕێتەوە، هێندە فەنتاسی زۆریشی لە کەلەدا نیە کە لێبیبڕژێت، هەر لەبەرئەوەشە کە ناتوانێت بگری». لەو خاڵەدا دراوسێکەمان لەگەڵمدا تەبابوو. ئەو دەیوت ڕاستە من ناچارم لەگەڵ ڤاڵدەماردا بڕۆمە دەرەوە و پیاسەی پێبکەم، بۆ ئەوەی میز بە ژورەکەدا نەکات، بەڵام خۆشبەختانە لەوە ناترسم لەناکاودا وێنەی "ئاندەرسی مراوی" لەسەر دیوارەکان بکێشێت یان سەرینی قەنەفەکان کۆبکاتەوە و شانۆیەکی ماڵەباجێنەی منداڵانی پێدروستبکات. ئەو دەیوت «سەگ وەک ئێمەی مرۆڤ زۆربلێ نین،





لەوانەیە تۆ بتەوێت ئەوە بڵێیت؟». منیش ڕێک مەبەستم لەوە بوو وتم؛ «پێشیدەچێت زۆر دڵیان بەوە خۆشبێت».
لەوەندە زیاتر فریا نەکەوتین لەسەر ئەو باسە بڕۆین، چونکە لەوێدا وتەکەی "ئاینە گێردهاردسن" دەستیپێکرد. من و دراوسێکەمان پێکەوە چرکەی یەکەمی جەژنێکی نەتەوایەتیمان بینی. "ڤاڵدەمار"یش بەهێواشی بەرەو چێشتخانە ڕۆیشت و خۆی بەشتێکی ترەوە خەریک کرد.

هەرزوو ئەو میدیا نوێیە بووە شتێکی سەرنجڕاکێشەری یەکجار گەورە. من پاش نزیکەی ساڵێک توانیم قەناعەت بە دایکم بهێنم کە تەلەفیزۆنێک بکڕێت، دوای ئەوەش هێندەی پێنەچوو چەندەها و چەندەها بیرۆکەی نوێم بۆ بەرنامەکان بەخەیاڵدا دەهات. من هیچ یەکێک لە پێشنیارەکانم بۆ تەلەفیزۆن نەنارد، بەڵام بەردەوام تەلەفونم بۆ دەکردن و ڕای خۆمم لەسەر بەرنامەکانیان پێڕادەگەیاندن.
یەکێک لەو بیرۆکانەی کە بەخیاڵمدا هات دەربارەی پڕۆگرامێک بوو؛ دەبوایە دە کەس بەشداریان تێدابکردایە و هەموویان لە خانویەکی گەورەی چۆڵدا نیشتەجێبکرانایە. دەشبوایە لە جیهانی دەرەوەیان دابڕێن و تەنها ئەو کاتە ڕێگەیان پێبدەن بێنە دەرەوە کە شتێکی تەواو نوێیان خوڵقاندبێت، شتێکی واشبێت کە بۆ هەمیشە گرنگیەکی تایبەتی بۆ هەموو مرۆڤێکی سەر زەوی هەبێت. ئەو شتە بۆ وێنە دەکرێت بەیاننامەیەکی نوێ و باشتری مافی مرۆڤبێت، یان هۆنینەوەی جوانترین چیرۆکی جیهان بێت، یان بۆ نمونە پرۆڤەکردنی هەزەلیترین شانۆگەری جیهان بێت. دەبوایە کاتێکی باش بخرایەتە

بەردەستی بەشداران ـ وابزانم 100 ڕۆژێکم بۆ دانابوون. سەد ڕۆژ ماوەیەکی دوورودرێژە، ماوەیەکی باشە. بەدەرلەوەش کاتێک کە دە کەس بەشداری هەمان پرۆژەبکەن لە ماوەی سەد ڕۆژدا، ئەوا ئەو کاتە لەڕاستیدا باس لە هەزار ڕۆژ دەکەین، واتە نزیکەی سێ ساڵ. گەر دە کەس بیانەوێت و مەبەستیان بێت، دەتوانن لەماوەی سەد ڕۆژدا زۆر شتبکەن. مەرجێکی سەرەکیش ئەوە بوو کە دەبوایە بەشداران لەپێشدا فێری ئەوە بن کە هاریکاری یەکتربکەن و بتوانن پێکەوە ئیشبکەن. هەرکاتێکیش کە فیکرەیەکی گرنگیان هەبوایە و بیانویستایە بە مرۆڤایەتی ڕابگەێنن، ئەوا بۆیان هەبوو تەلەفون بۆ دەزگای تەلەفیزۆن بکەن، ئەوساش یان "تێریک ئای" یان "ڕۆڵف کێرکڤۆگ" دەبوایە بەخۆی و کامێرایەکی تەلەفیزۆنیەوە خۆی بگەیاندایەتە خانوە گەورەکە و گوێی بۆ بیرۆکەی بەشداران بگرتایە، زۆر گرنگبوو کە بیرۆکەکەیان گرنگیەکی مەزنی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت. لەو سەردەمەدا باونەبوو بیست سی کامێرای جیاواز بۆ بەرنامەیەکی بەزم و خۆشی بەکاربهێنن، لەڕاستیدا هەموو دەزگای تەلەفیزۆن هێندە کامێرای نەبوو ـ ئەو کاتە هێشتام نەوتمان لە دەریاچەی سەرودا نەدۆزیبێوە. ئەو کاتە کە کەسێک لەبەردەم کامێرادا دەوەستا، باشتربوو گەر بەڕاستی شتێکی پێبوایە. بێگومان هەمووان ئەوەیان نەبوو، بەڵام بەلایەنی کەمەوە وەک لایەنێکی باشی تەماشای ئەوە دەکرا کە شتێکت پێبێت کە بتەوێت بیگەێنیت. ئەو کاتەش کورتە بەرنامەی بێمانا هەبوو و ساڵانەش لەگەڵ قوتابخانەدا سەفەری کۆبنهاگنمان دەکرد، بەڵام بەهیچ شێوەیەک مەزنەی ئەوە نەدەکرا کە کورتە بەرنامەیەکی بێمانا یان سەفەرێکی قوتابخانە بە فیلم بگیرێت کە پتر لە سەد ڕۆژی پێبچێت. ئەو کاتە سەردەمێکی





تربوو، ڕەنگە کەلتورێکی تریش بووبێت، بەڵێ، بگرە لەوانەیە شارستانیەکی تەواو جیاوازیش بووبێت. من ئەم قسانە بۆ ئەوە ناکەم کە بەرگری لە خۆم بکەم، بەڵام زۆر بەئاسانی ئەو کاتە هێندە فەنتاسیم نەبوو کە کەلتوری ئەمڕۆکەی تەلەفیزۆن بهێنمە بەرچاوم. من لەماوەیەکی کەمدا دەفتەرێکی یاداشتم بە بیرۆکەی باشی بەرنامە ڕەشکردەوە. بەڵام بەهیچ شێوەیەک مەزەنەم نەدەکرد کە بەرنامەیەکی نوێی تەلەفیزۆنی لە سەدان سەعاتی ئاوها پێکبهێنرێت کە دەربارەی کۆمەڵێک کچی دەم بەخەندە و کوڕی دەستبازبێت. گومانیشم هەیە کە قەیسەر یان ناپلیۆن هێندە فەنتاسیان هەبووبێت کە توانیبێتیان مەزەنەی قومبەلەی نوێی ئێستاکە و چەکی ئەتۆمی بکەن. هەندێ جار لەوانەیە زیرەکانە بێت گەر چەند داهێنانێک بۆ داهاتوو هەڵبگرین، خۆ چ پێویستدەکات هەموو بیرۆکەکانمان بە یەک جار هەڵبڕێژین.

*

لەکاتی گەنجیشمدا کەسێکی زۆر تەنیابووم. لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەنیشمدا زیاتر وزۆرتر بە تەنیادەبووم، بەڵام من ئەوەم پێخۆشبوو، چونکە چێژم لەو کاتانە دەبینی کە بەتەنها دادەنیشتم و بەقوڵی بیرمدەکردەوە. تەمەنم زیادی کرد و لەگەڵیشیدا زیاتر کەڵکەڵەی دارشتنی ڕووداوی سەرەکی ناو کتێب و فیلم و شانۆ لەسەریدام.
من هەر لەسەردەمی منداڵی و هەرزەکاریمدا هێندە تێبینیم نوسیبووەوە کە بۆ سەدان چیرۆک بەکاربهێنرێت. پڕبوون لە بیرۆکەی سەرەکی جیاوازجیاوازی دارشتنی ڕۆمان و نوسینی تایبەت بۆ شانۆ و





فیلم. هەرگیزیش هەوڵمنەدا کە خۆم نوسراوێکی تەواوەتی بنوسم، وابزانم قەتیش بە خەیاڵمدا نەهات، من بۆم سەختبوو لەناو ئەو هەموو بیرۆکە زۆرەدا یەکێکیان هەڵببژێرم و دەستبکەم بە نوسینی ڕۆمانێک، ئاخر کام دانەیەیانم هەڵببژاردایە؟

من هەمیشە زیادلەڕادە سروشی نوسینی ڕۆمانێکم لەمێشکدابوو. کاتێک کە بیرم لە تێبینی و سەرنجەکانم دەکردەوە، سروشێکی زۆر بەتینم بۆ دەهات و پەیتا پەیتا بیرۆکەی نوێ دەهاتە مێشکمەوە و زنجیرەی بیرکردنەوەمی دەپچڕاند، زۆربەی جارەکانیش بیرۆکە تازەکانم زۆر باشترێک بوون لەو بیرۆکانەی کە لە بنەڕەتدا دەمویست بیریان لێبکەمەوە. ڕۆمان نوس توانایەکی تایبەتی هەیە و دەتوانێت بۆ ماوەیەکی دورودرێژ سەرنجی بخاتە سەر یەک چیرۆکی خەیاڵی، زۆرجاریش بۆ ماوەی چەند ساڵێک هەر بەردەوام بیر لەو چیرۆکە خەیاڵیە دەکاتەوە. من ئەوەم وەک شتێکی زۆر لاواز دەبینی، بەلامەوە خەیاڵێکی زۆری دەبرد و توشی خەیاڵ پڵاوی دەکردم.

تەنانەت ئەگەر ئەو توانایەشم هەبوایە کە بۆ ماوەیەکی هێندە دورودرێژ مێشکم هێمن و ئارام ڕاگرتایە کە بمتوانییایە ڕۆمانێک بنوسم، ئەو کاتەش هەر نەمدەکرد. هەر ئەوەندەی کە بیرۆکەیەکم لە دەفتەری تێبینیەکانمدا یان لە یاداشتەکەمدا جێگایەکی داگیردەکرد، ئیدی هەستم نەدەکرد هاندەرێکی وام هەبێت کە ڕۆمانێک بنوسم. من هەمیشە ئەوەم بەلاوە گرنگ بوو کە زۆرترین بیرۆکە کۆبکەمەوە و جیایان بکەمەوە، دواتر ناوی کورتە و پوختەی کارە هونەریەکانم لەو بیرۆکانە دەنا. ڕەنگە وەک ڕاوکەرێک بەراوردبکرێم کە زۆر حەزی لە ڕاوکردنی ئەو ئاژەڵانە هەبێت کە دەگمەنن، بەڵام پێویستی بەوە نیە کە بەشداری کەوڵکردن و ئامادەکردن و خواردنی گۆشتەکەیان بێت،





تەنها لەبەرئەوەی کە ڕاوی کردوون. خۆ دەشێت ڕاوکەرێک بێت کە گۆشتخۆر نەبێت. هیچ ناتەباییەک لەوەدا نیە کە ڕاوکەرێکی دەستڕاست بیت و لە هەمان کاتیشدا کەسێکی گۆشت نەخۆربیت، هەر بۆ نمونە بەهۆی پارێزکردنەوە. چەندەها ماسیگریش هەیە کە بۆ ئارەزوو و وەک وەرزشێک ماسی دەگرن بەبێ ئەوەی حەزیان لە ماسی بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەچەندەها کاتژمێر ڕادەوەستن و قولاپەکانیان هەڵدەدەنە ناو ئاوەکانەوە. ئەو کەسانە ئەگەر ماسیەکی گەورە بگرن، ئەوا یەکسەر دەیبەخشنە ناسیاوێک یان دەیدەنە کەسێک کە بەڕێکەوت بەو ناوەدا تێپەڕدەبێت. ماسیگری لەو جۆرە زۆرن و هەرە باشەکانیان زیاتریش دەڕۆن؛ ئەوان قولاپەکانیان هەڵدەدەن و ماسی دەگرن، دواتریش ماسیەکان دەخەنەوە ناو ئاوەکە. خۆشبەختانە بۆ ماوەی ڕۆژێکی دورودرێژ لەبەرئەوە ماسی ناگرن کە یەک دوو کرۆنێک لە مەسرەفی ماڵەوەیان کەمبکەنەوە. ئەو بیرۆکە ڕەوشتبەرزەی کە لە پشت ئەم جۆرە وەرزشی "گرتن و ئازادکردن"ی ماسیەوە هەیە، ئەوەیە کە بەهای شتە گیراوەکە بە هیچ جۆرێک حسابی بۆناکرێت، هیچ جۆرە حسابێک بۆ سودوەرگرتن لەو کارە ناکرێت. خەڵکی بۆیە ماسی دەگرن، چونکە نەشئەیەکی خۆشیان پێدەبەخشێت. ماسیگرتن وەک یاریەکی پڕ لەفێڵبازی دەکرێت و هیچی تر، وەک هونەرێکی پڕڕەوشت بەجێدەهێنرێت و تەواو. ئەم "پارالێڵ"ە "ئارنەست یونگەر"م بیردەخاتەوە کە کاتی خۆی لە یەکێک لە یاداشتە جەنگیەکانیدا نوسیبووی؛ "پێویست ناکات خەفەت بۆ بیرۆکەیەک بخۆین کە لە دەستمان دەچێت، چونکە وەک ئەوە وایە ماسیەک لە قولاپەکەمانەوە خۆی ڕاتەکێنێت و بچێتەوە ناو قوڵایی ئاوەکە، بەڵام ڕۆژێک دادێت کە قەڵەوتر دەبێت و دەگەڕێتەوە لامان.





بەڵام ئەگەر لەبەرامبەردا ماسیەکە بگرین و پاکی بکەینەوە و بیخەینە ناو سەتڵەکەمانەوە، ئەوا بێگومان ڕێگە لە گەشەگرتنی دەگرین". کتومت هەمات شتیش بەسەر بیرۆکەی ڕۆمانێکدا دەچەسپێت، چونکە یەک کەڕەت دەنوسرێتەوە و بەشێوەیەکی کەم تازۆر ڕێک و پێک دادەڕێژرێت، وە ئەگەر بەختیش یاری بێت ئەوا بڵاودەبێتەوە. لەوانەیە ژیانی کەلتوری "گرتن"ی زۆر و "ئازادکردن"ی کەمی پێوەدیاربێت.

بەدەر لەوە هۆیەکی تریش ڕێگەی گرتبووم و نەیدەهێشت من ڕۆمانێک یان هەروەک دەڵێن "شتێک بنوسم". نوسین بەلای منەوە شتێکی پڕ ساختەکاری بوو. هەر لەو کاتەوەی کە هەرزەکاربووم لەوە دەترسام کە کەسێکی ساختەم (موزەیەف) لێدەربچێت، هێندەی ئەوەش لەوە دەترسام کە باوکم شتێک لە تونێلی خۆشەویستیەکەی کۆبنهاگندا بڵێت و توشی شەرمبکات و ناچاربم بەشێوەیەکی دەستکردانە وەڵامی بدەمەوە. تەنها شتیش کە ڕقم لێی بوو، ئەو کاتانەبوو کە دەستیان بەسەر ڕومەت و قژمدا دەهێنا، چونکە بەلای منەوە سروشتی نەبوو و کە بەو شێوەیە لێم نزیک دەبوونەوە نەمدەزانی لەبەرامبەردا بە چ شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەم.
من مەبەستم لەوە نیە بڵێم لەخۆباییبوون خاسیەتێکی خراپ بێت، بەپێچەوانەوە من کەسێکم خۆشدەوێت کەخۆی دەربخات. خەڵکانێک کە بەشێوەیەکی دەستکردانە ڕەفتاردەکەن، هەمیشە زیاد لەڕادە دڵیان خۆشکردووم. من ئەو کەسانەم بەلاوە مەبەستە کە لەخۆیان باییبوون، بەڵام بەلای منەوە وردبوونەوە لەو کەسانەی کە بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆیان خۆشدەوێت یان بەشێوەیەکی ناسروشتی





هەڵسوکەوت دەکەن، زۆر خۆشترە لە تێڕوانینی ئەو کەسانەی کە کەمێک گرنگی بە خۆیان دەدەن. ئەو کاتانەی کە کۆمەڵێک خەڵک لەشوێنێکی دیاریکراودا پێکەوە کۆدەبنەوە، یەکسەر دەتوانم ئاماژە بۆ ئەو کەسانە بکەم کە زیاتر خۆیان دەردەخەن. زۆر بەئاسانی دەبینرێن، هەروەک ئەوە وایە تاوسێک ببینیت کە کلکی کردبێتەوە. من زیاتر چێژ لە دوانی ئەو کەسانەدا دەبینم کە کەمێک فشەکەرن، و کەمتر تامەزرۆی قسەکەردنی ئاساییم لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە وشکن و کەم تازۆر تەنها گرنگیەکی بەئەدەبانە بۆ خەڵکانی تر دادەنێن. خەڵکانێک کە پێیان خۆشە خۆیان دەرخەن هەمیشە تائەوپەڕی ڕادە هەوڵدەدەن کە خۆشمەزە و قۆشمەبن. ئەو کەسانە تەمبەڵ نین. زۆرجار ئەوانەن کە ئاهەنگە گەورەکان دادەمەزرێنن.
جێگەی داخە کە من خۆم هەرگیز کەسێک نەبووم کە پێم خۆشبووبێت خۆم دەربخەم. بێگومان ئەوەش بەلای چواردەورەکەمەوە شتێکی ناخۆشبووە، بەڵام من ناچاربووم خۆمی پێڕابێنم و ڕازیبم پێی. هەرگیز ڕێگەم بە خۆم نەداوە کە ئاهەنگێک بکەمەوە. هەڵبەتە شێوە ژیانێکی ئاوها پیسکەییەکی مەزنی پێوە دیارە، خۆشم دڵنیام لەوە، بەڵام من قەت پێم خۆشنەبووە کە لەسەر دەستوری خەڵکانی تر بڕۆم. من ناڵێم کە کەسێکی زیرەک نیم، بەڵام ئەوەشم پێ قبووڵ ناکرێت کە کەسێکی تر بێت و پێم بڵێت "تۆ زیرەکیت".
مەبەستم لەوەیە هەرگیزاو هەرگیز نەمدەتوانی لەڕێگەی شتێکی وەک نوسینەوە هێندە خۆمدەربخەم و دواتر چاپی بکەم و نۆڤێلێک یان ڕۆمانێکی کاتی پێشکەشبکەم. بەلامەوە وەک ئەوە وابوو کە ناچاربم بچمە سەر بەرزاییەکی بچکۆلە بۆئەوەی چەپڵەم بۆ لێبدەن و سەری ڕێزم بۆ دانەوێنن. جگە لەوەش نوسینی ڕۆمان بۆتە شتێکی هەر زۆر





ئاسایی. ئەو کەسانەی کە ساویلکە و خۆشباوەڕن ڕۆمان دەنوسن. خوێندنەوەی ڕۆمان شتێکی ئاساییە، بەڵام ڕۆژێک دادێت کە نوسینی ڕۆمان هێندەی خوێندنەوەی ئێستاکێی ڕۆمان ئاسایی ببێت.

من ئەو کاتەی فیلمی "گلۆپەکانی شار"م لەگەڵ دایکمدا بینی، بۆمدەرکەوت کە ژیان چەندە کورتە. هێندە تێگەیشتم کە پاش ماوەیەکی یەکجار کەم دەمرم، لە سەرتاپای ژیاندا ونەدەبم. من بەپێچەوانەی ئەو کەسانەوە کە خۆیان دەردەخەن، ئەو توانایەم هەبوو کە زۆر بە قوڵی بیر لە ئاکامەکانی ئەو بیرۆکەیە بکەمەوە. من بەئاسانی دەمتوانی زۆر زۆر لە دوای مردنی خۆم شانۆیەک یان هۆڵێکی سینەمای پڕ لە خەڵک بهێنمە بەرچاوم. هەموو کەسێک ئەو شێوە بیرکردنەوەیەی پێ قبوڵ ناکرێت. خەڵکانێکی زۆر بەشێوەیەک پەیوەستی چیژە هەستیەکانیانن کە ناتوانن هێندە تێبگەن کە جیهانێک بوونی هەیە. هەر لەبەرئەوەش لە توانایاندا نیە کە لە پێچەوانەکەشی تێبگەن؛ هێندە نابینن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم ژیانە کۆتایی پێدێت. بەڵام لەڕاستیدا چەند تریپەیەکی کەمی دڵ دەتوانێت بۆ هەتاهەتایە لە هەموو مرۆڤایەتیمان جودابکاتەوە.

من هەرگیز هەوڵم نەداوە بەشێوەیەکی دەستکرد سروشتی خۆم جوانبکەم و خۆم نیشانی خەڵکانی تر بدەم، هیچ کاتێکیش لەبەردەم ئاوێنەیەکدا دانەدەنیشتم بۆ ئەوەی خۆم برازێنمەوە. من بەسەردانێکی بچکۆلانە هاتومەتە ناو ئەم جیهانەوە. بەشێوەیەکی تایبەتیش هەر بەهۆی بنەمای ئەم تێڕوانینەوەبوو کە پێمخۆشبوو چاوم بەو کەسانە بکەوێت کە حەزدەکەن خۆیان دەربخەن.

دەکرێت قسەکردن لەگەڵ منداڵاندا یان تەماشاکردنی کۆمیدیایەکی "هۆلبێرگ" یان "مۆلیێ" جۆرە هێمنیەک بە مێشک ببەخشن. بەهەمان





شێوەش بینینی ئەو کەسانەی کە خۆیان دەردەخەن مایەی خۆشحاڵیەکی گەورەبوو بۆم، چونکە ئەوانیش هەروەک منداڵ ساویلکەن، منیش ڕاست و دروست بەخێلیم بەو ساویلکەییەیان دەبرد. بەشێوەیەک دەژین وەک ئەوەی سودیێکیان هەبێت، بەجۆرێک ژیان بەسەردەبەن وەک ئەوەی شتێکیان لەکیس بچێت. بەڵام ئێمە لە گەرد زیاتر هیچ شتێکی تر نین. لەبەرئەوە هیچ پێویست ناکات بەشێوەیەکی ناسروشتیانە هەڵسوکەوتبکەین و خۆمان بنوێنین. یان هەروەکو چۆن "میفیستۆفیلس" لەو کاتەدا کە "فاوست" دەمرێت دەڵێ؛ "ئەگەر لە هەموو بارێکدا ئافەریدەکراو بەرەو عەدەم بچێت، کەواتە نرخی ئافەریدەی هەتاهەتایی دەبێت چی بێت!؟"

*

دایکم لە ساڵی 1970دا کۆچی دوایی کرد. ڕێک پێش جەژنی لەدایک بوونی مەسیح بوو، من ئەو کاتە لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم. نەخۆشیەکەی لە پڕێکدا لێیدا و ماوەی کەوتنیشی هێندەی نەخایاند. لەپێشدا بۆ ماوەی مانگێک لە ماڵەوە کەوت و چارەسەری وەردەگرت، دواتریش چەند حەفتەیەکی کەم لە خەستەخانە بۆی کەوت.

لەماوەی ئەو چەند حەفتەیەی بەر لەمردنی، دایک و باوکم بەتەواوەتی ئاشتبووبوونەوە، لەڕاستیدا هەر پێش ئەوەی لە خەستەخانەش بیخەن. باوکم وتی "من ژیانی دایکتم تێکدا" و دایکیشم کتومت هەمان شتی دەربارەی باوکم پێوتم. ئەو وتی "من ژیانی باوکتم وێرانکرد". ئا بەو شێوەیە هەتا مرد خەریکی لۆمە و زەمکردن بوون. تەنها ئەوەندەبوو لەو کاتەدا بەهیچ شێوەیەک



یەکتریان تاوانبار نەدەکرد، بەڵکو ڕاستەوڕاست سەرزەنشتی خۆیان دەکرد. بەلای منیشەوە گەر لۆمەی یەکتریان بکردایە یان هی خۆیان، هیچ گرنگیەکی نەبوو.

ناشتنەکەشی بەرێک و پێکی بەڕێوەچوو. باوکم وتەیەکی دوورودرێژی خوێندەوە و تێیدا باسی گەورەیی دایکمی کرد وەک مرۆڤێک. لەژیانی هاوبەشی هەردووکیانیشدا هاتە سەر باسکردنی شتێک کە ناوی نابوو "گوناحە گەورەکە". پاشانیش وتی "لەو ماوەیەی دواتردا توانیمان سەرلەنوێ یەکتری بدۆزینەوە و لە هەموو ناتەواویەکی یەکتری ببورین". بەو شێوەیەش لەدواجاردا ئەو پەیمانەیان بردە سەر کە کاتی خۆی لەبەردەم قەشەکەدا بەیەکیان دابوو. ڕۆژانێکی خۆش و ڕۆژانێکی تاڵیان پێکەوە بەسەربردبوو، بەڵام بەڕاستی تائەو کاتەی مردن لەیەکتری جوداکردنەوە، یەکتریان خۆشویست.

وتەکانی باوکم ڕاستی پێوە دیاربوو و دووربوو لە درۆ و دەلەسەوە، بەڕاستی ئەو چەند حەفتەیەی بەرلەوەی دایکم بمرێت، خۆشی دەویست. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەبڕوای من درەنگبوو بۆ ئەو خۆشەویستیە و وای بۆ دەچووم کە ئەو چەند حەفتەیەی کۆتایی هەروەکو جارانی دووربوایە لێوەی باشترێکبوو. ئەو کاتەش لەوانەیە ڕێک لە دوای مردنی زیاتری خۆشبویستایە. ئەو کاتە تەنها بەو شێوەیە نەدەبینرا کە سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت.

وادانرابوو کە منیش چەند وشەیەک لەلای تابوتەکەی دایکمەوە بڵێم، بەڵام نەمتوانی. ماتەمینیەکی قوڵ گرتبوومی. من مردنی دایکمم زیاتر پێناخۆشبوو وەک لە باوکم، هەر لەبەرئەوەش بوو کە زمانم کلیلبووبوو و نەمتوانی هیچ شتێک بڵێم. من یەکجار دڵم تەنگبوو و قسەم پێنەبوو، دەنا ئەگەر مردنی دایکمم زۆر پێناخۆش نەبوایە، ئەوا





بێگومان وتارێکی کاریگەرم هەڵدەڕشت. مەزەندەم نەدەکرد کە مردنی هێندە کارم تێبکات. هەر ئەوەندەم توانی لەسەر کورسی کڵێساکە بەرزببمەوە و چەپکێک گوڵی "لەیادم مەکە"[16] لەسەر تابوتەکەی دانێم. سەرێکم بۆ باوکم و قەشەکە دانەواند و ئەوانیش هەمان شێوە سەریان بۆ لەقاندمەوە. لەو کاتەشدا کە گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم، هەمان ئەو پیاوە بچکۆلەیەم بینیەوە کە کڵاوە سەوزە لبادەکەی لەسەردابوو. بەناوەڕاستی کڵێسەکەدا هاتوچۆی دەکرد، بەپەستیەوە دار گۆچانە حەیزەرانە باریکەکەی بەملاولادا بادەدا.

ئەو کاتە من هەژدە ساڵم پڕکردبووەوە و باوکم پێی وابوو لەدوای مردنی دایکمەوە لە ئاپارتمانەکەیدا بمێنمەوە و لەوێدا ژیانم بەسەرببەرم. لەدوای ئەو کاتەوەش هێشتام هەر حەفتەی کەڕەتێک یەکتریمان دەبینی. بەڵام لە پایزی ئەو ساڵەدا هەردووکمان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین کە مانگی یەک کەڕەت یەکتر ببینین. لەوە دەرچووبووین کە بچینە تەماشاکردنی خلیسکێنە و خۆهەڵدانی سەربەفر و ئەو جۆرە شتانە. هیچ کەڕەتێکی تریش نەڕۆیشتینەوە بۆ ناو "تونێلی خۆشەویستی"یەکەی کۆبنهاگن. باوکم لەسەرو تەمەنی هەشتا ساڵیەوە مرد.

---

[16] لەو بۆنانەدا گوڵێکی تایبەت دادەنێن کە ناوی 'لەیادم مەکە'یە، هەڵبەتە ئەو ناوە لە زۆرینەی زمانەکاندا ڕاستەوخۆ لە وەرگێڕانی ناوە لاتینیەکەیەوە وەرگیراوە "Myosotis scorpiodes"، گوڵێکە گەڵایەکی دوو لقی بچکۆلە و گوڵی شینی زۆر بچکۆلە دەگرێت و ناوەڕاستەکەی زەردە.

بیرمدێت لەدوای مردنی دایکمەوە لەدڵی خۆمدا دەموت؛ "ئێستاکە چیتر دایکم نامبینێت، ئەی کەواتە چ کەسێک تەماشام بکات؟

## ماریا

دایکم لەیادنەکرد و هەرگیزیش لەناو یادەوەریەکانمدا دەرناچێت، بەڵام لەلایەکی ترەوە پێمخۆشبوو کە بەتەنها لە خانووەکەدا بمێنمەوە. کەم کەس هەبوو کە هاوتەمەنی من بێت و خانوی خۆی هەبێت.

بۆ ماوەیەکی کەم هیچ کەسێکم شک نەدەبرد کە لەگەڵیدا بڕۆم بۆ سینەما و شانۆ، ئەوەش مایەی دڵتەنگیبوو بۆم، بەڵام هێندەی نەبرد و کەوتمە بانگکردنی کچان. من شەرمم لەو جۆرە شتانە نەدەکرد، بەبێ هیچ گرفتێک هەر لە حەوشەی قوتابخانەدا ڕوم لە کچێکی نەناسیاو دەکرد و دەموت "حەز دەکەیت پێکەوە بڕۆین بۆ سینەما، یان بۆ شانۆگەریەک؟". هەندێ جار لە پاسەکاندا بە کچێکم دەوت، یان لە بازاڕەکاندا، یان لەناوشاردا ڕووم لە کچێک دەنا. من نەمدەویست بە کچەکانی پۆلەکەم بڵێم و زیاتر پێمخۆشبوو ئەو کچانە بانگبکەم کە نەمدەناسین. گەر کچێکی پۆلەکەمانم بانگبکردایە، ئەوا زۆر بەئاسانی بەهەڵە لێم تێدەگەیشت، منیش بەلامەوە گرنگبوو کە هەموو ئێوارەکە پێکەوە بەرینەسەر. ڕاستە من ئەو کچەم نەدەناسی کە بانگم دەکرد، بەڵام هەمیشە ڕوخساری دەرەوەی شتێکی کەمی پێدەوتم، تاڕادەیەک لەڕێگەی ڕواڵەتیەوە دەمزانی چ کەسێکە و دەشمتوانی مەزەنەی تەمەنی بکەم.







من زۆر بەئاسانی لەگەڵ کچاندا دەکەوتمە قسەکردن و زۆر کەمیش ڕوویدەدا کە ڕەتمبکەنەوە. لەپێشاندا پێم پێدەکەنین، بەڵام پاش ئەوەی مەرامی خۆمم بۆ ڕوندەکردنەوە، چیتر بەلایەنەوە سەیرنەبوو کە بانگهێشی شانۆیەک یان فیلمێکم دەکردن، هەرچەندە کە هەرگیز لەوەوپێشیش یەکتریمان نەبینیبوو. من بەشێوەیەکی تایبەتی بانگهێشم دەکردن، هەستیاندەکرد کە کەسانێکی هەڵبژێردراون، لەڕاستیشدا هەروابوو، چونکە من داوام لە هەموو ئافرەتێک نەدەکرد کە دەمبینی.

کچەکان زۆر دڵشادبوون بەوەی کە من خانوی خۆمم هەبوو. یەک لەدوای یەک لەگەڵمدا بۆ خواردنی پەنیر و خواردنەوەی شەراب دەهاتنەوە، یان بۆ خواردنەوەی بیرە و خواردنی هێلکەی شڵەقاو و سورەوەکراو. هەندێ جار شەویش لەلام دەمانەوە، بەڵام زۆر بەدەگمەن ڕێدەکەوت کە هەمان کچ دوو کەڕەت بێتە ماڵەکەمەوە. ئەگەر بمهێشتایە چەند جارێک بهاتایەتە لام، ئەوا دواتر لەوانەیە تووشی جۆرە نیگەرانی ببوایە گەر پێمبوتایە "نامەوێت هێندە زوو زوو بتبینم". تاوناتاوێک هەندێک هیوا و چاوەڕوانی لەلای کچەکان دروستدەبوو، بەڵام من نەمدەتوانی بۆیان بهێنمەدی، ئیتر ناچاردەبووم لەڕێگەی گفتوگۆوە بۆیان ڕونبکەمەوە. زۆر بەئاسانی دەمتوانی نەهێڵم تووشی ئەو حاڵەتە بم، بەڵام من هەمیشە دەمتوانی بەشێوەیەکی ڕون و ڕەوان بیروڕای خۆم دەربڕم.

هیچ کچێکیش لەسەرئەوە لێم زویر نەدەبوو کە تەنها بۆ یەک شانۆگەری بانگم دەکرد، یان بۆ یەک ئێوارە دەمویست لەلام بێت، یان کە ڕێگەم پێدەدا تەنها یەک شەو لەلام بمێنێتەوە. من ئەو کاتانە تووشی گرفتدەبووم کە ڕێگەم بە کچێکدەدا پێنج شەش جار بێتە لام.





من ئەو حاڵەتەم وەک پارادۆکسێک دەبینی. بەشێوەیەکی گشتی ئەو کچەی کە تەنها یەک شەو لەلام دەمایەوە، زۆر دڵی بەو ئێوارەیە خۆشدەبوو کە پێکەوە دەمانبردە سەر. کاتێکیش دەڕۆشتە دەرەوە، نەدەچوو بەچەپ و ڕاستدا بکەوێتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ئەو شەوە، چونکە زۆرینەیان شەرمیان لەوە دەکرد کە تەنها یەک شەو لەلای کەسێکی نەناسیاو بمێننەوە. بەڵام هەرئەوەندەی کە چەند جارێکی زۆر بەشەو لەلام بمانایەتەوە، ئیدی دەکەوتنە گلەیی و دادوبێداد. ئینجا بۆ کچی برادەرەکانیان دەگێڕایەوە و هەرزۆر بەئاسانیش چاوەڕوانی پەیوەندیەکی درێژ خایەنیان دەکرد.
من هەرگیز کچەکانم هەڵنەدەخڵەتاند. هەتا نەڕۆیشتینایە بۆ سینەما یان بۆ شانۆگەریەک، قەت پەیمانم نەدەدانێ کە نانێک پێکەوە بخۆین، هەتا نانی ئێوارەمان نەخواردایە، پەیمانم نەدەدانی کە شەو لەلام بمێننەوە، هەرگیزیش ئەو پەیمانەم نەدەدانێ کە چەند جارێکی تر بێنەوە لام. من بەدڵێکی فراوانەوە درووود و ستایشی کچەکانم دەکرد، چونکە بەڕاستی پێمخۆشبوو کە دەهاتنە لام، بەڵام هەرگیز واخۆم پیشان نەدەدان کە حەزبکەم یان بەشێوەیەک لەشێوەکان لەتوانامدا بێت کە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵیاندا بمێنمەوە. ڕێدەکەوت خاولیەک یان فڵچەیەکی دان بدەم بەکچێک کە بۆ یەکجار بەکاری بهێنێت، یەک کەڕەتیش ڕێگەم بەکچێکدا ڕۆبە یابانیە کۆنەکەی دایکم لەبەرکات، ئا لەو کاتانەدا جارجارێک هەر بۆئەوەی زۆر بەتەواوەتی و ڕونی تێیانبگەیەنم، جەختم لەسەر شتێک دەکردەوە و پێم دەوتن "ڕاستە پێمخۆشە کە تۆ شەو لەلام دەمێنیتەوە، بەڵام بەپێویستی نازانم خەیاڵت بۆ هیچ شتێکی تر بچێت، مەبەستم لەوەیە تەنها وەک شەوێکی خۆش بیبینە و تەواو". ئەگەر هەر زۆر دڵیشم بە





کچێک خۆشبوایە و لە هەموو ئەو کچانەی پێشوتر زیاترێک دڵم پیابدا بچوایە، ئەو کاتە وەک ئەرکێکی گەورەی سەرشانم هەستمدەکرد دەبێت زۆر بەڕوونی پێی بڵێم کە هیچ نیەتێک و مەرامێکم نیە کە تێکەڵبم لەگەڵیدا و ببمە دەستگیرانی. دەمبینی ئەو قسانەم گاریگەری تێدەکردن، بەڵام هیچ یەکێکیان لەبەر ئەو هۆیە دەرنەپەڕیە دەرەوە. بەپێچەوانەوە لەوەدەچوو کە قسەی ڕاستەوخۆ و ڕوون وایان لێبکات زیاتر حەز لەوەبکەن کە شەو لەلام بمێننەوە. زۆربەی جار ئەو شتانە زیاتر سەرنجمان ڕادەکێشێت کە چاوەڕوان نین دوبارە ببنەوە، وەک لەو شتانەی کە پێمانوایە بۆ هەتاهەتایە دوبارە و سێبارە دەبنەوە.

مایەی خۆشبەختیم بوو کە ئەو هەموو کچە هەمەڕەنگە دەهاتنە میوانیم، چونکە هەریەکەیان سەرنجی دەچووە سەر شتێکی جیاوازی ماڵەکەم. هەندێکیان دەچوونە لای کتێبخانەکەوە و ئەو کتێبانەیان ڕادەکێشا کە مەبەستیانبوو. کچێکیان ناوی "ئیرینا"بوو، ڕێک بۆی دانیشت و کتێبی "جیهانی هونەر"ی خوێندەوە، "ڕاندی"یش بەدەنگی بەرز دەستیکرد بە خوێندنەوەی کتێبەکەی "کارڵ ئیڤانگ" کە دەربارەی زانیاری سێکسی بوو. من کە منداڵبووم ئەو کتێبەم خوێندبۆوە بەڵام چیتر باوی نەمابوو لەلام. یەکێک لە کچەکانی تریش یەکسەر لەسەر پیانۆ سەوزەکە دانیشت و بەزەحمەت پارچەیەک مۆسیقای "شۆپان"ی ژەنی ـ وابزانم ئەو کچەیانبوو کە ناوی "ڕانڤی"بوو ـ "توريد"یش بەبەکارهێنانی چەند ئاوازێکی سادە چەندین گۆرانی فلیمی مۆسیقی "Hair" لێدەدا. زیاتر لە نیوەی هەموو ئەو کچانەی کە دەهاتنە ژورەوە یەکسەر قەوانێکیان لێدەدا. من





قەوانی "جۆن بەیز" و "جەینز جۆپلین" و "سیمۆن و گارفۆنکڵ و پیتەر" و "پۆڵ و ماری"م هەبوو. کچێکی چاو شین و قژ زەرد بەدڵ و بەگیان دەیویست گوێ لە "کاریۆس" و "باکتۆس"یش بگرێت، بەڵام هەتاوەکو ئەو کاتەی لە کۆتایی مانگی پێنجدا "هێگە"م بینیەوە، هیچ کچێک حەزی لە "چایکۆفسکی" و "پۆتشینی" نەبوو.
"هێگە" بەشی مۆسیقای تەواوکردبوو، پاش ئەوەی لە سینەما فیلمی "هەڵسەنگاندنی ئازایەتی"مان بینی و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، یەک و دوو خۆی گەیاندە پیانۆکە و هەموو کۆنسێرتی پیانۆی "ڕەخمانینۆف"ی ژمارە 2ی پەیژەی مۆسیقی سەرەکی "c" لێدا. کۆنسێرتەکەی پتر لە نیو کاتژمێری خایاند، وە هەر ئەو کاتەی کە کەمێک چووە ناو بەشە خاوەکەی کۆنسێرتەکەوە، بەتەواوەتی لەو بڕوایەدابووم کە خۆشم دەوێت، بەڵام هەر کە گەیشتە ڕیتمە خێراکەی کۆتایی کۆنسێرتەکە، هێندە تێگەیشتم کە بە پلەی یەکەم سەرسامی پیانۆژەنەکە نەبووبووم بەڵکو مۆسیقاکە فریویدابووم. دواتریش کە چووینە ژووری خەوەوە، بەسەرهاتی دزینی فیاتە سورەکە و ڕۆمانسی ناو کوخە دارینەکەم هێنایەوە یاد کە ئامێریان تێدا دەپاراست، ئەویش دایە قاقای پێکەنین و خەریکبوو هەناسەی سواربێت. بەڵام ئیدی گەورەبووبوین و لەسەردەمی قوتابخانەی ناوەندیەوە یەکتریمان نەبینیبوو.
"هێگە" بۆ ماوەی سێ ڕۆژی ڕێک لەگەڵمدا مایەوە، بەڵام کە لە چوارهەمین ڕۆژدا بەتەواوەتی بۆی دەرکەوت کە ناتوانین ببینە دەستگیرانی ڕاستەقینەی یەکتری، بەجێی هێشتم و لەو کاتەشەوە هیچ هەواڵێکیم نەبیستەوە. بێگومان من لەوە تێدەگەیشتم. ئێمە هەر





لەسەردەمی منداڵیمانەوە یەکتریمان دەناسی، واتە تاڕادەیەک چیتر نەماندەتوانی تەنها لەبەرخاتری یاری، یاری گەورانە پێکەوە بکەین. وابزانم پیاوە یەک مەتریەکەش وەک من دەیڕوانی. چونکە لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا کە "هێگە" لەلام مایەوە زیاترێک پەستی پێوە دیاربوو وەک لە ڕۆژانی ئاسایی. لە ژوری دانیشتن و چێشتخانەکەدا هەڵدەبەزیەوە و ڕێک لەبەرچاوی "هێگە"دا گۆچانە حەیزەرانەکەی بادەدا. سەیربوو بەلامەوە کە "هێگە" نەیدەتوانی ببینێت.

زۆربەی کچەکان پێیان خۆشبوو بچنە باڵکۆنەکەوە. دایکم هەمیشە خزمەتی گوڵەکانی باڵکۆنەکەی دەکرد و دەیڕازاندەوە، منیش دڵم نەدەهات لەگەڵ یەکەمین بەهاردا لەدوای مردنی دایکمەوە پشتگوێیان بخەم. لەبەرئەوە لەپێشدا هەموو گوڵە وشکەکانی پارم هەڵکەند، ئینجا تا ئینجانەکان بیگرێت خۆڵی نوێم تێکردن و پڕمکردن لە پیاز. ئەنجامەکەشی لەڕادەبەدەر جوانبوو، لەوەوپێش ئینجانەکان هەرگیز ئاوها لێپاولیپ نەبوون لە گوڵە سەوسەن و گوڵی لالە و گوڵە زەعفەران، زۆربەی کچەکان سەرسامی کارەکەمبوون و پێیانوابوو دەستێکی کارامەم لەبواری گوڵ و سەوزیدا هەبێت. ئەگەر ئاوهەوا خۆشبوایە، ئەوا لە باڵکۆنەکە دادەنیشتین و پەرداخێک "مارتینی" یان "دووبۆنێت"مان دەخواردەوە و تەماشای شارمان دەکرد.
بێگومان ناچاربووم بە کچەکان بڵێم بۆچی من بەتەنها لەو خانوەدا دەژیام، هەر بەو بۆنەیەشەوە دۆلابی جلەکانی دایکمم پیشانی هەندێکیان دەدا. زۆربوون ئەوانەی دڵیان دەچوو بەکراسێکدا، هەندێکیشیان حەزیان لە چاکەتێک یان پاڵتۆیەک بوو، منیش پێم دەبەخشین. هەڵبەتە لەپێشدا ناچاربوون لەبەری بکەن، بۆئەوەی





بزانن بەبەریان دەبێت یان نا، هەموو کەڕەتێکیش تاقیکردنەوەی جلەکان وەک نمایشێکی بچکۆلەی جلی مۆدە وابوو. هەندێ جاریش لەکاتی چوونە دەرەوەیاندا هەربۆ خۆشی بەشێوەیەکی جادووئاسا جوتێ دەستکێش یان شاڵێک یان جانتایەکی جوانی شانۆم دەخستە بەردەمیان. من ئەو کچەم زۆر بەدڵبوو کە چاکەتە فەرووە فارسیەکەم پێبەخشی. ناوی "چێغیسا"بوو، لەو کاتەدا کە فەرووەکەم بۆ قەدکرد و خستمە ناو زەرفێکی کاغەزی گەورەوە، فرمێسک بە هەردوو چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە، بەڵام وابزانم لەڕاستیدا دیاریەکەم نەیهەژاند. وابزانم پێیوابوو کە من بۆیە ئەو چاکەتە فەرووەی پێدەبەخشم، چونکە دەمەوێت ببێتە دەستگیرانم، یان بەلایەنی کەمەوە وەک دەربڕینێکی قوڵی خۆشەویستی دەیبینی بە هەموو ماناکانیەوە، هەر لەبەرئەوەش خێرا ناچاربووم دیسانەوە مەبەستی تەواوەتی خۆمی بۆ ڕونبکەمەوە. لەلایەکی تریشەوە بەباوکمم وت هەموو جلەکانی دایکمم بەیەکێک لە ڕێکخراوە خێرخوازەکان بەخشی، ئەویش هیچ لاریەکی لەوە نەبوو _وابزانم چاکەتە فەرووەکەی لەیادکردبوو. بەڵام لەڕاستیدا زۆربەی هەرەزۆری جلەکانم بە کچ بەخشی، هەندێ لەو کچانەش یارمەتیان دام و ئەو جل وبەرگانەیان بۆ جیاکردمەوە کە بۆ فرێیان باشبوون. پاش شەش مانگێک هیچ جلێکی دایکم لەماڵەکەدا نەمایەوە.

یەک دوو کەڕەتێک لەدەرەوەدا بەرەوڕوی کچێک لەو کچانە بوومەوە کە شەوێک لەلام مابوونەوە و خۆیان لێ هەڵەئەکردم، بەڵام ئۆسلۆ پڕبوو لە کچ، لەبەرئەوە هیچ گرفتێکم لە دۆزینەوەی کچێکی نوێدا نەبوو. بەشێوەیەکی گشتی لەسەرەتای ساڵەکانی حەفتادا باونەبوو کە کچێک شەو لەلات بمێنێتەوە. بیرمدێت ئەو کاتە لە دڵی خۆمدا





دەموت "من لەسەردەمێکی باشدا لەدایکبووم". هەر بۆ نمونە بیست ساڵێک پێش ئەو سەردەمە، پیاوێکی هاوتەمەنی من بۆی نەدەلوا هێندە خۆشی لەوە ببینێت کە لە خانویەکی سەربەخۆدا دەژی.

من هەرپێش ئەوەی قۆناغی ئامادەیی تەواوبکەم، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کچانی شاردا تێکەڵ بووبووم، بەڵام هێشتام نەکەوتبوومە عەشقەوە. هەستمدەکرد بەتەمەنتربم، من خۆم پێموابوو کە پێگەیشتووتربم لەو کچانەی کە لەگەڵیاندابووم. هەڵبەتە لەوێدا جۆرە دوالیزمێک بەئاشکرا دەبینرا؛ بەهیچ جۆرێک وەکو جەستە هەستم نەدەکرد کە لەوان گەورەتربم، بەڵام خۆ ئافرەت تەنها هەر لەش نیە، بێگومان پیاویش هەر تەنها جەستە نیە. من دڵنیابووم لەوەی کە ڕۆژێک لەڕۆژان کچێک دەناسم کە بەڕۆح و بەگیان خۆشم بوێت، وابزانم هەرلەبەرئەوەش بوو کە بەتەنیا کەوتمە پیاسەکردنی دورودرێژ. خۆم بەخۆمم دەوت "خۆ درەنگ یان زوو هەردەبێت بیدۆزمەوە، وە ئەگەر کەسێکیش بێت کە لە من بچێت، ئەوا لە دیسکۆیەکدا یان شوێنێکی تایبەت بە گەنجاندا نایبینمەوە". زیاتر ڕێی تێدەچوو کە لەشوێنێکی وەک "کیکوت" یان "بلانکڤانسبرۆتن"دا چاوم پێبکەوێت. لەڕاستیشدا لەناوەڕاستی مانگی شەشدا لە "ئوللەڤۆلسیتە"دا بینیم.

*

ئەو کاتەی لە باخچەی ساوایان بووم، پێم خۆشبوو لە سوچێکدا دانیشم و تەماشای منداڵانی تر بکەم کە یاریان دەکرد. بەڵام دواتر منداڵەکان بەتەمەنتربووبوون، تاڕادەیەک گەورەشبووبوون. منیش





چیتر بەلامەوە خۆشنەبوو تەماشای یاری گەورەکان بکەم، بەتایبەتیش ئەو یاریەی کە پێیاندەوت "ئاهەنگی قوتابیان". من زیاتر ئەو چالاکیانەم پێخۆشبوو کە لە پێش کردنەوەی قوتابخانەدا ڕوویاندەدا وەک لەو چالاکیانەی لەپاش تەواوبوونی قوتابخانەدا لەبەردەستدا دەبوون. لەو حەفتانەی دوابەدوای تاقیکردنەوەکانماندا هەروا بەئاسانی وەکو پێشتر کچێکم دەستنەدەکەوت کە لەگەڵمدا بێت بۆ شانۆ و دواتر بێتە میوانیم، چونکە چەندەها چالاکی جیاوازجیاواز لە شاردا ئەنجامدەدرا.

هەرلەبەرئەوە تاڕادەیەک هەموو ڕۆژێک دەچوومە دەرەوە و پیاسەی دورودرێژم لە ناوچەی "نۆردمارک"دا دەکرد. بە قیتار تا "فینسە" دەچووم، پیاسەیەکی تێروتەسەلیشم لە "هاردەنگێرڤیدا"دا دەکرد، بەرەو "ئاورلاندسدالن"دا دەهاتمە خوارەوە و دواتر بەقیتار لە "فلۆم"ەوە دەگەڕامەوە ماڵەوە. چێژم لە سواربوونی قیتار دەبینی، پێمخۆشبوو تەماشای خەڵکی ناو قیتار بکەم، بەلاشمەوە خۆشبوو لەو کاتەدا کە قیتارەکە دەڕۆیشت، بۆ خۆم دابنیشم و بیر لە شتی هەمەڕەنگ بکەمەوە. قوتابخانەم تەواوکردبوو، پاش چەند حەفتەیەکیش شەهادەکەم وەردەگرت، دەمزانی لەوانەی جومناستیکدا نمرەی 7 دەهێنم و سەرتاپای وانەکانی تریش 13. بێئیش و بێکاربووم، بۆ خۆم هەر پیاسەم دەکرد و سواری قیتاردەبووم. باوکم دەبوایە هەتا 15ی 9 کۆمەکی پارەی بکردمایە.

هەمیشە لەو کاتانەدا کە لەدەرەوە پیاسەمدەکرد، قەڵەمێک و دەفتەرێکی تێبینیم پێبوو. من بەتایبەتی زۆرم پێخۆشبوو لە کاتی ڕۆیشتندا بەقوڵی بیر لە شتی هەمەڕ'نگ بکەمەوە. هەڵبەتە من هەمیشە هەر بیرمدەکردەوە، بەڵام ئەو کاتانەی لە سروشتدا





دەجولامەوە، ئاسانتر فەنتاسیاکانم بۆ دادەڕێژرا وەک لەو کاتانەی کە لە ماڵەوە لەسەر کورسیەک بۆی دادەنیشتم. "شیللەر" کاتی خۆی دەیوت "مرۆڤ ئەو کاتانە سەربەستە کە یاری دەکات، چونکە بەپێی یاسای تایبەتی خۆی هەڵسوکەوت دەکات". لەوێدا لە خاڵێکی گرنگ دەدات، بەڵام بێگومان دەکرێت ڕاستەوڕاست وێنەکە هەڵبگێڕینەوە؛ من لەو کاتانەدا کە بەسەربەستی لە "هاردەنگێرڤیدا"دا پیاسەم دەکرد، ئاسانترێک دەمتوانی یاری لەگەڵ بیرکردنەوە و بیرۆکەکانمدا بکەم، وەک لەو کاتانەی ئەگەر ناچاربوومایە بۆ ماوەی چەندین سەعات وەک زیندانیەک لەنێوان چوار دیواری ڕەقوتەقدا هاتوچۆم بکردایە. بەدەرلەوەش شتێکی تریش هەبوو؛ پیاوە یەک مەتریەکە تاڕادەیەکی زۆر بۆخۆی هەر لەماڵەوە دەمایەوە. جارجارێک دەهاتە ناوشار، بەڵام زۆر بەدەگمەن ڕێدەکەوت لە دارستانێکدا خۆی نیشانبدات، یان لە "هاردەنگێرڤیدا"دا دەرکەوێت.

لەو کاتانەدا کە دەڕۆیشتم بیرۆکەی پاکتر و بوێرانەترم بەخەیاڵدا دەهات، لەوێشەوە پوختە و کرۆکی نوسینەکانم بەسەردا دەڕژا. لە ماڵیشەوە کەتەلۆکێک و پێڕستێکم بۆ سەرتاپای ئەو نوسینانەم پێکهێنابوو کە دەکرا وەک بنچینەیەکی ڕۆمان و کورتە ڕۆمان و شانۆگەری و فیلم بەکاربهێنرێن. باشترین بیرۆکەشم بەئامێری چاپەکەم دەنوسیەوە و دواتر لاپەڕەکانم لە مەلەفێکدا دادەنا. هەرکاتێکیش کە دەمخستەنە مەلەفێکەوە، ئیدی دەستم لێهەڵدەگرتن. زۆر بەدەگمەن ڕێدەکەوت کەڕەتێکی تر دەریانبهێنمەوە و چاوێکیان پێدا بخشێنمەوە.

هەتا ئەو کاتەش بەخەیاڵمدا نەهات کە دەستبدەمە یەکێک لەو بیرۆکانە و بیانکەمە نوسینێک. سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکە بنەڕەتیانە



بەلامەوە وەک ئارەزوویەک وابوو، تارادەیەک هەروەک شتێکی ناتەواو
یان وەک شتێکی شاز دەمبینین. خەڵکی وا هەیە پول یان پارەی ئاسن
کۆدەکەنەوە، منیش بیرۆکەکانی خۆمم کۆدەکردەوە.
کەرەتێکیان کچێک لاپەڕەکانی مەلەفێکی هەڵدەدایەوە، لە
کتێبخانەکەی ژوری کارکردنەکەمدا دەریهێنابوو و بەدەنگی بەرز
هەندێ لەدێڕەکانی دەخوێندەوە. من رێگەم بەو کچە نەدا کە شەو
لەلام بمێنێتەوە، تەنها بیرە و هێلکەی سورەوکراوم دەرخواردا و
هیچی تر. لەو کاتەشەوە هەموو مەلەفەکان و پێرستەکانم لە دوو
دۆلابی تۆکمەی ژێر کتێبخانەکەی ژوری دانیشتندا دانا و کلیلم دان.

رۆژێکیان لە "ئاورلاندسدالن"دەوە دەهاتمە خوارەوە، لەو کاتەدا
لەناکاوێکدا بیرۆکەیەکم بۆ هات. بیرۆکەیەکی تەواو نوێبوو بۆم،
لەوەشەوە بۆم هات کە ماوەیەک لەوەوبەر لە "یانەی 7"دا نوسەرێکی
گەنجم ناسی، ئەو تەنها چوار پێنج ساڵێک لە خۆم گەورەتربوو.
بتلێک شەرابم بۆ کڕیبوو و دەمانخواردەوە، بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە
پێکەوە قسەماندەکرد. ڕاستە جوتێک چاویلکەی نایابی "جۆن لینۆن"ی
لەچاودابوو، دونیایەک قژ و ڕیش بەسەروچاوەیەوەبوو و چاکەت و
پانتۆڵێکی تێکەڵ و پێکەڵی قەدیفەی لەبەردابوو، بەلام لەگەڵ
ئەوەشدا هەتا بڵێیت وەک کەسێکی کرچ و کاڵ دەهاتە بەرچاوم،
دەبێت ئەوەندەش بڵێم کە بەلایەنی کەمەوە هێندەی خەڵکانی
هاوتەمەنی خۆم کرچ وکاڵ دیارنەبوو. تێبینیەکی خۆمم پیشاندا کە
هەر ئەو رۆژە بەرلە بینینی ئەو نوسیبووم _بەخەتێکی ورد لە
دوتوێی سێ چوار لاپەڕەیەکدا نوسیبومەوە، بیرۆکەیەکی زۆرزانانە
بوو و بۆ رۆمانێک دەشیا. رێگەم پێدا هەموو تێکستەکەم بخوێنێتەوە،







هەر زۆر سەرسامبوو. لەچاویدا دەمبینی بەخیلی پێدەبردم، بەلام
ستایشێکی زۆری بیرۆکەکەمی کرد. من بەهیچ شێوەیەک سەرم
نەسورما، چونکە خۆم دەمزانی کە ئەو تێبینیە بیرۆکەیەکی نایابی
رۆمانێکە. لەلایەکی تریشەوە هیچ سودێکم لە ستایشکردن
وەرنەدەگرت، بەتایبەتیش لە نوسەرێکی گەنجی کەم ئەزمونی وەک
ئەووەوە، دوای ئەوە من بۆ ئەوە تێبینیەکەم نیشان نەدا کە ستایشم
بکات. هەرلەبەرئەوە وتم «ئەگەر پارەی بتڵە شەرابەکە بدەیت،
تێبینیەکەمت پێدەبەخشم». واقیورما. منیش بۆم ڕونکردەوە و وتم
«ئێ خۆ تۆ خۆت نوسەریت، منیش پەیمانت دەدەمێ کە هەرگیزاو
هەرگیز لەلای هیچ کەسێک ڕاستیەکە نادرکێنم و بەکەس نالێم لە
کوێوە بیرۆکەی ئەو رۆمانەت وەرگرتووە. بەلام لەبەرامبەردا دەبێت
پارەی شەرابەکە بدەیت و پەنجا کرۆنێکیش بدەیت بە خۆم». لەیانەی
7دا بەو جۆرەبوو کە دەبوایە لەپێشەوە پارەی شەرابەکەت بدایە،
ئینجا بۆیان هەڵدەپچڕیت، لەبەرئەوە پارەی شەرابەکەی دامەوە و
لەسەروشیەوە سەد کرۆنیشی دامێ. لەو کاتەدا کە پارەکەم
لێوەرگرت، چاوم بە پیاوە یەک مەتریەکە کەوت. لە هۆڵەکەدا بوو،
تورە دیاربوو و لەنێوان مێزەکانی قاوەخانەکەدا دەخولایەوە. لەپڕێکدا
ڕویکردە مێزەکەی ئێمە و بەگۆچانە حەیزەرانەکەی دەستی هەڕەشەی
لێدەکردم.
ئەمرۆکە ئەو پیاوە گەنجەی کە چاویلکەی "جۆن لینۆن"ی
لەچاودەکرد، یەکێکە لە نوسەرە بەناوبانگەکانی ولاتەکەمان و هێندە
نابێت تەمەنی لە 50 ساڵ تێپەڕی. لەو کاتەوە من چەند جارێکی تر
بینیمەوە و ئێستاکەش لەسەدا دەی قازانجی کتێبەکانی من
وەریدەگرم. ئەوەش شتێکە کە تەنها من و ئەو دەیزانین.





له "ئاورلاندسدالن"دا تاشەبەردێکی گەورەی چاڵی لێیە پێی دەڵێن "ڤیتلاهێلڤیت"، من ماوەیەکی دوورودرێژ لەوێدا بۆ خۆم وەستابووم، هەرلەوێشدا بۆ یەکەمین جار بەخەیاڵمدا هات کە بیرۆکە زۆرەکانم دەکرێت ببنە سەرچاوەی ژیانم. من شتێکم لەلابوو کە لەلای خەڵکانی تر بەئاسانی دەستنەدەکەوت. کەسێکیش نەبووم کە لە خۆم بایی بووبم، وە نەشمدەویست ناوبانگ دەربکەم، بەڵام پێویستم بەپارەبوو و تاقەتی ئەوەم نەبوو ئیشێک لەپشوی هاویندا بدۆزمەوە. جگەلەوەش لە 15ی 9شەوە هیچ سەرچاوەیەکم نەبوو کەلەسەری بژیم، چونکە باوکم زۆر بەڕونی پێی وتم لەو ڕۆژەوە ئیتر بەهیچ جۆرێک کۆمەکم ناکات. بەڵام، هەروەک خۆی وتی، بێگومان دەتەوێت بەردەوامی بە خوێندن بدەیت و هەموو خوێندکارێکیش بۆیان هەیە قەرزی خوێندن وەربگرن. باوکم نەیدەزانی کە من بەهیچ جۆرێک نەمدەتوانی لەسەر پارەی قەرزی خوێندکاری بژیم، چونکە ئەو پارەیە تەنانەت بەشی مەسرەفی ئەو کچانەی نەدەکرد کە دەهاتنە میوانیم. بێ لەوەش ئەگەر پارەم پێنەبوایە، ئەوا نەمدەتوانی بەئارەزوی خۆم شتبکڕم، من بەهیچ شێوەیەک حەزم لەوە نەبوو.

من لە "ئاورلاندسدالن"دا سروشێکم بۆ هات، سروشێکی کەمخایەنیش بوو، هەمیشە سروش بەو شێوەیە بە ئاگایماندا تێپەڕدەبێت. من بۆیە ئەمە باسدەکەم چونکە بەتەواوەتی دەزانم لە چ کاتێک و لە چ شوێنێکدابووم کە بۆ یەکەمین جار ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات، ڕێک لەو کاتەدا بوو کە وەستابووم و تەماشای "ڤیتلاهێلڤیت"م دەکرد. بیرمدێت کە بیرۆکەکەم بەلاوە باشبوو، بەلامەوە وەک کۆڵەکەیەک وابوو، بیرۆکەیەک بوو کەوەک سەقفێکی پتەو بەسەر هەموو بیرۆکەکانی





ترمدا خۆی ڕاکێشا و بەو شێوەیەش هەموویانی خستە شوێنی گونجاوی خۆیانەوە.

ئەمڕۆکە ئەو پیاسەیەی "ئاورلاندسدالن"م وەک ڕۆژێک دێتەوە بەرچاو کە پەیماننامەیەکم لەگەڵ شەیتاندا بەستبێت.

زۆرجار لەکاتی پیاسەکردنی ناو سروشتدا بیرم لەو هەموو ساڵانە دەکردەوە کە تێپەڕیبووبوون. شتێکبوون کە کۆتاییان پێهاتبوو و دەبوایە لەدوایانەوە شتێکی نوێ دەستپێبکردایە. من دەمویست شوێنێکم لە کۆمەڵگادا هەبێت کە شایانی ڕێزبێت و لە هەمان کاتیشدا نەناسراوبم.

هەر لەو سەردەمەوە نەمدەتوانی یادوەری ڕاستەقینە و یادوەری فەنتاسیم جودابکەمەوە. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە من توانایەکی تایبەتیم هەبوو و دەمتوانی یادوەریەکی زیندوو لە ژیانی فەنتاسیای خۆمەوە لەلای خۆم گەڵاڵەبکەم، هاوکاتیش تەنها یادوەریەکی کەمی یەکجار تەماویم لە ژیانی ڕاستەقینەمەوە لابوو. ئەوە کەمێک دەیترساندم، کەمێک دەیشڵەژاندم، بەڵام هەر زۆر سانایە بڵێین سەردەمێکی منداڵی پڕئازارم هەبووە و هەرلەبەرئەوەشە کە چەپاندوومە. دایکم لەو بڕوایەدابوو کە من سەردەمێکی منداڵی ناخۆشم بردبێتەسەر، چونکە لەوە زیاتری نەدەزانی. بەڵام خۆم پێم وایە سەردەمێکی منداڵی دەوڵەمەندم بەسەربردبێت.

بیرمدێت کەڕەتێکیان بەسەر شارەکەدا فڕیم. هەموو ماڵەکانی خوارەوەم دەبینی و دەمتوانی بەئارەزووی خۆم ماڵێک هەڵببژێرم، بەهێواشی لێی نزیکببمەوە و تەماشای ژوری دانیشتن و نوستنەکەی





بکەم. لە پەنجەرەکانەوە تەماشای شێوەی ژیانی ئەو خەڵکە هەمەڕەنگەم دەکرد، بەو شێوەیەش تەنانەت یەک نهێنیش نەبوو کە لەمن بشاردرێتەوە. چاوم لە هەموو شتێکبوو، هەرلە شەڕوشۆڕە هەمەڕەنگەکانی ناو ماڵەکانەوە هەتا چالاکیە سێکسیە هەرە سەیروسەمەرەکانی خەڵکی. هەردەتوت لە چەند مەیمونێکی ناو قەفەز وردەبمەوە، هەندێ جاریش شەرمم لەڕەگەزەکەی خۆم دەکرد. کەڕەتێکیان ژن و پیاوێکم بینی لەسەر فەرشێکی گەورەی کوڵکن خەریکی سێکسبوون، لەو کاتەشدا کچێکی بچکۆلەی دوو سێ ساڵان لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو و تەماشای دەکردن. ئەوە شتێکی سروشتی نەبوو بەلامەوە. کەڕەتێکی تریش پیاوێکم بینی لەسەر جێگایەکی خەوی گەورە پاڵکەوتبوو و لەیەک کاتدا خەریکی دوو ئافرەت بوو. ڕقم لەوە نەبوو، بەڵام بینینی چەند دیمەنێکی تر هەژاندمی. جارێکیان دوو پیاوم بینی لەسەر پارە شەڕێکی گەورەیان بوو، منیش نەمدەتوانی هیچ شتێک بکەم. زۆر دڵنیانەبووم، بەڵام یەکێکیان لە خانوەکەوە دەرپەڕیە دەرەوە و ئەوی تریان کەوتبوو و لەوەدەچوو مردبێت.

بێگومان هەموو ئەوانە یادوەری فەنتاسیامن، بەڵام من شتێکی زۆر لەو جۆرە فەنتاسیایانەوە فێردەبووم، زۆرینەی جارەکان پڕبوون لە حیکمەت. بەشێکی زۆری ئەو بیرۆکانەی کە بۆ ڕۆمانی پۆلیسی دامدەڕشتن، سەرچاوەیان لەو سەفەرە ڕۆحانیانەوە وەردەگرت. بەشێوەیەکی گشتی ڕوداوی سەرەکی ڕۆمانێکی پۆلیسی ناوەڕۆکێکی چڕی هەیە و دەکرێت لەسەر یەک لاپەڕە بنوسرێتەوە. هونەری نوسەر کتومت لەوەدایە کە ئەو ناوەرۆکە لە زانیاریە دیارەکانی تر جودابکاتەوە. پۆلیسە نهێنیەکە پێویستی بە کاتە _وە هەروەها





زرنگیش _ بۆ ئەوەی نهێنیەکە بدۆزێتەوە، خوێنەریش ڕێک چێژ لەوە دەبینێت. ئەو کەسەی کە بەدوای نهێنیەکەدا دەگەڕێت نەختە نەختە شتەکانی بۆ ڕوندەبێتەوە و هێدی هێدی لەو ڕووداوە نزیک دەبێتەوە کە بەڕاستی ڕوویداوە. بەدەرلەوەش دەبێت وایلێبکرێت کە دوای جێشوێنی هەڵە بکەوێت، دوای جێنیشانەی ساختە بکەوێت، بەڵام دواتر کە وردە وردە وێنەکە ئاشکراتر و ڕونتر دەبێتەوە، خوێنەر هەستدەکات کە خۆشی بەئەنجام گەیشتووە؛ خوێنەران لەو بڕوایەدا دەبن کە خۆشیان بەشداری دۆزینەوەی نهێنی ڕووداوەکە دەکەن.

من چەندەها شتیش لە ڕێگەی خەونەکانمەوە فێربووم. پێیدەچێت خەون وەک کتێبێکی کراوە وابێت. لەو کاتەدا دوو سێ دیمەنی خەونم هەبوو کە بەردەوام دەهاتنەوە بەرچاوم، چەند کەسایەتیەکی کەمیش لە خەونەکانمدا هەبوون و تاوناتاوێک لە خەونەکانمدا دەردەکەوتن. من دڵنیابووم کە خەونەکانم هەروا بەرپەرچدانەوەی ئەو شتانە نەبوون کە لە جیهانی دەرەوەدا دەمبینین، بەڵکو بە پێچەوانەوە نمایشکردنی شتێکی نوێ بوون. ئەزمونێکی هەرزۆر نوێبوو بۆم و شتی لێوە فێردەبووم، وە هەتا ئەو کاتەی کە بوومە ئەم مرۆڤەی کە ئێستاکە هەم، بەشداری پێگەیشتنمیان کردووە. بەڵام ئەی خەونەکانم لە کوێوە دەهاتن؟ من بەتەواوەتی نەمدەزانی خەونەکان و سەفەرە ڕۆحیەکانم بەهۆی چیەوە ڕوودەدەن، بەهۆی ئەوەوەبوو کە من زۆر هەستیاربووم بەرامبەر ئەو شتانەی کە لەدەرەوەڕا دەهاتن؟ یان ئامێرێکی ڕۆحی وام هەبوو کە دەیتوانی توێژاڵ لەدوای توێژاڵی نهێنیەکانی قوڵایی ناخم بخوێنێتەوە؟

چیتر خەونم بەو پیاوە بچکۆلەیەوە نەدەبینی کە گۆچانە حەیزەرانەکەی پێبوو، بەڵام بەلامەوە هەر زۆر ئاسای بوو ئەگەر لە





خەونێکدا بمبینیبایە. زۆر خۆشتربوو ئەگەر لە خەونێکدا بمبینیایە وەک لەوەی بەردەوام لە خانوەکەمدا بیبینم.

من سەفەری ڕۆحی سەرسوڕهێنەرتریشم دەکرد. بۆ نمونە من گەلێ ساڵ لەپێش "ئارمسترۆنگ" و "ئالدرین"دا چوومە سەر مانگ. ئەو کاتەم لەیادە کەلەسەر مانگ وەستابووم و تەماشای سەرەوەمدەکرد، ئەو زەویەم دەبینی کە سەرتاپای مرۆڤەکان لەسەری دەژیان. ئێستاکە وەک شتێکی بێتام و سواو تەماشای ئەوە دەکرێت، بەڵام زۆر پێش ئەوەی "ئارمسترۆنگ" هەنگاوە گەورەکە بۆ مرۆڤایەتی هەڵبهێنێت، من لەسەر مانگبووم و بۆ یەکەمین جار ئەو هەموو شەڕ و سنورانەی سەر زەویم وەک حاڵەتێکی تێکەڵەی تراجیدی و کۆمیدی دەبینی. وابزانم ئەو کاتەی کە ئەو سەفەرە ڕۆحیەم کرد، تەمەنم 12 ساڵ بوو. هەرلەو کاتەوە زۆر بەقوڵی لەو هەموو تورەهاتە بێمانایانە دەگەیشتم کە خەڵکی ژیانی خۆیان پێپڕدەکردەوە، لەسەرو ئەوانەشەوە ستایشکردن و پیاداهەڵدان و ڕێزلێنان و بەناوبانگیش وەک کۆمیدیایەک دەهاتە بەرچاوم.

سەفەرە ڕۆحیەکانم دورتریکیش دەڕۆیشتن، دەگەییشتنە ناو گەردوون. کەرەتێکیان بەهۆی ئامێرێکی کاتەوە سەفەرمکرد و ئەو کاتە گەڕامەوە کە هێشتا ژیان لەسەر زەوی سەریهەڵنەدابوو. بەسەر ئاوەکاندا دەفریم و زەویم دەبینی، هەرلە خونچەیەکی پێگەییو دەچوو، من دەمزانی کە هێندەی پێناچێت و ژیان لەسەر زەوی سەرهەڵدەدات. ئەو کاتە نزیکەی چوار ملیارد ساڵێک لەپێش ئەو سەردەمەوەبوو کە "گێرهاردسن" ماوەی یەکەمی حوکمەتەکەی دامەزراند.





هەندێ جاریش بەباڵی ڕۆحم بەسەر شوێنی جیاجیای شاردا دەفڕیم، بۆ نمونە دەچوومە بن سەقفی یەکێک لە شانۆگەریەکانی شار، لەو سەرەوە دادەنیشتم و تەماشای ئەکتەرەکانم دەکرد. کەرەتێکیان پیاوە یەک مەتریەکە لەدوری تەنها یەک مەترونیوەوە لە منەوە لەسەر شیشی یەکێک لە گڵۆپەکان بۆی دانیشت. زۆر ماندوو دەهاتە بەرچاوم، بەگۆشەیەکی چاو تەماشایەکی کردم و بەدەنگێکی نوساو وتی؛ «هۆهۆو، تۆش لێرەیت؟ بۆچی قەت ڕێگە بە من نادرێت کە بەتەنها شتێک بکەم؟» هێشتام ئەو نارازییبوو.

من بەردەوام ئەندێشەی نوێم بەخەیاڵدا دەهات. یەک بەدوای یەکدا دەهاتن، خوتکەیاندەدام، هەروەک برینێکی نوێ ئێشی دەهات. خوێناوی چیرۆک و حەکایەتم لێدەچۆڕا، بیرۆکەی نوێ لە مێشکمەوە دەڕژان، هەستم دەکرد ناوەوەم شەق شەقبووە و کوڵپی ئاگراوێکی سوری پیادا دێتە خوارەوە.

من هەمیشە لێوانلێوبووم لە ئەندێشە و تارادەیەک بەردەوام ناچاربووم شوێنێک بدۆزمەوە کە بتوانم تێیدا لەسەرخۆ قەڵەمێک و کاغەزێک بگرم بەدەستمەوە و مێشکم بەتاڵبکەمەوە. من بۆ نمونە گفتوگۆی دورودرێژم دەنوسیەوە کە لەنێوان دوو دەنگ یان چەند دەنگێکی ناو مێشکمدا ڕوویاندەدا، زۆرجاریش گفتوگۆکان دەربارەی بابەتێکی دیاریکراوی "ئۆنتۆلۆجی"[17] و ئیپستیمۆلۆجی و جوان ناسی بوون. بۆ وێنە یەکێک لە دەنگەکان دەیوت؛ من هیچ گومانێکم لەوەدا نیە کە مرۆڤ خاوەنی ڕۆحێکی نەمرە و بۆ ماوەیەکی کەم

[17] زانستی بوون.





جەستەیەکی گۆشت و خوێن دەکاتە ماڵی خۆی. هەر بۆ نمونە دەنگەکەی تر لە وەڵامدا دەیوت؛ نا، نا. مرۆڤ گیاندارێکە و وەکو هەموو گیاندارەکانی تر وایە. ئەو شتەی کە تۆ پێی دەڵێیت ڕۆح، بەشێوەیەک بەستراوەتەوە بە مێشکەوە کە بەهیچ جۆرێک ناتوانێت لێی جودا ببێتەوە، مێشکیش شتێکە کە شیاوی هەڵوەشاندنە و فەوتانە. یان هەروەک بودا لە سەرەمەرگیدا وتی؛ تەمەنی بوونی هەموو شتێکی پێکهاتە، کەمخایەنە.

ڕێدەکەوت ئەو جۆرە دیالۆگانە چەندەها و چەندەها لاپەڕەی گەورە بگرنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە هەستێکی نایابم دەبوو کە لە مێشکمدا دەمهێنانە دەرەوە. دواتریش، پاش ئەوەی شتێکم دەنوسیەوە، هێندەی پێنەدەچوو پڕدەبوومەوە لە دەنگ و دیسانەوە ناچاربووم خۆم بەتاڵبکەمەوە.

ڕێشدەکەوت ئەو دیالۆگانەی کە بەشێوەیەک لە شێوەکان سەرشانی منیان سوکدەکرد، سەرچاوەیان لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەوە وەرگرتبێت. بۆ نمونە یەکێک لە دەنگەکان دەیوت ؛ئێ، هەر باشە وا هاتیتەوە. باشە هەر بەلایەنی کەمەوە نەتدەتوانی تەلەفونێک بکەیت و بڵێیت دوادەکەوم؟ ئیدی دەنگەکەی تر وەڵامی دەدایەوە و دەیوت؛ ئێ خۆ من پێم وتیت لەوانەیە کۆبونەوەکەمان درێژە بخایەنێت. ئەوجا دەنگەکەی یەکەم دەیوتەوە؛ ناشێت بتەوێت بڵێیت کە تائێستاکە هەر لە کۆبونەوە بوویت، ها؟ کاتژمێر وا خەریکە دەبێتە دوانزە! لێرەشەوە ئیدی دەکەوتنە گەرمەی شەڕەوە.

من هەرگیز پێشوەخت بیرم لەو سەرەتای وتووێژانە نەدەکردەوە کە دواتر چیان لێدەردەچێت و دەبنە چ پێشەکیەک. بەپێچەوانەوە، من کتومت بۆ ئەوەی نەهێڵم توشی ئەو حاڵەتە ببم دادەنیشتم و هەموو





دیالۆگەکەم تەواودەکرد _هەر ڕێک بۆئەوەی کۆتایی پێبهێنم- دارشتنی بیرکردنەوەکانم و نوسینەوەیان تەنها چارەیەکی بەردەستمبوو بۆ ئەوەی خۆم لە ئازاری بەردەوامی مێشکی هاژاوم قورتاربکەم.

جاری واهەبوو مەشروبم بەسەر مێشکمدا دەرژاند، بەڵام لەوسەرەوە وەک چیرۆکێک هەڵدەڕژایەوە دەرەوە. هەردەتوت ئەو شلەیە دەبێتە هەڵم و گۆڕانگاری بەسەردادێت و دەبێتە ڕۆحێکی پاک. ڕاستە ئەلکهولەکە برەوی بە فەنتاسیام دەدا، بەڵام لەهەمان کاتدا یارمەتی دەدام کە کەمترێک لە فەنتاسیام بترسم. ماتۆڕێکی لەناوەوەمدا دەخستە ئیش و هاوکاتیش هێندە هێز و ئازایەتی پێدەبەخشیم کە بەرگەی ئیشکردنی ماتۆڕەکە بگرم. ڕێدەکەوت مێشکم پڕبێت لە دەنگ، بەڵام هەرئەوەندەی یەک دوو پەرداخم بۆ فڕدەکرد، ئیتر دەمتوانی هەر هەموویان بگرم.

هەموو کاتێکیش کە بۆ بەیانیەکەی خەبەرم دەبۆوە، تێبینیەکانی دوێنێ ئێوارەم بیرنەدەهاتەوە کە نوسیبوومن، بەتایبەتیش ئەو شتانەم بیرنەدەهاتەوە کە بەپەشۆکاوی لەکۆتایدا لەدوای دوو بتڵ شەرابەوە نوسیبوومنەوە. لەبەرئەوە بەلامەوە خۆشبوو بەیانیان بەڕۆبێکەوە بێهودە خۆم بکەم بە ژوری کارکردنەکەمدا و تەماشایەکی سەر مێزی نوسینەکەم بکەم. ڕێدەکەوت شتێکی سەرنجڕاکێشەری لەسەربێت، جاری واش هەبوو کۆمەڵێک تێبینیم بەدیدەکرد و بەهیچ جۆرێک بیرم نەدەهاتەوە کە من نوسیبێتمن، ئەو کاتانە هەستم دەکرد کە دەکومێنتێکی پڕنهێنیم لەڕێگەی نوسینی ئۆتۆماتیکیەوە پێگەیشتبێت.

وابزانم ئەو هێزە پاڵنەرەی کە لەپشت فەنتاسیاکانمەوە بوو و لە هەمان کاتیشدا وایلێدەکردم بەردەوام مەشروب بخۆمەوە، دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە من هەمیشە دەمویست شتێک لەیادبکەم، بەڵام لەڕاستیدا خۆ ئەو شتەم بیرم نەدەهاتەوە. من نەمدەزانی بۆچی ئەو هەموو وزەیەم بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی شتێک لەیادبکەم، کە لە بنەڕەتدا بیرم نەدەهاتەوە؟

تەنها ئەو کاتانە بۆ ماوەیەکی کەم ڕۆحم ئارامدەبوو کە پیاسەم لەناو سروشتدا دەکرد یان کە کچێک دەهاتە میوانیم.
من بەرلەوەی بچمە قۆناغی ئامادەیی سەرسامی نهێنیەکانی سروشتبووم. جیهانم بەشێوەیەکی خەیاڵاوی و پڕجادوو دەبینی. لەدەفتەری یاداشتەکانمدا نوسیبووم؛ تارادەیەک لە هەموو شتێک تێگەیشتووم. خودی جیهان تەنها شتێکە کە ناتوانم پەی پێبەرم. شتێکی هەر زۆر پڕە، هێندە چڕە ناتوانم بەناویدا تێپەڕم. من دەمێکە دەستم لە تێگەیشتنی جیهان هەڵگرتووە. هەرئەوەشە کە بۆتە ڕێگر و ناهێڵێت هەست بە حیکمەتێکی سەرانسەری و پڕاوپڕبکەم.
لەلایەکی تریشەوە کەسێکی ڕۆمانسی بووم. قەت ڕێگەم بە خۆم نەدەدا بە کچێک بڵێم "خۆشمدەوێیت" ئەگەر لە دڵمەوە نەبوایە _پێموابێت هەر لەبەرئەوەشبوو کە خۆمدەدا بەدەست ئەو هەموو کچانەوە. من هێندە تێگەیشتبووم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبمە ئاشقێکی ڕاستگۆ و بەئەمەک. ئەگەر بەویستی خۆم بوایە، ئەوا حەزمدەکرد سەرتاپای هەموو ژیانم لە کوخێکی دارینی ناو دارستانێکدا لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بەسەربەرم کە بەڕاستی خۆشم دەویست. بەڵام دەبوایە لەپێشدا ئەو ئافرەتەم بدۆزیبایەتەوە. لەو کاتانەدا کە پیاسەمدەکرد،





هیچ گومانێکم لەوە نەبوو کە لە ناکاوێکدا لێم پەیدا ببێت. لەناو خۆمدا بەیەقینەوە دەموت "لەوانەیە لەکۆڵانەکەی دواتردا لەسەر شۆستەکە وەستابێت". من هەستم نەدەکرد زیادەڕۆیی بکەم، بەڵام گومانیشم نەبوو کە ئەو لە شوێنێک لە شوێنەکاندا بوونی هەبوو.

*

من ئەو پاشنیوەڕۆیەی مانگی شەش، لە "میتستوون"ەوە خۆم گەیاندبووە "ئوللەڤۆلسیتە". کەم کەس هەبوو کە لە ڕۆژێکی گەرمی مانگی شەشدا پیاسە لە "نۆردمارک"دا بکات، پێموابێت هەرلەبەر ئەو هۆیەبوو کە ڕێک ئەو ڕۆژە زۆر چاوەڕوانبووم شتێکی تایبەت ڕووبدات. بەپێ هەتا "شێنونگستووە" ڕۆیشتم بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک ببینم، بەو شێوەیەش بەختی ئەوەم زیاترێک بوو کە لەناکاودا ئەو ئافرەتە بەرەوڕووم بێت. چونکە ئەگەر دارستانەکە پڕبوایە لە خەڵکی، ئەوا لەوانەیە بەهیچ جۆرێک چاومان بەیەکتری نەکەوتایە، یان بەلایەنی کەمەوە ئەو کاتە نەدەوەستاین بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ یەکتریدا بکەین.
چوومە ناو قاوەخانەکەوە و پسکیتێک و پەرداخێک شەربەتم کڕی، دواتر چوومەوە دەرەوە و لەسەر چیمەنەکە بۆی دانیشتم. کەمێک لەولاترەوە کچێک لەسەر کورسیەک دانیشتبوو، پانتۆڵی کاوبۆی شین و فانیلەیەکی سوری لەبەردابوو، قژێکی ڕەش و لولی پێوەبوو، ئێمە تەنها کەس بووین لەوناوەدا. ئەویش دانیشتبوو شتێکی دەخواردەوە، بەڵام پاش نەختێک هەستایە سەرپێ و بەلەنجەولار بەرەوڕوم هات. بۆ ساتێک لەوە ترسام کە یەکێک بێت لەو کچانەی کە لەوەوپێش شەو





لەلام مابوونەوە، چونکە هەندێکی زۆریان قژیان ڕەشبوو، چەند دانەیەکیشیان قژیان لولبوو، هەروەها سەختبوو بۆم هەر هەموویانم لەیادبێت. بەڵام ئەو ئافرەتەی کە لەوێدا لەبەردەممدا وەستا زۆر بەتەمەنتربوو لە کچەکانی تر، مەزەندەم دەکرد نۆ یان دە ساڵێک لەوان گەورەترێک بێت. جگە لەوەش کچێکی هاوتەمەنی خۆم ئاوها بەبێ ئەوەی هیچ شەرمێک بکات، بەو شێوەیە دەستپێشکەری نەدەکرد. لەتەنیشتمەوە لەسەر چیمەنەکە دانیشت و بە سویدی وتی "من ناوم ماریا"یە. من هەرگیز لەوەوپێش لەگەڵ کچێکی سویدیدا نەبووبووم، زۆر دڵنیاشبووم کە ئەو چەند مانگەی پێشوتر ئەو "ماریا"یەبوو کە من بەدوایدا دەگەڕام. دەبوایە بۆ یەک بووینایە، لەڕاستیدا تەنها من و ئەو لەوێدابووین، بەڵام بێگومان بۆ یەک دانرابووین و ڕێی تێنەدەچوو کە ڕێکەوتێکی پەتی بێت، چونکە لەو پاشنیوەڕۆ گەرمەی مانگی شەشدا لە شوێنێکی وەک "ئوللەڤۆلسیتە"دا چاومان بەیەک کەوت.

بۆ ماوەی یەک دوو دەقەیەک باسی شتی جۆراوجۆرمان کرد، پاش ماوەیەکی کەمیش وە بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک زۆر لە خۆمان بکەین بەڕاشکاوی کەوتینە قسەکردن و تارادەیەک هەروەک ئەوە وابوو کە لە کۆنەوە یەکتر بناسین. ئەو تەمەنی 29 ساڵ بوو و هێندە نەبوو لە دانیشگای ئۆسلۆدا پلەی ماجستێری لە مێژووی هونەردا هێنابوو. لەوەوپێشیش هونەری ڕێنیسانسی لە ئیتاڵیادا خوێندبوو. لە "کرینگشۆ" لە خانەیەکی قوتابیاندا دەژیا، ئەوەش شتێکی نوێ و پڕهیوابوو. هەموو ئەو کچانەی کە تاوەکو ئەو کاتە ناسیبوومن، ناچاربوون لەگەڵمدا بێنەوە ماڵەوە، چونکە هێشتام ماڵی خۆیان نەبوو، لەخێزانی گەورەوە هاتبوون و لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و





برای بچوکتریاندا دەژیان. ماریا خۆی لە سوید لەدایک بووبوو، بەڵام لەو کاتەدا دایک و باوکی لە ئەڵمانیادا دەژیان.

ئەو تابڵێیت کەسێکی تایبەتبوو، بەڵام هەتاوەکو زیاتر دەمناسی، زیاتر و زۆرتر هەستم دەکرد کە لە زۆر لایەنەوە لەیەک دەچین. کچێکی قەشەنگبوو، دڵڕاکێش و خۆشمەشرەب بوو، بەڵام هاوکاتیش کەمێک لە تواناکانی منی هەبوو و دەیتوانی خێرا ببێتە برادەر و خەیاڵی لە شتێکەوە بخاتە سەر شتێکی تر. خاوەنی تێگەیشتنێکی پوخت و نایابی فەنتاسیبوو و هەروەکو خۆشم کەسێکبوو کە لەڕادەبەدەر پڕبوو لە ئەندێشە و وێنە و بیرۆکە. کەسێکی نەرم ونیان و دڵناسکبوو، بەڵام تاوناتاوێکیش بێشەرمبوو و هیچ شتێکی ڕەچاونەدەکرد. ماریا یەکەمین کەس بوو کەلە ژیانمدا بینیبێتم و هەستێکی قوڵم بەرامبەری هەبووبێت، وە لەهەمان کاتیشدا حەزیشم کردبێت و توانیبێتیشم قسەی لەگەڵدا بکەم. هەر دەتوت ڕۆحێکین و دابەشکراوین؛ من "ئانیموس" بووم و ئەویش "ئانیما"[18] بوو .

هەر زۆر بە قوڵی کەوتمە عەشقەوە. یەکەمین جارمبوو لە ژیانمدا و هەستیشم نەدەکرد خۆشەویستیەکی ڕوکەش بێت. من لەوەوپێش چەندەها کچم ناسیبوو، بەڕاستی زۆر زۆرم ناسیبوو. خۆشەویستیە گەورەکەم بۆ ماریا لەبەرئەوە نەبوو کە لەوەوپێش کەمم بینیبێت. پێموابێت لەوەوبەر کارم لەوەداکردبوو کە بنچینەیەکی پتەو بنیادبنێم بۆ ئەوەی پەیوەندیەکی ڕاستەقینە و بەگوڕی لەسەر دەستپێبکەم.

[18] 'ئانیمۆس' واتە لایەنی نێرینە لە دەرونی ئافرەتدا و 'ئانیما"ش واتە لایەنی مێینە لە دەرونی پیاودا.





هەر ئەو کاتەی لەسەر چیمەنەکەی "ئوللەڤۆلسیتە" دانیشتبووین، من کەوتمە گێڕانەوەی چیرۆک بۆی. هەستم دەکرد لە چاوما ئەو ڕاستییەی دەبینی کە من پڕبووم لە چیرۆک، لەوە دەچوو هێندە بزانێت کە زۆر بەئاسانی دەتوانێت چیرۆکەکانم پێ بهێنێتە دەرەوە. هەمیشەش دەیزانی چ چیرۆکێکم هەڵبەستووە و چ چیرۆکێکیشم بەڕاستی بەسەرهاتووە. ماریا لە ئایرۆنی و مەرامی ئایرۆنی تێدەگەشت، ئەوەش بنچینەیەکی گرنگی پێکەوە دوانە.

ئەو ڕۆژە هەڵبژاردەیەکی بچکۆلەی باشترین چیرۆکەکانم بۆ گێڕایەوە، بەڵام ماریا تەنها بەوەندە ڕازی نەدەبوو کە گوێم بۆ شل بکات، بەڵکو ڕای خۆشی دەوت و پرسیاریشی دەکرد و چەند ڕوونکردنەوەیەکی زیرەکانەشی بەڕوومدادەدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لەدواجاردا ڕازیدەبوو بەو شێوەیەی کە من کۆتاییم بە چیرۆکەکانم دەهێنا، بەڵام نەک لەبەر بەئەدەبی و دڵڕاگرتنی من بێت، بەڵکو هێندەی بۆ ڕوندەبووەوە کە خۆشی ناتوانێت بەشێوەیەکی باشتر کۆتایی بە چیرۆکەکان بهێنێت. ئەگەر شتێکی قوڕ و بێمانام بوتایە، بە هەموو شێوەیەک هەوڵی دەدا کە ئاماژەی بۆ بکات. بەڵام من هیچ شتێکی قوڕ و تورەهاتم نەوت، هەموو ئەو شتانەی کە ئەو پاشنیوەڕۆیە بۆم گێڕایەوە، زۆر بەباشی بیرم لێدەکردەوە ئەوجا پێم دەوت. ماریاش هەستی بەوە دەکرد، ئەو مندال نەبوو.

دوو بەدوو بەپێ بەرەو "سۆگنسڤان" چووینە خوارەوە. هەستم دەکرد تەنانەت پێویست بەوەش نەکات پێشنیاری ئەوە بکەم کە هەموو پاشنیوەڕۆکە و ئێوارەکە پێکەوە بەسەربەرین. مەست و سەرحاڵبووین،





قولپەمان دەهات و وەک ئەوە وابوو لە ناو کەفی شەمپانیادا مەلە بکەین.

ڕاستە کاتێکی خۆشمان پێکەوە هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەیەکەمین دیدارەوە هەستمکرد ماریاش وەک من بیردەکاتەوە و دەمودەست بەسەربردنی ئەو کاتە نایابە ناکاتە گەرانتیەک بۆ ئەوەی پاشەڕۆژێکمان پێکەوە هەبێت. من خۆم بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا ئامادەبووم بەکچێک بڵێم "پێیدەچێت ڕۆڵێکی گرنگ لەژیانمدا ببینیت و ببیتە تەنها ئافرەتی ژیانم"، بەڵام نەمدەزانی ماریا ئەو ئامادەییەی تێدایە کە من ڕۆڵێکی هێندە گرنگ لە ژیانیدا ببینم یان نا.

کەمێک بەرلەوەی بگەینە "سۆگنسڤان" باران باری. بۆ ئەوەی تەڕنەبین نەختێک لەولا ڕێگاکەوە چووینە ناو "خەلەنگ"[19] ەکانەوە و لەژێر چەند لقێکی گەورەی دارەکاندا وەستاین. دەستم لە ملیەوە ئاڵاند و ئەویش باوەشی پیاداکردم. قایشی پانتۆڵەکەمی کردەوە، ئینجا پانتۆڵەکانمان لەبەری یەکتریدا داکەند. لەپێشدا بەنەرمی دەستمان بەیەکتریدا هێنا و دواتر پرسیارێکم لێکرد و وتم؛ «حەبی دژ بە سکپڕبوون دەخۆیت؟» خەندەیەکی مەکراوی هاتە سەرلێوانی و سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم. پرسیارم لێکردەوە و وتم؛ «بۆ نا؟» ئەوجا پێکەنی و وتی؛ «تۆ ڕاستەوڕاست بەپێچەوانەوە پرسیاردەکەیت» من لە مەبەستی تێنەگەیشتم. ئەوە یەکەمین جارمبوو لەگەڵ ئافرەتێکدا بم کە لێی تێنەگەم. دواتر وتی؛ «بەلامەوە ئاساییە گەر منداڵم ببێت،

[19] جۆرە گیایەکە گوڵی سور و مۆر دەگرێت.





هەر لەبەرئەوەش هیچ جۆرە حەبێک بەکارناهێنم» منیش وتم «تۆ شێتیت».

لەگەڵ ڕەحەتبوونی ئەودا، هەموو شەهوەتەکەم ڕژاندە سەر توتڕەکە مۆرەکە. ماریا دیسان پێکەنیەوە. ئەو دە ساڵ لەو کچانە گەورەتربوو کە من لەوەوپێش لەگەڵیاندابووم. من شەهوەتەکەم بەسەر توتڕکە مۆرەکەدا ڕژاند، چونکە ئەو هیچ جۆرە حەبێکی نەدەخوارد، بەڵام ئەو کارەکەمی بەلاوە ئاساییبوو. دڵنیام پیاوە یەک مەتریەکەش ئەوەی بەلاوە ئاسایی بوو. ئەو لەولاترێکەوە لەژێر بارانەکەدا بەخۆی و کڵاوە کەتانیەکەیەوە وەستابوو و گۆچانە باریکە حەیزەرانەکەی دەستی دەکێشا بە توتڕکەکاندا.

هەموو ڕۆژەکانی حەفتەی دوای ئەوە پێکەوە بووین. یەکەمین جارمبوو کە ئافرەتێک بناسم و هەستبکەم هاوشانی خۆمە. لەوەوپێش کاتێکی خۆشم لەگەڵ کچەکانی تردا دەبردەسەر، بەڵام هەرگیز پێم ناخۆشنەدەبوو کە بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر بەڕێمدەکردن. گەیشتبوومە ئەو ئاستەی کە قینم لە نانخواردنی بێمانای بەیانیانیش دەبووەوە. زۆربەی کچەکان نانخواردنی پێکەوەی بەیانیانیان وەک سەرەتای پەیوەندیەک دەبینی، لەکاتێکدا بەلای منەوە کۆتایی بوو. بەڵام ئەگەر ماریا لەناکاودا لەدوای نانخواردنی بەیانیەوە بەجێی بهێشتمایە، ئەوا بێگومان بیرم دەکرد. لەدڵی خۆمدا دەموت "ڕێک لەبەرئەوەی کە هێندە هاویەکسانی یەکترین، هەرکاتێک بێت لە ژیانمدا دەڕواتە دەرەوە". وام مەزەنەدەکرد کە ماریاش هەروەک من سنورێکی بۆ خۆی دانابێت و بزانێت چ کاتێک دەیەوێت لەگەڵ





کەسێکدا بێت و چ کاتێکیش وای بەباشتر دەزانێت کە تەنها بێت. من تا ئەو کاتەش خۆمم لەسەرو ئەو سنورەوە دەبینیەوە.
هەموو کەرەتێک پاش ئەوەی کە پێکەوە دەخەوتین، مێشکم پڕدەبوو لە ئەندێشەی نوێ و سەرم گێژی دەخوارد، ماریاش هەستی بەوە دەکرد. داوای لێدەکردم ئەو شتانەی بۆ باسبکەم کە بیرم لێدەکردنەوە، منیش چیرۆکێکم بۆ دەگێڕایەوە، زۆرینەی کەرەتەکانیش چیرۆکێکی تەواو نوێبوو و هەرلەکاتی گێڕانەوەیدا دەمهۆنیەوە. تاوناتاوێک هەستمدەکرد بۆیە لەگەڵمدا دەخەوێت، چونکە سور دەیزانی کە دواتر چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشەری ترم بۆ دەگێڕایەوە. من ئامادەبووم بەبێ هیچ دڵەڕاوکێیەک مامەڵەیەکی لەو جۆرە بکەم، بەڵام بە مەرجێک هەردوولامان بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا لەسەری ڕێکبکەوتینایە. هەڵبەتە هیچ کەسێک نەیدەتوانی لۆمەی من بکات و بڵێت بۆچی تۆ بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵ ئەو کچانەدا دەکرد کە لەوەوپێش لەگەڵیاندابوویت، بەهەمان شێوەش کەس نەیدەتوانی سەرزەنشتی ماریا بکات و بڵێت تۆ شتێکی هەڵە بەرامبەر ئەو کوڕە دەکەیت. هەردووکمان وەک یەک وابووین. هەردووکمان وەک یەک بێشەرمانە خۆمان دەدایە دەست پێویستیە سێکسیەکانمان و هەردووکیشمان وەک یەک ساردبووین لە میهرەبانیدا. تێرمان لەیەکتری خواردبوو و تەنها ئەوەندە مابووەوە کە کام یەکەمان لەپێشدا بەئەدەبەوە بڵێت سوپاس تێرمخوارد.
ئێوارەیەکیان لە ئۆپێرابووین و تەماشای نمایشی "ئافرەتە پەپولەکە"مان دەکرد. من دڵم بەوە خۆشبوو کە ماریا حەزی لە "پۆتشینی"بوو. لەهەمان کاتیشدا هەستمدەکرد بازنەیەک کۆتایی پێهاتووە؛ چەند ساڵێک تێپەڕیبوو و دیسانەوە لە ئۆپێرادا



دانیشتبووین و تەماشای نمایشی "ئافرەتە پەپولەکە"مان دەکرد، بەڵام تەنها جیاوازی لەوەدابوو کە لە نێوان بەشی یەکەم و دووهەمدا هیچ کەسێک پێی نەوتیین بۆتان نیە پەرداخێک "سینزانۆ" بکڕن. فێڵ و تەڵەکەی "پینکەرتۆن"یش هەروەک پێشوو خوێناوییبوو و دڵە ناسکەکەی "ئافرەتی ناکازاکی" تێکشکاند، بەڵام ئەو کاتە نە "پۆتشینی" و نە پاڵەوانەکانیشی لەتوانایاندابوو درک بەوە بکەن کە ئەمریکیەکان پاش چەند دە ساڵێک دەگەڕێنەوە و هەموو "ناکازاکی" کاولدەکەن. لەو کاتەدا کە تەماشای ئەو نمایشەمان دەکرد، شەڕەکەی ڤێتنام لەو پەڕی گەرمەیدابوو، پاشانیش لە "ستۆرتۆرگتس گێستگیفەر" دانیشتین و باسی ئەوەمان کرد کە چەندین هەزار "پینکەرتۆن" لە دونیادا هەن _بەڵام پەپولەکان لەوان زیاترن.

*

من سەرم لەوە نەسوڕما کە ماریا لە کۆتایی مانگی هەشتدا وتی پەیوەندیەکەمان تەواوبوو. بەڵام دڵتەنگی کردم. هەستمدەکرد کە بێئەقڵم. هەستمدەکرد وەک ئەو هەموو کچانە ناشیبووم کە لەو بڕوایەدابوون پاش پێنج شەش جار پێکەوە خەوتن ئیدی پەیوەندیەکەمان بەدڵنیاییەوە درێژەدەخایەنێت.

وەک وتم سەرم نەسوڕما کە ماریا لەناکاودا ویستی پەیوەندیەکەمان بپچڕێنێت، چونکە لەماوەی دوایدا چەند جارێک وتی "واملێهاتووە لێت بترسم". تەنانەت گەیشتە ئەوەی کە ڕۆژێک ڕوبەڕوم بووەوە و وتی؛ "ناوێرم سەیری چاوەکانت بکەم". کاتێکیش کە لێمپرسی "بۆ نا؟" ڕوی وەرچەرخاند و وتی "من لەو هەموو چیرۆکانە دەترسم کە بۆم







دەگێڕیتەوە"، ئەو دەیوت "تۆ فەنتاسیایەکت هەیە کە زیاد لەڕادە دەریدەبڕی و منیش لەوە دەترسم". بەڕاستی ئەو هەموو ترس و دڵەڕاوکێیەی واقی وڕماندم. دواتریش وردتریێک بۆی ڕوونکردەمەوە و وتی "هێشتام پێمخۆشە گوێ بۆ چیرۆکەکانت شلبکەم، لەڕاستیدا چیرۆکەکانت نامترسێنن، بەڵام دوودڵم لەوەی بمەوێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ پەیوەندیەکی دڵداریم لەگەڵ کەسێکدا هەبێت کە زیاتر لە جیهانی خۆیدا بژی وەک لەوەی لە هەقیقەتدا بژی". بێگومان بێئەقڵ بووم کە باسی پیاوە بچکۆلەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەوەشم پێوت کە گۆچانێکی حەیزەرانی بەدەستەوەیە، یەک دوو جارێکیش لەماڵەوە پەنجەم بۆ ڕاکێشا و وتم "ئا ئەوەتا لەوێدایە". هەڵبەتە هەمیشە ڕاستگۆیی نایباتەوە.

دواتریش هێندەی پێوتم کە داوای کارێکی کردووە لە سوید، دەیویست لەیەکێک لە مۆزەخانە گەورەکانی سویدا وەک کەسێک کاربکات کە هەستێت بە پاکڕاگرتن و پاراستنی کەلەپوری مۆزەخانەکە.

دواتریش یەکتریمان هەر دەبینی، بەڵام لە حەفتەیەکدا لە یەک دوو جار زیاتر تێنەدەپەڕی. برادەرێکی باشی یەکتری بووین و هەرگیز قسەی ناخۆشمان لە نێواندا نەبوو. ماریا تەنانەت لەدوای جیابوونەوەشمان هەر میهرەبانبوو لەگەڵمدا، منیش هەستمدەکرد واملێهاتبێت وەک ماریا میهرەبانانە ڕەفتار لەگەڵ ئەو کچانەدا بکەم کە لەوەوپێش لەلام مابوونەوە.

بۆ سینەما و شانۆ دەڕۆیشتین، هەندێ جاریش پیاسەی دوورودرێژمان لەناو "نۆرمارک"دا دەکرد. چەند چیرۆکێکی تریشم بۆ گێڕایەوە، لەوەبەدواوە تەنها ئەو کاتانە بۆمدەخوێندەوە کە داوای لێدەکردم،





بەڵام چیتر لەناو توترکە مۆرەکاندا بۆی پاڵنەدەکەوتین. چیتریش لەخانەی قوتابیان لەسەر جێگای خەوەکەی ماریا پێکەوە نەخەوتینەوە. توترکە مۆرەکان پێگەیشتبوون. من بیری لەش ولاری ماریام دەکرد.

ئێوارە درەنگانێکی گەرمی هاوین لەسەر پارچە زەویە درێژکۆلەکەی بەردەم "فرۆگنەرسێتەر"دا دانیشتبووین، چیرۆکێکی دورودرێژم دەربارەی یاریەکی شەترەنج بۆ گێڕایەوە کە داشەکانی مرۆڤی ڕاستەقینەبوون. بەهۆی ئەوەشەوەبوو کە کەمێک لەووبەر لەگەڵ ژن و مێردێکی "سکۆتلەندی"دا قسەمان کرد، ئەوان ئاماژەیان بۆ ئاوەدرەکەی ئۆسلۆ کرد و وتیان نەرویج لە سکۆتلەندا دەچێت. من لە کاتی گێڕانەوەدا چیرۆکەکەم دەهۆنیەوە؛ کۆمەڵێک کەسایەتی زۆری تێدابوو و ماریاش بەتایبەتی سەری لەوە سورمابوو کە توانیم بەبێ گرفت ئەو هەموو ناوە سکۆتلەندیانەم لەیادبێت. بنچینەی دارشتنی چرۆکەکە تاڕادەیەک وەک ئەم شێوەیەی خوارەوەبوو؛

"لۆرد هامیلتن" لە تەمەنێکی گەنجدا ببووە بێوەپیاو و لەکێڵگەیەکی گەورەی سەر بەرزاییەکانی سکۆتلەندادا دەژیا. هەر لەسەردەمی منداڵیەوە خولیای شەترەنجبوو و یاریکەرێکی لێهاتووبوو. لەکاتێکیشدا کە حەزیدەکرد کاتێکی زۆر لەناو باخچە گەورەکەی پشت بینا سەرەکیەکەی کێڵگەکەدا بەسەربەرێت، یاریەکی شەترەنجی گەورەی لەوێدا دروستکردبوو، ڕێک لەپانتاییە کراوەکەی نێوان پەرژینە بڕدراوە پێچاوپێچەکان و دەریاچە دەستکردەکەدا دایمەزراندبوو کە پڕبوون لە سورەماسی. تەختی شەترەنجەکەی لە 64 کاشی مەڕمەڕی ڕەش و سپی دروستکردبوو و ئەندازەی هەر





یەکەیان دوو یارد بە دوو یاردبوو، داشی شەترەنجەکەشی لە تەختە داتاشیبوو و ئەندازەشیان بەپێی نرخ و جۆری داشەکان لە دوو "پێ"وە بۆ سێ پێ دەبوون. ئێوارە درەنگانێکی هاوینان خزمەتکارانی کێڵگەکە لەبەردەم پەنجەرەکانەوە دەوەستان و تەماشای "لۆرد"یان دەکرد، ئەو لەسەر کاشیە مەڕمەڕەکە دەخولایەوە و داشە گەورەکانی دەجوڵاند. جاری واش هەبوو لەسەر کورسیەکی باخەکە بۆی دادەنیشت و پاش کاتژمێرێک هەڵدەسایەوە و داشێکی تری دەجوڵاند.

"لۆرد"ەکە زەنگۆڵەیەکی گەورەی هەبوو و هەر کاتێک بیویستایە سەرۆکی خزمەتکاران سینیەک ویسکی و ساردی بۆ بهێنێت، زەنگێکی بۆ لێدەدا. سەرۆکی خزمەتکاران جارجارێک پێی دەوت "گەورەم کاتی ئەوە نەهاتووە بێیتەوە ژورەوە؟" بەڵام تەنها لەبەرئەوە لێیدەپرسی چونکە بەڕاستی خەمخۆری تەندروستی بوو و لەلایەکی تریشەوە لەوە دەترسا ڕۆژێک لە ڕۆژان حەسرەت و مەراقی لەدەستدانی ژنەکەی و خولیای بەتینی یاریکردنی شەترەنج شێتی بکات. ئێوارەیەکیان سەرۆکی خزمەتکاران زیاتر ترسی لێنیشت، چونکە "هامیلتن" داوای لێکرد بچێتە سەر تەختی شەترەنجەکە و شوێنی ئەسپێکی ڕەش پڕبکاتەوە، لەبەرئەوەی ئەو پێشنیوەڕۆیە ئەسپێکی ڕەشی بەر هەورەتریشقەیەکی توند کەوتبوو و بەمەبەستی چاککردنەوەی ناردبوویان بۆ وەرشە. بۆ ماوەی دوو سەعاتێک ناچاربوو لەسەر تەختی شەترەنجەکە بوەستێت و لەماوەی یاریەکەدا تەنها چەند جارێکی کەم "لۆرد" هاتە سەر کاشیە مەڕمەڕەکان و جوڵانی، ئەویش یان دوو خانە پاڵی پێوەدەنا بۆ پێشەوە و خانەیەکیش بەلادا یان خانەیەک دەیهێنایە دواوە و دوو خانە بەلادا دەیبرد. تا دواجار فیلێکی سپی کوشتی و توانی بڕواتەوە ماڵەوە، ڕاستە لەهەمان کاتدا

پەستیشبوو و سەرماشی بوو بەڵام ئەو کاتە یاریەکە هێشتام چەند سەعاتێکی تری مابوو تەواوبێت، لەبەرئەوە گەلێ دڵی بەوە خۆشبوو کە وا زوو ڕزگاریبوو.

کاتێک کە "لۆرد" یاری دەکرد، مەحاڵبوو کەس بزانێت کە لایەنگری سپیەکانە یان ڕەشەکان. چونکە لەڕاستیدا تا ئەو پەڕی توانای بەباشی یاری بۆ هەردوو ڕەنگەکە دەکرد، ئەو لە هەمان کاتدا یاری بۆ خۆی و لەدژی خۆشی یاری دەکرد، بەو شێوەیەش جگە لەو کاتانەی کە یاریەکەی یەکسان دەوەستایەوە، هەموو یاریەکی دەبردەوە و هاوکاتیش دەیدۆڕاند. زۆرجاریش ڕوویدەدا هەموو داشەکانی بەئەسپایی لەسەر تەختی شەترەنجەکە لادەبرد و دەیخستنە سەر چیمەنە پان و بەرینەکە. دواتریش بۆ ماوەی چەندین سەعات دادەنیشت و لە کاشیە مەرمەڕەکان ورد دەبووەوە، خەڵکانی تری کێڵگەکەش دەیانوت "ڕاستە هیچ داشێک لەسەر تەختی شەترەنجەکەدا نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هێندە توانای هەیە کە بیانبینێت"، هەروەها دەیانوت "بەبێ ئەوەی لەسەر کورسیەکەی هەڵبسێت گەیشتۆتە ئەوەی کە بتوانێت یاری لەگەڵ خۆیدا بکات".

بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سەرۆکی خزمەتکاران هەتا ئەو پەڕی توانای هەوڵیدەدا وا لە "لۆرد" بکات بیر لەشتێکی جیاوازبکاتەوە و سەرنجی لەسەر داش و شەترەنج لابەرێت، ئێوارەیەکیان پێشنیاری کرد کە "هامیلتن" ئاهەنگێکی باخچە سازبکات، هەروەکو ئەو کاتەی کە هێشتام ژنەکەی مابوو. "هامیلتن" بەشێوەیەکی گشتی حەزیدەکرد بەتەنها بێت، بەڵام ئەو ئێوارەیە یەکێک بوو لە ئێوارە دەگمەنانەی کە "لۆرد" پێکێک ویسکی بۆ سەرۆکی خزمەتکاران تێکرد و پێکەوە لەبەردەم دەریاچە پڕ لەسورەماسیەکەدا دانیشتبوون، سەرو









پەرداخێک ویسکیان بەدەستەوە گرتبوو و بەدەستەکەی تریشیان سیگارێک. "لۆرد" بۆ ماوەی یەک دوو چرکەیەک بێدەنگ دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە جوڵەی سورەماسیەک، بەڵام دواتر ڕوی لە سەرۆکی خزمەتکاران وەرچەرخاند و وتی "پێشنیارەکەتم بەدڵە بەڵام بەمەرجێک ئاهەنگێکی ڕوبەندپۆشی بێت".

لەماوەی چەند کاتژمێرێکی داهاتودا لیستەی ناوی میوانەکانیان نوسی، هەر ئەوەندەی "هامیلتن" وتی دەبێت 31 کەسی ڕێک بانگبکرێت، یەکسەر شێوە نیگەرانیەک کەوتە سەر سیمای سەرۆکی خزمەتکاران، چونکە زۆر باش دەیزانی کە 32 داش لە یاری شەترەنجدا هەیە، هەروەها هێشتام هێندە بەسەر ئەو کاتەدا تێنەپەڕیبوو کە خۆی بۆ ماوەی دوو سەعاتێک ناچاربوو لەسەر تەختی شەترەنجەکە بوەستێت و "لۆرد"یش بەوپەڕی هەست ساردیەوە چێژی لە یاریەکەی دەبینی. "لۆرد" خۆشی ئەو ڕاستیەی نەدەشاردەوە کە یەکێک لە مەبەستەکانی ئەو ئاهەنگە ڕوبەندپۆشیە یاریەکی شەترەنجە و دەیەوێت بە مرۆڤی ڕاستەقینە بیکات، هەڵبەتە وتی لەپاش نانخواردنەوە دەتوانین ئەو یاریە بکەینە جۆرە بەزم و خۆشیەکی ئێوارەکەمان. چەند ڕۆژێک پاشئەوە کارتی دەعوەتنامەکانیان نوسیەوە. تیایدا هاتبوو کە دەیانەوێت لە کێڵگەی "هامیلتن"دا ئاهەنگێکی ڕوبەندپۆشی شەترەنج سازبکەن، لەبەرئەوە داوایان لە میوانەکان کردبوو کە هەریەکەیان جلوبەرگی وەک پاشا و شاژن[20] و قەڵا و فیل و ئەسپ و جوتیار[21] بپۆشن. ئەو جوتیارانەی

[20] لە زمانی دانیمارکیدا بە وەزیری شەترەنج دەڵێن 'شاژن'.

[21] بە هەمان شێوە لێرە بە سەربازی شەترەنج دەوترێت 'جوتیار'.



(سەربازانەی) کە بانگکرابوون، هەر بەڕاستی جوتیاری ئەو ناوچەیە بوون، هەشت جوتیار و ژنەکانیان بانگکردبوو، وە ئەوانی تریش کە دەبوایە وەک داشەکانی تر جلیان بپۆشیایە کەسانی وەک سەربازی سوپا و خەڵکانی خاوەن پلەوپای بەرز و نوێنەرانی بەگزادەکان و ئەرستۆکراتی بوون.

سەرۆکی خزمەتکاران سەری لەوە نەسوڕما کە سەرتاپای کەسە بانگکراوەکان بە سوپاسەوە ڕازیبوون ئامادەی ئەو ئاهەنگەبن، چونکە هەرچەندە "لۆرد هامیلتن" لەو چەند ساڵەی دواییدا کەسێکی پەست و ساردبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوی خۆی و ماڵەکەشی ڕێزێکی تایبەتی هەبوو لەناو خەڵکیدا. تەنها "دۆک"ی ناوچەی "ئارگیول"، داوای لێکرابوو وەک پاشا خۆی بگۆڕێت، جگە لەو پلەی "لۆرد" لە هەموو ئەو کەسانە بەرزتربوو کە بانگکرابوون. بەلای جوتیارەکانەوە بانگکردنیان بۆ میوانی "هامیلتن" هەر خۆی بۆ خۆی جەژنێک بوو و بۆنەکەش هەر مەزەندە نەدەکرا، چونکە لەدەرەوەی تەختی شەترەنجیشدا کۆمەڵێک یاسای نەگۆڕ و چەسپاو لەنێوان چینە جیاوازەکاندا هەبوو.

ئاهەنگەکەیان خستبووە ئێوارەی ناوەڕاستی هاوینەوە، بەڵام چەند حەفتەیەک بەرلەوە لە هەموو ناوچەکەدا تەنها باس باسی ئەو ئاهەنگی ڕوبەند پۆشیەبوو. یەک دوو ڕۆژێک بەر لە ئاهەنگەکە یەکێک لە جوتیارەکان بەهۆی نەخۆشیەک لە خێزانەکەیاندا پێیڕاگەیاندن کە ناتوانێت ئامادەبێت، بەڵام لێی ئاسانتر نەبوو کە جوتیارێکی تر و ژنەکەی لەبری ئەوان بدۆزنەوە کە ئامادەی ئەو ئاهەنگە گەورەیەبن. جوتیارێکی زۆر لەو ناوچەیەدا هەبوون و پێویستیشی نەدەکرد هێندە خەریکی جل و پۆشاکی تایبەتی بن بۆ





ئاهەنگەکە، تەنها ئەوەندە بەسبوو کە بەجل و بەرگی ئاسایی خۆیانەوە ئامادەبن.

ڕۆژی ئاهەنگ هات و هەر لە کاتی نانخواردندا میوانە جیاوازەکان چەندەها ناسیاو و برادەرایەتی نوێیان پێک هێنا. بۆ پاش نیوەڕۆش کێک و قاوەیان لە باخچەکەدا بۆ میوانەکان دانا. دوای ئەوە هێندەی پێنەچوو "لۆرد هامیلتن" زەنگێکی بە زەنگە گەورەکەی لێدا و داوای لە میوانەکانکرد کە گوێی بۆ شلبکەن. هەموویان دەیانزانی کە پاش نەختێک دەبێت یاریەکی شەترەنج لەسەر کاشیە مەرمەڕەکان سازبکرێت و میوانەکانیش وەک داشی ڕاستەقینە ڕۆڵ ببینن، بەڵام بەرلەوە دەبوایە "لۆرد" شوێنی هەر دانەیەکیانی لەسەر تەختی شەترەنجەکە دیارییکردایە.

لەکاتی قاوەڵتیەکەدا تابڵێیت بەشێوەیەکی نارەسمیانە دانیشتبوون، بەلایەنی کەمەوە دانیشتنەکەیان هەر زۆر هەرەمەکی بوو، بەڵام لەسەر تەختی شەترەنجەکە بەو شێوەیە نەبوو. لەپێشدا "لۆرد" جوتیارەکانی (سەربازەکانی) لەسەر تەختی شەترەنجەکە دانا، هەشت پیاو و هەشت ژن بوون. "ماکلین"ی جوتیار وەک سەربازێکی سپی شوێنی "a2"ی بەرکەوت، ژنەکەشی ڕێک بەرامبەری لە خانەی "a7"دا دانا. لەلای ڕاستیەوە "ماکدۆناڵد"ی خانمی لەسەر خانەی "b2" دانا، ئەویش ڕێک بەرامبەر مێردەکەی بوو کە وەک سەربازی ڕەش لەسەر خانەی "b7" وەستابوو. مەبەست لەو شێوەی دانانە ئەوە بوو کە هەموو ژن و مێردەکان بتوانن لەسەر تەختی شەترەنجەکە چاویان لەیەکتری بێت، جگەلەوەش هەموو ژن و مێردێک دەیتوانی چاوێک لەسەر یەکتری دابنێن و بزانن مێردەکانیان یان ژنەکانیان





چۆنچۆنی لەگەڵ ژن و پیاوەکانی ئەملاولایاندا ڕێکدەکەون. ڕێک بە هەمان شێوەش ئەندامانی تری یاریەکەی دانا. "ماک لاکلان"ی بەڕێوەبەری پۆلیس لەسەر خانەی "b1" ئەسپی سپی بوو و لەپشت ژنەکەی "ماکدۆناڵد"ەوە بوو، هەروەها ژنەکەی خۆشی لەسەر خانەی "b8" ئەسپی ڕەش بوو و لەپشت "ماکدۆناڵ"دەوە وەستابوو کە لەسەر خانەی "b7" بوو. شانزە پیاو و شانزە ژن لەسەر تەختی شەترەنجەکەبوون، بەسەر دوو تیپدا دابەشکرابوون و هەر هەمووشیان بەرامبەری ژن یان مێردەکەی خۆیان وەستابوون. تەنها حاڵەتێک کە ئەو هاوشێوەیەی دەشکاند شوێنی پاشا و شاژن بوو. "لۆرد هامیلتن" خۆی وەک پاشای سپی خانەی "e1"ی گرتبوو، ژنی "دۆک"یش وەک شاژنی سپی لەلای چەپیەوە لەسەر خانەی "d1" بوو، "دۆک"ی "ئارگیول"ی مێردیشی وەک پاشای ڕەش لەسەر خانەی "e8" بوو. بەڵام خۆ ژنەکەی "هامیلتن" لەنێوانیاندا نەبوو، هەر لەبەرئەوەش "هامیلتن" ژنێکی بێوەژنی بەناوی خانمی "ماک کوین"ەوە لەسەر خانەی "d8"دا وەک شاژنی ڕەش دانابوو. ئەو لەوەوپێش چەند جارێکی کەم قسەی لەگەڵ ئەو ئافرەتە بێوەژنەدا کردبوو، ئەویش ئەو جارانە بوو کە لە ناوشاردا یان لەسەرقەبراندا بینیبووی، بەڵام دڵیشی بۆی لێدەدا.

تەنها پاشاکان دەسەڵاتیان بەسەر داشەکاندا هەبوو و ئەوان بڕیاریان دەدا بۆ چ شوێنێک و بە چ شێوەیەک بجوڵێن، هەموو میوانەکانی تری ئەو یاریە ڕەسمیە لە کۆمەڵێک ئەکتەری بێ ڕۆڵی سەر شانۆیەک زیاتر لە هیچی تر نەدەچوون. "لۆرد هامیلتن" بەئاشکرا پێیوتبوون کە یاری شەترەنجەکە لەوانەیە درێژە





بخایەنێت، وتبووی پێدەچێت تابەرەبەیانیش تەواونەبێت، چونکە "دۆک" و خۆی هەردووکیان یاریکەرێکی لێهاتووی شەترەنجبوون. بەڵام لەلایەکی تریشەوە مەبەست لەوەبوو کە یاریەکی بەکۆمەڵی ئاوها بێت کە هەموو بەشداران بوارێکی باشیان بکەوێتە بەردەست و بتوانن یەکتری بناسن. هەموو داشێک ڕۆحێکی زیندوو بوو و داوایانلێکرابوو لەو کاتانەدا کە چاوەڕواندەبن "دۆک" یان "لۆرد" بیانجوڵێنێت، هەتا ئەوپەڕی ڕادە کاتێکی خۆش لەگەڵ یەکتریدا بەسەربەرن. دواتریش کە بەشداران دەکوژران و لە یاریەکە دەکرانە دەرەوە، بۆیانهەبوو بەشێوەیەکی ئاسایی لە باخچە گەورەکەدا پێکەوە بن.

"لۆرد هامیلتن" یاریەکەی کردەوە و فەرمانی بە سەربازی سپی "e2"دا کە "ماک ئاوتەر"بوو دوو خانە بچێتە پێشەوە و لەسەر خانەی "e4"دا بوەستێت، "دۆک"ی "ئارگیول"یش لەوەڵامیدا ژنی "ماک ئاوتەر"ی دوو خانە بردە پێشەوە لە خانەی "e7"ەوە بۆ خانەی "e5" و ئیدی یاریەکە دەستیپێکرد. سەرۆکی خزمەتکاران، کە لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری تەختی شەترەنجەکە هاتوچۆی دەکرد و خواردنەوەی بۆ ئەو میوانانە دەبرد کە داوایاندەکرد، باشترین شاهیدی ئەو ڕوداوانەبوو کە ڕویاندەدا. ئەو خۆی هێندە زۆر گرنگی بە یاری شەترەنج نەدەدا، بەڵام زۆر بەمەبەستەوە سەرنجی دەدا بە گرژی بەردەوام و بەگوڕی سەر کاشیە مەڕمەڕەکان. لێرەدا تەنها تیشک دەخەینە سەر یەکێک لەو درامایانە، بەڵام لە هەمووشیان گرنگتر بوو.

"ماری ئان ماک کێنزی" ئافرەتێکی لە ڕادەبەدەر قەشەنگبوو و تەمەنی لە ناوەڕاستی بیستەکاندابوو. لەسەر تەختی شەترەنجەکە وەک سەربازی سپی لەسەر خانەی "d2" دانرابوو و بەرامبەر پیاوەکەی "ئاین ماک کێنزی" وەستابوو کە لەسەر خانەی "d7"دابوو.





"ئاین" چەندەها ساڵ لەو پیرتربوو و هەمووان دەیزانی کە کەسێکی مێباز و هەوەستبازە. تەنانەت لەدوای ئەوەی کە "ماری ئان"ی هێنابوو، چەندەها دڵداری هەبوو، لەسەرو ئەوەشەوە کۆمەڵێک ئافرەتی مێردداری ناوچەکەشی فریودابوو، یەک دوو دانەیان ئەو ئێوارەی هاوینە لەسەر تەختی شەترەنجەکەی "لۆرد" وەستابوون و شەرابی شیرینیان دەنۆشی.

بەدرێژایی چەندەها ساڵ هەموو خەڵکانی دەڤەرەکە بەزەییان بە "ماری ئان"ی جوان و نازداردا دەهاتەوە. هەرچی دەربارەی "ماک کێنزی"یش بوو دەیانوت نەک تەنها خیانەت لە ژنەکەی دەکات، بەڵکو لەماڵیشەوە وەک دیکتاتۆرێک بەسەریدا زاڵە. بەو شێوەیەش دوو کەسبوون کە بەتەواوەتی پێچەوانەی یەکتریبوون. خەڵکی دەیانوت لەوانەیە "ماری ئان" جوانترین ئافرەتی بەرزاییەکانی سکۆتلەندا بێت. جوانی و نازداریەکەی لەڕادەبەدەربوو، هیچ زیادەڕۆییەک نیە گەر بڵێین هەموو کەسێک کە دەیبینی یەکسەر ئاشقی دەبوو، ئەو شتەش تەنها ئەو پیاوانەی نەدەگرتەوە کە دەیانبینی. شتێکی سەیر لە "ماری ئان"دا هەبوو کە ئافرەتیشی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا، چەندەها ئافرەت بەدەمی خۆیان دەیانوت شەوانە خەومان لێزڕاوە و بە ئەڤینەوە بیرمان لەو کردۆتەوە.

"ئاین" کەسێکی تێکدەربوو و لەو ماوەیەدا شیرازەی چەند خێزانێکی ناوچەکەی تێکدابوو، بەڵام ئەو پارادۆکسە "ماری ئان"ی نەدەگرتەوە. چونکە کاتێک ژن و مێردێک لە کێڵگەیەکدا هەمان کەس سەرنجی ڕادەکێشان، بەردەوامدەبوون لەسەر خۆشەویستی یەکتری، بەو شێوەیەش لەڕاستیدا ئەو ئافرەتە ئەفسوناویە پەیوەندی نێوانیانی پتەوتردەکرد. لەوانەیە لێرەدا لەشوێنی خۆیدا بێت کە زیاتر



ڕونیکەینەوە و بڵێین پاشئەوەی ژن و مێردێک پێکەوە ئارەزوی لەشولاری "ماری ئان"یان دەکرد، هەرئەوە خۆی بۆ خۆی دەبووە هاندەرێک کە خۆشەویستی جەستەیی نێوانیان خرۆشبگرێت.

ئەو ئێوارەیە لە یاری شەترەنجەکەی "هامیلتن"دا، "ماری ئان" یەکەمین داش بوو کە کوژرا. ئەو هەر لە سەرەتاوە بۆ خۆی بەسەربەستی لە باخچە گەورەکەدا دەهات و دەچوو، بەناو پەرژینە پێچاوپێچەکانیشدا ڕۆیشت و پارچە کێکی بۆ ماسیەکانی ناو دەریاچە دەستکردەکەش هەڵدا. بەئاشکرا دیاربوو کە "ئاین" ئەو سەربەستیەی ژنەکەی بەدڵنەبوو کە هەر لەسەرەتای یاریەکەوە پێیبەخشرا. زۆر بەوریاییەوە بەردەوام چاوێکی لەسەر ژنەکەی بوو.

دووهەم کەسیش کە ڕێگەی پێدرا کاشی مەرمەڕەکان بەجێبهێڵێت، "ئایلین ماک براید"بوو کە وەک سەربازێکی ڕەش لەسەر خانەی "g7"دا وەستابوو. "ماری ئان" زۆر مەستبوو، مەستی ئەو باخچە گەورەیە و جوانی ئەو ئێوارەی هاوینە و ئەو هەموو شەرابە شیرینەبوو کە خواردبوویەوە، هێندە مەستبوو یەکسەر دەستی ژنەکەی "ماک براید"ی گرت و لەسەر چیمەنە پان و بەرینەکە کەوتە سەماکردن لەگەڵیدا. هێندەی پێنەچوو هەردووکیان شان بەشان ڕایانکردە ناو پەرژینە پێچاوپێچەکانەوە، چەند کەسایەتیەکی سەر تەختی شەترەنجەکە بەئاستەم چاویانلێبوو کە "ماری ئان" و "ئایلین" یەکتریان ماچدەکرد و دەستیان بەیەکتریدا دەهێنا. "هامیش ماک براید"یش چاوی لێیانبوو لەناو پەرژینەکەدا چی دەکەن، بەڵام پێی خۆشبوو کە ژنەکەی لەگەڵ "ماری ئان"دایە، چونکە کەسێکی بەخیل نەبوو و سوریش دەیزانی ئەگەر هەمان هەل بۆ خۆی هەڵبکەوتایە، ئەوا بێ سێ و دوو هەمان شتی دەکرد. ماوەیەکی زۆر



تێپەڕی و ئینجا چەند میوانێکی تر توانیان کاشیە مەڕمەڕەکە بەجێبهێڵن.

لەڕاستیدا ئەمە چیرۆکێکی زۆر ئاڵۆزە و چەندین جاریش کەوتە بەر لێشاوی سەرنج و تێبینی و شیکردنەوە. بەڵام لێرەدا هەتا بکرێت بە کورتی و بە پوختی دەیخەمە ڕوو.
ئەو شەوە بوو بە شەوێکی ئەفسوناوی و فریودان. هەموو میوانەکان هەستیاندەکرد پەری و فریشتەی خۆشەویستی دەسەڵاتی تەواویان بەسەر ئەو شەوەی ناوەڕاستی هاویندا گرتبێت. "لۆرد" و "دۆک" زیاتر و زۆرتر سەرنجیان دەخستە سەر یاریەکەیان، خەریکبوو نەختە نەختە بەرەو کۆتایی دەچوو. هێندەی نەبرد و باخچەکە پڕبوو لە میوانی خەیاڵاوی کە ڕزگاریانبوو بوو لە کاشی مەڕمەڕەکە. هەمووان لەدەوری "ماری ئان" خڕبووبوونەوە. تەنانەت ئەو کەسانەش کە هەرگیز لەوەپێش نەیانبینیبوو لەدەوری کۆبووبوونەوە، کەسانی پلەبەرز و ژنەکانیشیان بەکۆمەڵ بەهەستێکی پڕ لەجۆش و خرۆشەوە بەدەوریدا دەخولانەوە.
"ماری ئان" بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا هەستیدەکرد بەتەواوەتی خۆی خۆیەتی و بەمانای وشە سەربەستە، هەستیدەکرد دەتوانێت بەلێشاو خۆشەویستیە لەبن نەهاتوەکەی بەسەریاندا ببارێنێت، وە هەرچەندە تەنانەت یەک زەڕە خوێنی پیسی لەدەماردا نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی خۆشبوو کە "دۆک" هێشتام "ئاین"ی مێردی لەسەر کاشیە مەڕمەڕەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەجوڵێنێت. چونکە هەتاوەکو ئەو کاتەی "دۆک" ی "ئارگیول" کش ماتی لە "لۆرد هامیلتن" کرد، "ئاین ماک کێنزی" لەسەر تەختی شەترەنجەکە





مایەوە، ئەو کاتەش ڕێک پێش کازیوەبوو. بێگومان زۆر ڕێیتێدەچوو "ماری ئان" لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوەیان بەهۆی هەڵسوکەوتەکانیەوە سزابدرێت، بەڵام لەوێدا هێندە دوری نەیدەڕوانی. ئەو بیری لەو هەموو ساڵەش دەکردەوە کە "ئاین" خیانەتی لێکردبوو و بڕوای بە جۆرە هەقانیەتێکیش هەبوو لە ژیاندا.
ئەو شەوە هێشتام هەر شەوی خۆی بوو.
لەگەڵ زیاتر بەتاڵبوونی تەختی شەترەنجەکەدا، ئاهەنگی باخچەکە زیاتر و زۆرتر شێوازێکی بێشەرمانەی پێوە دیاربوو، دواتریش وابڵاوبووەوە کە "ماری ئان" ئەو شەوە هیچ میوانێکی باخچەکەی لە خۆشەویستی خۆی بێبەری نەکردبوو. "ئاین ماک کێنزی"ش ناچاربوو لەسەر کاشیە مەڕمەڕەکە بەئارامی بمێنێتەوە و لەوێوە تەماشای ژنەکەی بکات کە ببوە شاژنی ئاهەنگەکە، ژنەکەی ببوە شتێک کە هەمووان ئارەزومەندیبوون، "ماری ئان" ئەو شەوە زیاد لەڕادە ئامادەبوو لەگەڵ هەمووان‌دا خۆی فڕێباتە ناو یاریەکی جەستەییەوە.
"ئاین ماک کێنزی"ش بەشێوەیەک لە شێوەکان لەسوچێکدا بەتەنها و بێدەسەڵات مابووەوە. بەهیچ شێوەیەک نەیدەتوانی هیچ شتێک بکات، بێگومان ئەگەر پێش تەواوبوونی یاریەکە داوایبکردایە تەختی شەترەنجەکە بەجێبهێڵێت، ئەوا ئەو کارەی دەبووە مایەی شەرمەزاریەکی زۆر، وەک ئەوە تەماشادەکرا کە میوانداریەکەی "هامیلتن" ڕەتبکاتەوە. تەنها ئەوەندەی پێدەکرا کە زوو زوو دەست بۆ سەرۆکی خزمەتکاران بەرزبکاتەوە و داوای لێبکات پەرداخە ویسکیەکەی دەستی بۆ پڕبکاتەوە. پاش ماوەیەکی کەمیش چیتر نەیدەتوانی وەک پێشتر بەئارامی بوەستێت، بەڵام هێشتام بەدەم خواردنەوەوە دەیتوانی "ماری ئان" ببینێت، ئەو بەدەم قاقای





پێکەنینەوە هەر کەڕەتەی لەگەڵ ئافرەتێک یان پیاوێکی نوێدا یان لەگەڵ دوو ژن و مێردی تردا ڕایدەکردە ناو پەرژینە پێچاوپێچەکەوە. ئەو شەوە بەخیلی لە باخچەکەی "لۆرد"دا بوونی نەبوو. هەمووان "ماری ئان"یان خۆشدەویست، بەو شێوەیەش بەجۆرێک لە جۆرەکان هەمووان یەکتریان خۆشدەویست.

هەر ڕێک پاش ئەوەی "لۆرد هامیلتن" ناچاربوو دان بەوەدابنێت کە "دۆک"ی "ئارگیول" کش ماتی لێکردووە و یاریەکەیان بەتەوقەکردن لەگەڵ یەکدا کۆتایی پێهێنا، خێرا "ئاین ماک کێنزی" خۆی گەیاندە باخچەکە بۆ ئەوەی ژنەکەی بدۆزێتەوە. دواتر لەسەر چیمەنەکەدا چاوی پێکەوت، لەوێدا "ماک ئیڤەر" و ژنەکەی باوەشیان پێداکردبوو، بەلای خۆیدا ڕایکێشا و یەک زلەی توندی لە ڕومەتی دا. لەماوەی چەند چرکەیەکدا زیاتر لە دە سەرباز و کەسایەتیە پلەبەرزەکانی تری یاری شەترەنجەکە چواردەوریاندا، "ماک لاکلان"ی بەڕێوەبەری پۆلیسیش، کە لە یاریەکەدا دەوری ئەسپێکی سپی دەبینی، یەکسەر گرتی.

ئەو بەیانیە "ماری ئان" کێڵگەکەی "هامیلتن"ی بەجێنەهێشت. بێگومان بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆلای "ئاین"ی مێردی، لەکاتێکیشدا کە "لۆرد" بەڕاستی پێویستی بەئافرەتێک بوو کە کاروباری ماڵەکەی بۆ ڕاپەڕێنێت، داوای لێکرد لە کێڵگەکەیدا بمێنێتەوە و هەر لەوێشدا بژی.

"هامیلتن" سەرتاپای هەموو داش جوڵاندنەکانی یاری شەترەنجەکەی لەیادبوو کە لەگەڵ "دۆک"ی "ئارگیول"دا کردی، بەڵام هەر بۆ دڵنیاییش هەمووی نوسیەوە، چونکە دەیویست بەوردی لێی بکۆڵێتەوە





و ڕێک پەنجە بخاتە سەر ئەو هەڵەیەی کە دواتر وایلێکرد یاریەکە بدۆڕێنێت. بەردەوام لە باخچەکەدابوو و جوڵە لەدوای جوڵەی یاریەکەی لەسەر کاشیە مەرمەڕەکە دوبارە دەکردەوە. جارجارێکیش "ماری ئان" لەبەردەم دەریاچەی سورە ماسیەکاندا لەسەر کورسیەک دادەنیشت و قسەی لەگەڵدا دەکرد.

بۆ ماوەیەک بەپەرۆشیەوە باس باسی ڕوداوەکانی ئەو شەوەی ناوەڕاستی هاوین بوو کە لە کێڵگەکەی "هامیلتن"دا ڕویاندا، کەسیش لۆمەی "ماری ئان"ی نەدەکرد کە لە دواجاردا تۆڵەی خۆی لە "ئاین" سەندەوە و هەقی ئەو هەمووساڵە تاڵانەی لێکردەوە کە لەگەڵیدا بەسەریبردبوو. بەڵام ئەگەر ئەو شەوە فریشتە و پەری خۆشەویستی دەستیان بەسەر باخچەکەی "هامیلتن"دا کێشابووبێت، ئەوا دوای یاریەکە بوونەوەری ڕەش و فریشتەی مەرگ دەستی بەسەر ناوچەکەدا کێشا. هەر پاش ماوەیەکی کەم زنجیرەیەک کوشتنی دڕندانەی یەک لەدوای یەک لە دەڤەرەکەدا ڕوویدا، لەگەڵ کوشتنی سێهەم کەسدا، "ماک لاکلان"ی بەڕێوەبەری پۆلیس هێندەی بۆ دەرکەوت کە هەموو کوژراوەکان ئەو میوانانە بوون کە ئەو شەوەی ناوەڕاستی هاوین لەسەر کاشیە مەڕمەڕەکەی "هامیلتن" بوون. لەپاش کوشتنی پێنجهەمین کەسەوە، سەرۆکی خزمەتکاران لە کێڵکەگەی "هامیلتن"دا چاوی بە بەڕێوەبەری پۆلیس کەوت و پێیوت هەموو کوژراوەکان کتومت هەروەک چۆن میوانەکانی "لۆرد" لە یاریەکەدا یەک لەدوای یەک لەسەر تەختی شەترەنجەکە کوژران، ئاوهاش ڕێک یەک بەدوای یەکدا کوژراون. ئەوانەش کە تا ئەوکاتە کوژرابوون، دوو جوتیار و دوو فیل و ئەسپێک بوون. ئەو شێوە سیستمی کوشتنە تەنها یەک کەسی نەدەگرتەوە؛ "ماری ئان ماک کێنزی"، ئەو یەکەمین کەسبوو کە ئەو





شەوەی ناوەڕاستی هاوین لەیاریەکەدا کوژرا و ڕۆیشتە ناو باخچەکەوە. "ماک لاکلان"، کە هەرگیز "ماری ئان"ی ناسک و نۆڵی لەبیرنەدەچووەوە، گرنگیەکی زۆری بەو خاڵە دەدا. ئەو بەئاسانی لەوە تێدەگەیشت کە پیاوکوژە دڕندەکە بۆچی ئەو کچە نەرم و نیانە گەنجەی نەکوشتووە. هاوکاتیش لەدڵی خۆیدا دەیوت "بێگومان دۆزینەوەی هۆی کوشتنەکانیش هەر زۆر ئاشکرایە، چونکە پیاوکوژەکە _یان پیاوکوژەکان_ دەیەوێت هەموو ئەو خەڵکانە لەسەر ڕێگاکەدا بسڕێتەوە کە بەربەرەکانێ لەسەر خواژنی قەشەنگ دەکەن و دەیەوێت بۆ خۆی ببێت. لێرەشەوە چەندەها کەس لەبەردەستابوون کە جێگەی گومان بن.

کوشتنی شەشەم و حەوتەمیش ڕوویدا، دیسانەوە ڕێک لەسەر هەمان شێوەی ترسناکی یەک لەدوای یەکی کوشتنە شومەکانی یاری شەترەنجەکە بوو. لەوەبەدواوە بەردەوام پۆلیس دەیزانی چ کەسێک دەبێتە قوربانی داهاتوو، بێگومان تاڕادەیەک کەسەکەیان دەپاراست، بەڵام نەیاندەتوانی ڕێگە لە پیاوکوژەکە بگرن.

لەزۆربەی حاڵەتەکاندا قوربانیەکان یان لە ناو دارستانەکەدا یان لەناو مەرزاکەدا دەکوژران، وە هەموو کەرەتێکیش پیاوکوژەکە چەقۆیەکی تیژی قەسابی بەکاردەهێنا. هەر لەپاش ماوەیەکی کورت نزیکەی نیوەی میوانەکانی ئاهەنگی ڕوبەندپۆشیەکەی "هامیلتن" کوژران، ئیدی پیاوکوژەکە خەریکبوو لە "لۆرد" و "دۆک" نزیک دەبووەوە، بێگومان لە بەڕێوەبەری پۆلیسیش. ئەو زۆر بەباشی دەیزانی کە خۆی لەیاریەکەدا شانزەهەمین داشبوو کە ڕێگەیان پێدا تەختی شەترەنجەکە بەجێبهێڵێت.





بێگومان یەکەمین کەس کە گومانی خرایە سەر "ئاین ماک کینزی" بوو، چونکە ژنەکەی لەو شەوە شومەدا بەیەکجاری ڕسوایکرد، جگەلەوەش بۆ هەتاهەتایە لەدەستیدا. جگە لە "لۆرد" و "دۆک"، "ماک کێنزی" دواهەمین میوانبوو کەلەسەر تەختی شەترەنجەکەدا مابووەوە، لەبەرئەوە بەلایەنی کەمەوە بەشێوەیەکی تیۆری گومانی ئەوەی لێدەکرا کە هەموو جوڵەکانی یاری شەترەنجەکەی لەیادبێت. بەڵام لە کاتێکدا کە کوشتنی ژمارە سیانزە و چواردە لەو کاتەدا ڕوویدا کە "ماک کێنزی" لە زینداندابوو، بەهێواشی دەستێکیان کێشا بەپشتیدا و بەریاندا.

تەنانەت "لۆرد"یشیان بۆ لێکۆڵینەوە بانگهێشکرد. ئەو یاری شەترەنجەکەی دۆڕاند و ئەوەش لەژێرەوە زۆر پەستیکردبوو. بەدەرلەوەش یەکێک بوو لەو چەند کەسە کەمەی کە جوڵە بە جوڵەی یاری شەترەنجەکەی لەبیربوو. پۆلیسەکان زیاتر مەبەستیانبوو بزانن بە چ شێوەیەک ئەو ئاهەنگە سەیروسەمەرەیەی ڕێکخستبوو.

لەو کاتەشدا کە سەرۆکی خزمەتکارانیان بەمەبەستی گەواهی بۆ پۆلیسخانە بانگکرد، هەندێ ناتەبایی نێوان خۆی و "لۆرد" ئاشکرابوو، بەڵام وەک کەسێکی گومانلێکراو تەماشایان نەدەکرد. هاوکات هێندەی بە پۆلیس وت کە ئەو لەپێش ئەو شەوە شومەی ناوەڕاستی هاوین و لەدوای ئەو ڕۆژەشەوە نیگەرانی باری دەروونی "هامیلتن" بووە.

ئەو ژن و مێردە جوتیارەشیان هێنا بۆ پۆلیسخانە کە چەند ڕۆژێک بەرلە ئاهەنگەکە نەیانتوانی بەشداری لە ئاهەنگەکەدا بکەن، بەڵام یەکسەر پاش لێکۆڵینەوە بەریاندان.





لەدواجاردا ئافرەتێکیان بەسەر تاوانەکەوە گرت، ئەو کاتەبوو کە بەدزیەوە خۆی کردبوو بە گەورەکەی "ماک ئیڤەر"دا و چەقۆیەکی قەسابی کردبوو بەسنگی جوتیارێکدا.

"ماری ئان" زۆر بەئاسانی توانیبووی خۆی بگەیەنێتە کێڵگەکانی ناوچەکە، بەبێ هیچ گرفتێک خۆی کردبوو بە شوێنی کارکردنی پارێزەرەکان و کێڵگە گەورەکاندا. هونەرێکی سەختیش نەبووبوو بەلایەوە کە ژن و پیاوی ناوچەکە لەگەڵ خۆیدا بباتە ناو دارستان و کێڵگەکەوە.

"ماک لاکلان"ی بەڕێوەبەری پۆلیس خاوەنی ئەزمونێکی زۆر بوو لە کارەکەیدا، بەڵام لەوێدا لێی بووبوو بە گرێ و نەیدەزانی چ هۆیەک پاڵی بە "ماری ئان ماک کێنزی"وە ناوە کە درندەترین ڕیزە کوژی لە مێژووی سکۆتلەندادا بکات.

"ماری ئان"ی قەشەنگ وتی "شەرمکردن پاڵی پێوەنام بیانکوژم".

ئەو شەوە شەوێکی تەلیسماوی بوو، ئەو هەموو لێوانەی کە ماچی کردبوون هەر لەبەرچاویدا بوون، ئەو هەموو باوەشە پڕ لەپەرۆشیانەی لەبیرنەدەچووەوە کە خۆی بەویست و میهرەبانی خۆی ڕێگەی پێدابوون. بەڵام دواتر شەرمی لەو بەرەڵاییەی خۆی کردبوو. دەیتوانی خۆی بکوژێت، بەڵام ئەوە هیچ یارمەتیەکی نەدەدا. "ماری ئان" ڕازی نەبوو میوانەکانی "لۆرد" بەو یادوەریەوە بژین کە ئەو لە ناو پەرژینەکانی باخچەکەی "هامیلتن"دا خۆی دا بەدەست نیوەی سکۆتلەنداوە.

پاش چەند مانگێک "ماری ئان"یان لە "گلاسگاو"دا هەڵواسی، ئەو ڕۆژە چەندەها کەس لەوێدا کۆبووبونەوە و لە حەشمەتدا دەگریان.





*

لە مانگی نۆدا دەستم کرد بە خوێندنی مێژوو. جارجارێک کچێکی قوتابیم بانگدەکردە ماڵەوە، یان دەعوەتی شەرابی سور و پەنیرم دەکرد، یان بیرە و هێلکەی سورەوکراوم دادەنا. هەندێ جار گۆشتی گاشم سوردەکردەوە، گۆشتی مەڕ و کەلەرمیشم لێدەنا، شلەی ماسی و ماسیە وردیلەشم بە داودەرمانەوە ئامادەدەکرد.

من هەر چاوەڕوانبووم ماریا بگەڕێتەوە و بڵێت "ئەو کارەم دەستکەوتووە کە لە سویددا داوامکردبوو". تا ئێوارەیەکیان تەلەفونی بۆ کردم و داوای لێکردم سەردانێکم بکات. کە هاتیش چەپێک گوڵەباخی زەردی گەورەی بەدەستەوەبوو. بۆ منی هێنابوو و منیش بەلامەوە سەیربوو. من ڕاست و دروست نەمدەزانی چی دەوێت، بەڵام بۆنی شتێکم دەکرد.

بەسەر مێزی نانخواردنەکەی چێشتخانەکەدا خۆمان چەماندبووەوە و دەستی یەکتریمان گرتبوو. هەموو گڵۆپەکانم کوژاندبووەوە. تەنها یەک مۆمی ناو مۆمدانێک بەداگیرساوی لەنێوانماندابوو. یەک بتڵ شەرابی سوری حەوت کرۆنیشمان خواردبووەوە.

هەڵبەتە پێم خۆشبوو کە ماریا هاتبووەوە بۆ لام، بەڵام دواتر داواملێکرد کە ڕێک و ڕەوان مەبەستی هاتنەکەیم بۆ ڕونبکاتەوە. لەپێشدا وتی "ئیشەکەی سویدم دەستکەوتووە و لەمانگی دوانزەدا دەگوێزمەوە". لەدڵی خۆمدا وتم "بۆ نا، لەوانەیە منیش بتوانم بەباشی لە سویددا هەڵبکەم"، بەڵام پێش ئەوەی فریابکەوم هیچ شتێک لەو بارەیەوە بڵێم، شتێکی پێ وتم و لەوەبەدواوە یەکسەر





هەستمکرد کە من هەرگیزا و هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ستۆکهۆڵمدا نا‌ژیم.

تەماشای ناو چاوی کردم و وتی "دەمەوێت داوای شتێکت لێ بکەم، شتێکە کە بە درێژایی ژیان دەمێنێتەوە".

لەوێدا هەستمکرد لەشم گەرمداهات. ئەوە یەکەمین جاربوو لە ژیانمدا کە بتوانم خۆم بۆ شتێک بکەمەوە کە بەدرێژایی ژیان بمێنێتەوە. من حەزم لە وتنەوەی وشەی "دەمێنێتەوە" بوو، بەلامەوە وشەیەکی جوانبوو.

وتی؛ «حەزدەکەم منداڵێک لەگەڵ خۆمدا بەرم بۆ ستۆکهۆڵم»

دیسانەوە لەوێشدا هەستمکرد ماریا تەنها ئافرەتێکبوو کە لەژیانمدا بینیبێتم و نەمتوانیبێت هەمیشە لێی تێبگەم. من ڕاست و ڕەوان ئەو لایەنەیم بەدڵبوو. مەحاڵە کەسێکت خۆشبووێت کە هەمیشە پڕاوپڕ لێی تێبگەیت.

دواتر وتی؛ «پیتەر... دەمەوێت سکم پڕبکەیت، دەمەوێت منداڵێکم لە تۆ ببێت»

هێشتام بە تەواوەتی لەئاکامی وشەکانی تێنەدەگەیشتم. من هێشتام هەر خەیاڵم بەوەوە لێدەدا بە چ شێوەیەک لە ستۆکهۆڵمدا بیگوزەرێنم؛ لەدڵی خۆمدا دەموت "ئاپارتمانەکەی ئۆسلۆ بفرۆشم؟ یان هەر بیدەم بە کرێ؟"

بەڵام لەوێدا ماریا وتی "من نامەوێت هەموو ژیانم لەگەڵ یەک پیاودا بەرمەسەر. منیش ڕێک وەکو تۆ وام". ماریا باشی دەناسیم و لەوەوپێش باسی هەموو ئەو ئافرەتانەم بۆکردبوو کە هاتبوونە لام. هەر دەتوت خۆمم لەبەردەمی دەرگایەکدا بینیوە کە بە هەردوولادا دەکرێتەوە.





ماریا دەیویست منداڵێکی لە من ببێت. ئەو دەیوت "تۆ تەنها پیاوێک کە حەزبکەم منداڵێکم لێی ببێت"، زیاتریش دەیوت "من هەر زوو هەستم بەوە کرد، لەڕاستیدا هەرلەو ڕۆژەوە زانیم کە بۆ یەکەمین جار لە "ئوللەڤۆلسیتە"دا یەکتریمان بینی، بەڵام نەمدەتوانی پەیوەندیەکی درێژخایەنت لەگەڵدا ببەستم". دەیویست سکی پڕبکەم، پرسیاری لێکردم و وتی "دەتەوێت دووگیانم بکەیت؟"

پێی پێکەنیم. بەلامەوە هەتا بڵێیت بیرۆکەیەکی زۆرزانانەبوو، بەڵام لەخەیاڵیشمدا بوو. لەخەیاڵمدابوو کە منداڵێکم ببێت و بەهیچ شێوەیەکیش نەبەسترێمەوە.

بۆ ماوەیەکی دورودرێژ لەسەری دواین و تاوتوێمانکرد، بەڵام بەهیچ جۆرێک بەشێوەیەکی جدی لەسەری نەڕۆیشتین. قسەی خۆشماندەکرد و پێدەکەنین، ماریا وتی "ئیتر لەمەودواوە ئەتوانین دیسانەوە لەگەڵ یەکدا بخەوینەوە". ئەوە فریوی دام. دەمانتوانی هەتاوەکو ئەو کاتەی دووگیاندەبوو پێکەوە بخەوین. دواتریش دەیگواستەوە بۆ ستۆکهۆڵم.

من خۆم بە هیچ شێوەیەک ئامادەنەبووم منداڵم ببێت. بەڵام بڵێیت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو ئامادەگیەم تێدا بووبێت. من تەنها بیرکردنەوە لەوەی کە تەماشای ناو چاوی منداڵەکەم بکەم، دەیترساندم. من کە خۆم منداڵبووم، پێمخۆشنەبوو هیچ کەسێک دەست بەسەرمدا بهێنێت، ڕقم هەڵدەستا کە دەستیان بەڕومەتما دەهێنا. ئەدی چۆن خۆم دەست بەسەری منداڵەکەمدا بهێنم؟ چۆن دەست بەڕومەتیا بهێنم؟

من ئەو لایەنانەشم لێکدەدایەوە. من نەمدەویست منداڵم ببێت، بەڵام دەمتوانی یارمەتی ماریا بدەم. هەتا زیاتر باسمان لێدەکرد، زیاتر و زۆرتر قەناعەتم بەوە دەهێنا کە بیرۆکەیەکی نایابی خستۆتە بەردەستم. ئەو جەختی لەخاڵێک دەکردەوە و دەیوت "دەبێت پێکەوە





پەیمانێک ببەستین". دەیوت "دەبێت پەیمان بەیەکتری بدەین کە
دواتر پاش ئەوەی دەگوێزمەوە بۆ سوید، بەدوای یەکتریدا نەگەڕێین".
دەبوایە ئیتر هەرگیز چاومان بەیەکتری نەکەوتایەتەوە. تەنانەت بۆم
نەبوو ناونیشانەکەی بزانم. هەرچی دەربارەی باوکایەتی منیشە،
دەبوایە بەتایبەتی پەیمان بەیەکتر بدەین کە وەک نهێنیەکی نێوان
هەردووکمان بیهێڵینەوە. لەسەرئەوە ڕێک کەوتین کە تەنها ئەوەندەم
پێبڵێت کە کوڕ دەبێت یان کچ و هیچی تر.
ئەو ئەندێشەیە زۆری هەژاندم، هەستم بە هاژەی خوێنی ناو لەشی
خۆم دەکرد. ماریا نەک تەنها هاوتای من نەبوو، بەڵکو پێموابوو لە
بێشەرمی و بەهرەمەندیدا لە من زۆر زیاتر ڕۆیشتبێت.
بەلامەوە ئاسایی بوو سکی ژنێک پڕبکەم و نەشبێتە منداڵی من. خۆ
من هەمیشە پێمخۆشبووە تەشەنەبکەم، هەمیشە حەزم لەوەبووە خۆم
بەتاڵبکەمەوە. هەرگیزیش گرنگیم بەو شتە نەداوە کە پێی دەڵێن
"مافی بلاوکردنەوە". لەدوای گەیاندنی شتێکیش یاخود پاش ئەوەی
شتێکم بەدوای خۆمدا جێدەهێشت، پێویستم بەوە نەبووە دابنیشم و
ئافەرین بچنمەوە، من هەر لەکاتی منداڵیمەوە بەو شێوەیە بووم.
کاتێک کەمنداڵ بووم و تەکسیەکانم بانگدەکرد، کەس چەپڵەی بۆ
لێنەدەدام. داواکردنی ئەو هەموو تەکسیە بیرۆکەیەکی بێوێنەبوو،
بەڵام دواتر هیچ کەسێک سوپاسی نەدەکردم.
لەلایەکی تریشەوە لەماوەی داهاتوودا زیاترێک یەکتریمان دەبینی.
هەرئەوە خۆی بۆ خۆی شتێکی قورسبوو بەلامەوە. من هەمیشە ئەو
گرفتەم هەبوو کە نەمدەتوانی لە چەند ڕۆژێکی کەمی داهاتوو
زیاترێک ببینم. دەمتوانی بیر لە ڕابوردووم بکەمەوە، دەشمتوانی
بەچەپ و ڕاستدا بیر لەو کاتە بکەمەوە کە تیایدا دەژیام، بەڵام





هەرگیز نەمدەتوانی ئەو ڕۆژانە بهێنمە بەرچاوم کە لەداهاتوودا
دەهاتن. هێندەم بە ماریا ڕاگەیاند کە بە مەرجەکانی ڕازیم، وتم
پێشمخۆشە سکت پڕبکەم، هەر بەڕاستی پێمخۆشە. بۆ ماوەیەکی
دوورودرێژ هەر پێدەکەنین. بەشێوەیەکی دڵڕەقانە پێدەکەنین. هەتا
دەهات زیاتر ئالۆش دەیگرتین و زۆرتریش حەزمان لە سێکسبوو.

دواتر دوو حەفتەی زۆر خۆشمان ڕابوارد. تا ئێستاکەش هەستدەکەم
تەنها لەو ماوەیەدا بەڕاستی ژیابم.
ئێمە ناوی ئەو پەیوەندیە تایبەتیەمان نابوو "خۆشەویستی ناچاری".
بەلام خۆ نەدەکرا بەدرێژایی ڕۆژەکە لە جێگادا پاڵکەوین و خەریکی
منداڵ دروستکردن بین. لەگەڵ ئەوەشدا بیستوچوار سەعاتی ڕۆژەکە
پێکەوە بووین. پیاسەی درێژمان بەناو شار و "نۆردمارک"دا دەکرد،
هەندێ لە چیرۆکە هەرە شێتانەکانیشم بۆ گێڕایەوە. ماریا
لەڕادەبەدەر ئەو چیرۆکە ئالۆزەی خۆشدەویست کە دەربارەی خشڵ
فرۆشێکبوو؛ ئەو لەچیرۆکەکەدا بەشێوەیەکی ترسناک و بەدەستی
ئانقەست لەدوای مردنی خۆیەوە سێ کەس دەکوژێت. ئەو چیرۆکەشم
بۆ گێڕایەوە کە لە یانەی 7دا بە نوسەرەکەم فرۆشت. بەلامەوە
ئاسایی بوو ئەو چیرۆکەی بۆ بگێڕمەوە، چونکە ماریا وڵاتەکەی
بەجێدەهێشت.
دەبوایە هەندێ لە چیرۆکەکانم دوو سێ کەڕەت بۆ بگێڕایەتەوە،
چونکە ماریا دەیوت "هەوڵدەدەم لەبەریان بکەم". کۆسپەکەی من
لەوەدابوو کە هەرگیز نەمدەتوانی دوو سێ جار هەمان چیرۆک ڕێک
بە هەمان شێوە بگێڕمەوە. هەموو جارێکیش کە تێدەکەوتم ماریا
بەچرپەچرپ پێی دەوتمەوە. لەمن باشتر چیرۆکەکەی لەیادبوو،





تاڕادەیەک هەموو ئەو وشانەی لەبیربوو کە من بەکارمهێنابوون، ماریا لەوە تێنەدەگەیشت و نەیدەزانی بۆچی ئەو لە من باشترێک وشەکانی لەیادە. منیش بۆم ڕونکردەوە و وتم "هونەری ئیرتیجال"[22] تەنها هونەرە کە من بەتەواوەتی کارامەبم تیایدا. (دەتوانین بڵێین "گێڕانەوەی سەرپێیی"، بەڵام هێشتام بەتەواوەتی مانای پڕاوپڕی وشەکە نابەخشێت.و.

هێندەی پێنەچوو ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کە هەردووکمان چاوەڕوانی بووین. ماریا بەخەندەوە پێشوازیکرد و منیش بەخەفەتەوە. تاقیکردنەوەی سکەکەی پۆزەتیفی پیشان دەدا، ماریا لە خۆشیدا دەستی بەملاولادا بادەدا و خەنییبوو. هەر بۆ خۆشی وتی «تۆش دەبیتە "باوکێکی نمونەیی"»، دیسانەوە لەوێشدا بەشێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە پێکەنینەوە.

ماریا بەرلەوەی بگوێزێتەوە بۆ سوید، دوو مانگی تر لە ئۆسلۆدا مایەوە. زۆر بەدەگمەن لەو ماوەیەدا یەکتریمان دەدی. بەڵام کەرەتێکیان تەلەفونی بۆ کردم و وتی "تاقەتت هەیە بێیت بۆ "کرینگشۆ" و چیرۆکێکم بۆ بگێڕیتەوە؟" منیش خۆمم بە قورس ڕانەگرت. سەیربوو بەلامەوە کە بەشێکی من هەر لەو کاتەوە لەناو لەشی ئەودابوو.

ئیدی ماریا بەجێی هێشتم. بەرلەوەی بڕوات تەلەفونێکی بۆ کردم. بەقیتار سەفەریکرد، بەڵام من بەڕێم نەکرد.

[22] بە داخەوە وشەیەکی پڕاوپڕم لە زمانی کوردیدا بەرامبەر ئەو وشەیە نەدۆزیەوە.و.



*

بەو شێوەیە من گونجاوترین پیاو بووم بۆ ئەوەی منداڵێک بخەمە سکی ئافرەتێکەوە و لەهەمان کاتیشدا نەبێتە منداڵی خۆم. ماریا دەیویست منداڵێکی لێم ببێت، ئێ بۆ نا؟ ئاسانبوو بەلامەوە. بەلاش دەکەوت لەسەرم. هەستمدەکرد دەبوایە من سوپاسی ئەوم بکردایە. بەڵام هەموو شتێک دوولایەنی هەیە و بیرم لەوە نەکردەوە کە من لە هەموو بارێکدا دەبێت نرخێکی گەورە بدەم؛ من بۆ هەتاهەتایە ئیتر ماریام نەدەبینییەوە.

بەهەرحاڵ چەند ساڵێک ڕابورد و ئەوسا پەیمانەکەمان بەڕاستی بردەسەر. چوار جار لەگەڵ کچەکەدا سەردانی ئۆسلۆی کرد. ماریا بەناوی "تۆپەڵە ئاڵتون"ەوە بانگی دەکرد، بەڵام بێگومان ناوێکی تریشی هەبوو. وابزانم ماریا بۆیە بەو نازناوەوە بانگی دەکرد، بۆ ئەوەی من ناوە ڕاستیەکەی نەزانم. دواجار کە بینیم تەمەنی نزیکەی سێ ساڵ بوو. لەوە کاتەوە ئیدی پەیمانەکەمان نوێکرایەوە _ئەوە دواهەمین جاربوو کە بیبینم. ماریا دەیوت "با کچەکە فریای ئەوە نەکەوێت وێنەیەکی باوکی لا دروست ببێت". لەڕاستیدا ئەو شتە منیشی دەگرتەوە، منیش دەبوایە نەگەمە ئەو ڕادەیەی کە وێنەیەکی باشی ئەوم لادروست ببێت، چونکە هەر لەبنەڕەتەوە باوکێکی تەواوەتی نەبووم.

کچێکی جوانبوو. بەبڕوای من نە لە ماریا دەچوو و نە لە خۆشم، بەڵام زۆر بەئاشکرا شێوەی دایکی خۆمم تیادا دەبینی. ئێسقانی سەر ڕومەتەکانی هەروەک دایکم هەمان بەرزیان هەبوو، ماوەی نێوان چاوەکانیشی ڕێک هەروەک دایکم گەورەبوو. وادەهاتە بەرچاوم کە



دایکم سەرلەنوێ لەدایک بۆتەوە و منیش ئەو بوارە نوێیەم پێبەخشیوە. بێگومان زۆر باش دەمزانی کە ئەوانە هەمووی فەنتاسیای خۆمن و هیچی تر.

دواهەمین جار کە ماریا و "تۆپەڵە ئاڵتون"م بینی لە ئێوارەیەکی گەرمی مانگی شەشی ساڵی 1985دا بوو. تەنها چەند کاتژمێرێک پێکەوە بووین و هەمووشیمان لە "سۆگنسڤان" بەسەربرد. بۆ خواردن و خواردنەوەش، ڕۆبیان و سەمونی درێژ و شەرابی سپیمان لەگەڵ خۆماندا بردبوو. من و ماریا دانیشتبووین و باسی ڕۆژانی ڕابوردومان دەکرد، لەو کاتەدا کچەکە لەگەڵ قوورنگێکدا، کە هەر پسکەپسکی بوو، لەقەراخ ئاوەکە هەڵبەز و دابەزی دەکرد. لەئاوەکە هاتە دەرەوە و داوای پسکیت و شەربەتی کرد، لەوێدا من خاولیەکم تێوەئاڵاند و وشکم کردەوە. هەڵبەتە بەڕەزامەندی دایک و کچ ئەوەم کرد. بێگومان کراسەکەشم لەبەرکردەوە. هەر ماریا خۆی لەوەوپێش کەرەتێکیان وتی "تۆش دەبیتە باوکێکی نمونەیی".

"تۆپەڵە ئاڵتون" لەسەرخاولیەک لەنێوان من و ماریادا دانیشتبوو و منیش چیرۆکێکی دورودرێژم بۆ گێڕایەوە، یان هەروەک خۆم ناومنابوو "حەکایەتێکی ئیسلاندی"[23]. هێشتام بەتەواوەتی دەستم بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە نەکردبوو کە کەوتە پێکەنین. نازانم لەو وشانە تێدەگەیشت کە بۆم دەگێڕایەوە یان نا، لەوانەیە تێگەیشتبێت، بۆیە

[23] مەبەستی لە جۆرە چیرۆکێکی دورودرێژی ئیسلاندیە کە کەم تا زۆر لەسەر بنەمایەکی مێژویی داڕێژراوە و لەسەردەمی سەداکانی ناوەڕاستدا باوبووە.





پێدەکەنی، بەڵام من هەوڵمدا هەندێ وشەی سویدیش بەکاربهێنم بۆئەوەی ئاسانتر لێم تێبگات.

باسی کچێکی بچکۆڵەم بۆ گێڕایەوە کە هاوتەمەنی خۆی بوو و ناوی "پەنینا مەنینا" بوو، باوکی ئەو کچە بەڕێوەبەری گەورەترین و جوانترین سێرکی دونیابوو. سێرکەکە یەکێک لەسێرکەکانی وڵاتێکی دوور دووربوو، بەڵام گەلێ گەلێ ساڵ لەمەوبەر کەرەتێکیان بەرەو ستۆکهۆڵم هاتن، بۆ ئەوەی لەوێدا خێمەکەیان لە "گرێنە لوند"دا لەناوەڕاستی پایتەختی سویددا هەڵبدەن، ئەوان پاشا و شاژنی سوید بانگهێشتی کردبوون. هەموو فارغۆنەکانی سێرکەکە یەک بەدوای یەکدا بەناو "سکۆنە" و "سمۆلاند"دا بەرەو سەرەوە تێدەپەڕین. لەناو فارغۆنێکی گەورەی قیتاردا فیل و سەگی ئاو و ورچ و زەڕافە و ئەسپ و سەگ و مەیمونی تێدابوو. جگەلەوانەش لەناو ماشێنەکاندا چەند گاڵتەبازێک و فەنباز و جادووگەر و پەتباز و ڕاهێنەری ئاژەڵان و سوارچاک و کەسانی مۆسیقی و جادووبازی تێدابوو. "پەنینا مەنینا"ش تەنها منداڵ بوو لەنێوانیاندا. هەروەک شازادەیەک ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرد، چونکە کچی بەڕێوەبەری سێرکەکە بوو، وە دەیانوت لەچارەنوسی نوسراوە کە لە داهاتودا دەبێتە هونەرمەندێکی بەناوبانگی سێرک.

کچەکە وەک مۆمێک قیت دانیشتبوو و گوێی بۆ شتانە شلکردبوو کە بۆم دەگێڕایەوە، بەڵام هیچی نەوت، لەبەرئەوە بەدڵنیاییەوە نەمدەزانی چەندێک تێدەگات. لەدڵی خۆمدا دەموت خۆ هەرهیچ نەبێت کەمێک لە حەکایەتەکە وەردەگرێت. تەماشایەکی ماریام کرد و ئەویش بە ئیشارەت تێیگەیاندم کە بەردەوامبم. وابزانم ماریا پێی خۆشبوو کە کچەکە بەلایەنی کەمەوە چیرۆکێک لەگەڵ خۆیدا دەبات،





خۆشی هەروەها. لەو کاتەدا پیاوە یەک مەتریەکە لەسەر دارێک دانیشتبوو و چاوەڕوانی باقی چیرۆکەکە بوو. کاتێکیش کە هاتە خوارەوە، کەوتە سەر کڵاوە سەوزەکەی و بەشێوەیەکی نهێنی چاوێکی لێداگرتم. وابزانم مەزاجێکی خۆشی هەبوو. لەوەدەچوو ئەوە یەکەمین جاری بێت کە هەستبکات کەسێکی سەربە خێزانەکەیە.

کەوتمەوە گێڕانەوەی چیرۆکەکە و وتم هەموو ماشێنە گەورەکان و فارغۆنی سێرکەکە بۆ پشووی نیوەڕۆ وەستان، لەلای دەریاچەیەکی گەورەی ناو دارستانەکانی سویددا لایاندا. لەکاتی وەستانیاندا کچی بەڕێوەبەری سێرکەکە پێی خۆشبوو بە پێی پەتی بەقەراغی ئاوەکەدا بڕوات. بەڕێوەبەری سێرکەکە وایدەزانی یەکێک لە گاڵتەبازەکان ئاگای لێدەبێت، بەڵام گاڵتەبازەکە بەهەڵە تێگەیشتبوو و پێی وابوو یەکێک لەو کەسانەی کە ئاژەڵەکانیان ڕادەهێنا دەبوایە ئاگای لە "پەنینا مەنینا" بوایە، لەو کاتەدا ئاگرێکی گەورەیان کردبووەوە و هەموو گەورەکان خەریکی برژاندنی گۆشتی بەرازی کێوی بوون. پاش چەند کاتژمێرێک دەبوایە بە خۆیان و فارغۆنە گەورەکانیانەوە بەرەو ستۆکهۆڵم بکەوتنایەتەوە ڕێ، بەڵام هیچ کەسێک منداڵەکەی بۆ نەدەدۆزرایەوە. بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە و شەوەکەشی بەدوایدا گەڕان، چەندەها گیانەوەریشیان بەو مەبەستە بەردا کە بۆنی بکەن و بیدۆزنەوە، بەڵام بێسودبوو. بەدرێژایی ڕۆژی دواتریش بەدوای "پەنینا مەنینا"دا گەڕان، بەڵام دواتر هەمووان لەو بڕوایەدابوون کە لە دەریاچەکەدا خنکابێت. دوو حوشتر لەلای قەراخ ئاوەکەوە وەستابوون و بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک ئاویان دەخواردەوە. هەر ئاویان دەخواردەوە و هەر دەیانخواردەوە، کۆمەڵێک خەڵکانی سێرکەکە پێیانوابوو لەبەرئەوەبێت کە بۆنی "پەنینا مەنینا" بکەن و دەیانوت





لەوانەیە هەوڵبدەن ئاوی دەریاچەکە هەڵبلوشن. بەڵام دواتر حوشترەکان چیتر لەتوانایاندا نەما ئاو بخۆنەوە و کچی بەڕێوەبەری سێرکەکەش نەدیاربوو و نەدەریش کەوتەوە. دەگێڕنەوە دەڵێن کە بەڕێوەبەری سێرکەکە بۆ ماوەی چەندەهاساڵی تاڵ بەدەم خەوەوە دەگریا، چونکە "پەنینا مەنینا" گلێنەی چاوی بوو و لە هەموو سێرکەکە زیاترێک خۆشی دەویست.

بەشێوەیەک خۆمپیشانی منداڵەکەدا کە فرمێسکێکم دەسڕم، وابزانم لەو کاتەدا "تۆپەڵە ئاڵتون" بەلاچاوێک تەماشایدەکردم. لەوەدەچوو بەلایەنی کەمەوە لەو بەشەی دواتر تێگەیشتبێت. چونکە کەمێک لەوەوبەر خۆی بەپێی پەتی لەقەراغی ئاوەکەدا دەخولایەوە. لەبەرئەوە خێرا درێژەم بە چیرۆکەکەمدا و وتم؛

«بەڵام "پەنینا مەنینا" نەخنکابوو. لەو کاتەدا کە ژن و پیاوە گەورەکان لەلای ئاگرەکەوە خەریکی خواردنی گۆشتی بەرازی کێوی و خواردنەوەی شەراب بوون، ئەو چووبوو بۆ خۆی پیاسەیەک بکات و ویستبووی ئەو ناوە ببینێت. ڕێگایەکی خۆشی ناو دارستانەکە دەگرێتەبەر، بەڵام پاش ماوەیەک قاچەکانی هیلاک دەبن و ناچاردەبێت لەناو "خەلەنگ"ەکانی نێوان دارە بەرزەکاندا دابنیشێت. گوێ لە گمەی کۆترەکان و قاژەقاژی کونەپەپوەکان دەگرێت، ئیدی خەو دەیباتەوە و خەوێکی قورسی لێدەکەوێت. کاتێکیش خەبەری دەبێتەوە، واهەستدەکات بۆ ماوەیەکی کەم سەرخەوێکی شکاندووە، بەڵام لەڕاستیدا بەدرێژایی شەوەکە و زیاتریش خەوتبوو، چونکە کە خەبەری دەبێتەوە خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندایە. "پەنینا مەنینا" دەچێتەوە سەر ڕێگاکە بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆلای ئەوانی تر، بەڵام تەنانەت یەک ماشێنی سێرکیشی





بۆ نادۆزرێتەوە، پاش ماوەیەکی کەمیش لەناو دارستانەکەدا وندەبێت. بۆ دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ دەگاتە لای کێڵگەیەکی بچکۆلە، لەوێدا خانویەکی دێهاتی سور دەبینێت، دارێکی ئالآی درێژ بەخانوەکەوەیە و بەیاخێکی سویدی پێوەیە. لەبەردەم خانوە سورەکەشدا کەرەڤانەیەکی پەمەیی وەستاوە، کەرەڤانەکە زۆر سەرنجی "پەنینا مەنینا" ڕادەکێشێت، چونکە هەر زۆر لە ماشێنێکی سێرک دەچێت. ڕاستە ئەو کاتە تەمەنی تەنها سێ ساڵ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەچێتە بەردەرگای کەرەڤانەکە و لەدەرگاکەی دەدات، بەڵام کەس دەرگاکەی لێناکاتەوە. "پەنینا مەنینا" بەسەر چەند پلیکانەیەکی بەردینی بچکۆلەدا سەردەکەوێت و خۆی دەگەێنێتە بەردەم دەرگای خانوە سورەکە و لەدەرگای ئەوێ دەدات. لەوێدا ئافرەتێکی بەتەمەن دەرگاکەی لێدەکاتەوە. "پەنینا مەنینا" ناترسێت _وابزانم لەبەرئەوە ناترسێت چونکە بەڕاستی کچێکی سێرکبوو. تەماشایەکی ژنە نامۆکە دەکات و دەڵێت "باوکمم لێ ونبووە"، بەڵام ژنەکە لێی تێناگات، چونکە بەزمانێکی تر دەیلێت، وەک لەوەوپێش وتمان "پەنینا مەنینا" لەوڵاتێکی دوور دوورەوە هاتووە و ئەو ژنە پیرەش هەرگیز ئەو وڵاتەی نەدیووە. "پەنینا مەنینا" دوو ڕۆژە هیچی نەخواردوە، لەبەرئەوە دەستە بچوکەکانی دەبات بۆ دەمی، بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە برسیەتی. ئەوجا ژنەکە بۆی دەردەکەوێت کە ئەو کچە بچکۆلەیە لەدارستانەکەدا ونبووە، دەیباتە ژورەوە و خواردنی بۆ دادەنێت؛ ماسی و قیمە و نان و شەربەتی توتڕکی مۆر دەخاتە بەردەمی، "پەنینا مەنینا" زۆر برسیەتی و زۆریشی تینووە، لەبەرئەوە هێندەی کەسێکی گەورە نان دەخوات و هەروەک کەسێکی گەورەش شەربەت دەخواتەوە. ئێوارە دادێت و ژنەکە جێگایەکی بۆ دەڕازێنێتەوە.





هەڵبەتە ناتوانن بەڕێک و پێکی پێکەوە قسەبکەن، لەبەرئەوە ژنەکە لەلای جێگاکەیەوە دادەنیشێت و هەتا ئەو کاتەی خەوێکی قوڵی لێدەکەوێت لایلایەی بۆ دەکات. ناشزانێت ناوی چیە، لەبەرئەوە ناوی دەنێت "تۆپەڵە ئاڵتون".

دیسانەوە "تۆپەڵە ئاڵتون" تەماشایەکی کردمەوە. پێموابێت لەبەرئەوە بوو کەلەکاتی گێڕانەوەدا بەدەستی خۆم شێوەی نانخواردنی "پەنینا مەنینا"م نیشاندا، بەڵام لەوانەشە لەبەرئەوە بووبێت کە هەستیکردبێت کچی ناو چیرۆکەکەش ناوی "تۆپەڵە ئاڵتون"ی لێنرا. بەدڵنیاییەوە نەمدەزانی چەندێکی چیرۆکەکە تێدەگات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوامبووم؛

«بۆ ماوەی چەند ساڵێک "پەنینا مەنینا" لەو کێڵگەیەدا مایەوە. هیچ کەسێک نەبوو لە هەموو وڵاتی سویددا کە بزانێت دایک و باوکێ کێیە، وە لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکانیشدا یادوەریەکانی "پەنینا مەنینا" وەک کچی بەڕێوەبەری سێرکێک نەختە نەختە کاڵ دەبوونەوە. لەپاش ماوەیەکی کەم سویدیەکی ڕەوان فێربوو، بەڵام هاوکات زمانەکەی خۆی لەبیرچووەوە، چونکە هیچ کەسێکی شکنەدەبرد کە بەو زمانە قسەی لەگەڵدا بکات. بەڵام _لەوێدا پەنجەی دۆشاومژەم بەرزکردەوە بۆ ئەوەی نیشانی بدەم کە شتێکی گرنگم بیرچووە کە پێی بڵێم_ ژنە پیرەکەی کێڵگەکە تۆپێکی کریستاڵی لە دۆلابی ژوری نوستنەکەیدا دانابوو. چونکە دەمێ دەمێ ساڵ لەوەوبەر ئەو ژنە وەک فاڵگرەوەیەک لە یەکێک لە شارە یاریە گەورەکانی "لوند"دا کاریکردووە لەڕێگەی فاڵگرتنەوە یارمەتی خەڵکی داوە. لەدوای هاتنی کچەکەوە دیسانەوە تۆپە کریستاڵەکەی دەردەهێنێتەوە و پێشبینی ئەوە دەکات کە "تۆپەڵە ئاڵتون" ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێتە پاڵەوانێکی پەتبازی





بەناوبانگی سێرک. هەرلەبەرئەوەش دەکەوێتە ڕاهێنانی کچەکە. فێری دەکات کە هاوسەنگی خۆی ڕاگرێت، هەموو شتێکیشی بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنا لەگەڵیدا، هەر لەسەر تەختەی باریک و گوریسەوە هەتا مەنجەڵ و تەشتی گەورەش. ڕۆژێک لە ڕۆژانیش "تۆپەڵە ئاڵتون"هێندە ئامادەگی تێدابوو کە هونەرەکەی پیشانی بەڕێوەبەرێکی سێرک بدات. ئەو کاتە سیانزە ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیبوو کە کچە سێ ساڵەکە بۆ یەکەمین جار لەدەرگای ژنە فاڵگرەوەکەی دا. لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندبوویەوە کە سێرکێکی بەناوبانگ لە دەرەوەی وڵاتەوە هاتوونەتە ستۆکهۆڵم و لەوێدا نمایش دەکەن. ڕۆژێکیش هەر بۆ تاقیکردنەوەی بەختی خۆیان پێکەوە دەچنە ستۆکهۆڵم. هەمان ئەو سێرکەبوو کە سیانزە ساڵ لەوەوپێش لەوڵاتێکی دورەوە هاتبوونە ستۆکهۆڵم، بەڵام "پەنینا مەنینا" بەهیچ شێوەیەک لەیادوەریدا نەبوو کە کاتی خۆی لەگەڵ سێرکێکدا بووە. بەڕێوەبەرە بیانیەکە سەری لەتوانای ئەو کچە سویدیە دەسوڕمێت و یەکسەر لەسێرکەکەدا وەریدەگرێت. بەڵام نە "پەنینا مەنینا" دەیزانی کە بەڕێوەبەری سێرکەکە باوکیەتی و نە ئەویش دەیزانی کە "پەنینا مەنینا" کچی ڕاستەقینەی خۆیەتی».

ماریا تەماشایەکی کردم و چەندەها پرسیارم لە دەموچاویدا بەدیکرد. ئەو هەمیشە گرنگییەکی زۆری بەو شێوەیەدەدا کە من چیرۆکەکانم پێ کۆتایی دەهێنا. لەوەشە ئەو جارەیان بەئاگاداریەکی زیاترەوە گوێی بۆ شلکردبێتم، چونکە دوو گوێچکەی بچکۆلەش لەنێوانماندا دانیشتبوو.

دەستم بە چیرۆکەکەم کردەوە و وتم؛ «بەڵام دەڵێن خوێن قەت نابێت بە ئاو، وابزانم هەر لەبەرئەوەشبوو کە لەسەرەتاوە "پەنینا مەنینا" و





بەڕێوەبەری سێرکەکە زۆر ڕێکبوون لەگەڵ یەکتریدا. "پەنینا مەنینا" بڕیاریدا لەگەڵ سێرکەکەدا بڕوات و بگەڕێتەوە بۆ ئەو وڵاتەی کە لێوەی هاتبوون، لەوێشدا لەماوەیەکی هەر زۆر کەمدا وەک پەتبازێکی بەهرەمەند ناوبانگی بڵاوبووەوە. ئێوارەیەکیان لەسەر یەکێک لە پەتە بەرزەکان سەمای دەکرد و بەێوەبەری سێرکەکەش لەخوارەوە لەبەردەم ئۆرکێسترای سێرکەکەدا وەستابوو و قامچیەکی بەدەستەوەبوو، لەوێدا و لەناکاوێکدا بۆی دەردەکەوێت کە بەڕێوەبەری سێرکەکە باوکی ڕاستەقینەی خۆیەتی _بەتەواوەتی لەیادی نەکردبوو. ئا لەوێدا شتێکم بۆ "تۆپەڵە ئاڵتون" ڕونکردەوە و وتم؛ "بەشێوەیەکی گشتی بەو جۆرە ساتانە دەوترێت "ساتی دەرکەوتنی هەقیقەت". لەو کاتەدا "پەنینا مەنینا" دەشڵەژێت و ئیدی هاوسەنگی تێکدەچێت و دەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو خەڵکەکە. بەڕێوەبەری سێرکەکە بەڕاکردن خۆی دەگەێنێتە لای، بۆ ئەوەی بزانێت بریناربووە یان نا، بەڵام ئەو هەردوو دەستی بەروڕوی ڕادەکێشێت و لەناخی دڵیەوە هاواردەکات و دەڵێت؛ بابە! بابە!».

"تۆپەڵە ئاڵتون" بەسەرسامیەوە تەماشای کردم و کەوتە پێکەنین، وابزانم هێندە لەو شتانە تێنەگەیشت کە کەمێک لەوەوبەر بۆم گێڕایەوە. بەڵام لەبەرامبەردا ماریا لێم تێگەیشت و زۆر توڕە سەیری دەکردم. دیاربوو کە دواهەمین کۆپلەی چیرۆکەکەمی بەدڵنەبوو.

خەریکبوو خۆر بەسەر دانیشتنی ئەو خێزانە بچکۆلەیەدا ئاوادەبوو. شتەکانمان کۆکردەوە و بەرەو "ترام"ەکە ڕۆیشتین. کچە بچکۆلەکە کەمێک لە پێشمانەوە بە هێواشی ڕێی دەبڕی. بەدەم خۆیەوە دەیوت «بابە، بابە!». ماریا دەستی گرتم و گوشی، تەماشایەکم کرد و بینیم فرمێسک بەچاوانیدا دێتە خوارەوە. کە گەیشتینە ناوشاریش ئیدی

لەیەکتر جودابووینەوە. ئەوە دواهەمین جاربوو کە بینیمن، ئیتر لەو کاتەوە هیچ هەواڵێکی ماریا و منداڵەکەم نەبیستەوە.

## یاریدەدەری نوسەر

ئێستاکە 26 ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە، لەبەردەم پەنجەرەیەکی گەورەدا دانیشتووم و تەماشای شەپۆلەکان و دەریا دەکەم. خۆر لە ئاوابووندایە و توێژاڵێک ڕەنگی زەردی کاڵ خۆی بەسەر کەنداوەکەدا کێشاوە. بەلەمێک کە چەند گەشتیارێکی تێدایە بەرەو شۆستەی بەندەرەکە ملدەنێت، چووبوون بۆ تەماشاکردنی ئەشکەوتە سەوزە زەمرووتیەکەی کە یەک دوو کیلۆمەترێک لێرەوە دورە.

من خۆم بەپیاسە بەلای دار لیمۆکاندا ڕۆیشتم و دواتریش بەناو دۆڵی "ئاشەکان"دا تا سەری سەرەوەی شارەکە ڕۆیشتم. خەڵکی ئێرە میهرەبان و ڕوخۆشن. ئافرەتێکی جل ڕەش خۆی بەسەر پەنجەرەیەکدا چەماندەوە و فەرموی پەرداخێک مەشروبی لیمۆی لێکردم.

زۆر ئاگام لە خۆمە. هەرچەندە لەسەرەوەی دۆڵەکەدا تەنانەت یەک کەسیشم نەدی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە ئارامی نەکرد، لەوانەشە بۆیە نائارام بووبم، چونکە هیچ کەسێکم نەبینی. چەند جارێک وەستام و ئاوڕێکم دایەوە. ئەگەر کەسێک لە "بۆلۆگنا"وە دوامکەوتبێت، ئەوا بنی ئەو دۆڵەی کە پاشماوە کۆنەکانی شوێنی کاغەز دروستکردنەکەی تیایە، باشترین شوێنە بۆ زەفەرپێهێنانم.









هەربۆ دڵنیایی خۆم دەرگای ژورەکەم بەکلیل دادەخەم، تەنانەت ئەو کاتانەش کە خۆشم لە ژورەوەم. خۆ ئەگەر یەکێکم بۆ بێتە ژورەوە، ئەوا هەر زۆر بەئاسانی ئەتوانێت لە پەنجەرەیەکەوە فرێمبداتە خوارەوە. پەنجەرەکان نزمن و بەرزیەکەشی تا جادەکەی خوارەوە چەندەها مەتر دەبێت، ماشێنێکی زۆریش بەو شەقامە کۆنەدا تێدەپەڕێت کە بەرەو قەراغ ئاوەکە دەچێت. ئەوساکەش شێوەی مردنم لە کارەساتێکی ماشێن یان لە خۆکوژی دەچێت.

هێندە میوانی زۆر لە ئوتێلەکەدا نین، دوێنێ ئێوارە جگەلە من تەنها سێ ژن و پیاو و پیاوێکی ئەڵمانی هاوتەمەنی خۆم لە چێشتخانەکەدا دانیشتبووین و نانی ئێوارەمان دەخوارد. بەڵام وامەزەنەدەکەم چەند ڕۆژێکی تر لە کۆتایی حەفتەی جەژنی "پاک"دا میوانی زیاتر ڕوو لە ئوتێلەکە بکات.

پیاوە ئەڵمانیەکە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر تەماشای دەکردم. وابزانم دەیویست قسەم لەگەڵدا بکات، چونکە هەر من و ئەو بەتەنها دانیشتبووین. من ئەڵمانیەکی ڕەوان دەزانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قسەم لەگەڵدا نەکرد و لەبری ئەو پرسیارم لە خۆم دەکرد و دەموت "بڵێیت لەوەوپێش نەمبینیبێت؟".

کاتێکیش دواتر کە چوومە جێگاوە بۆ خەوتن، دەسکی دەرگاکەم ڕاوەشاند، ویستم دڵنیابم کە بەکلیل دامخستووە. نەشچووم بۆ بارەکە. من مەشروبی خۆمم لە ژورەکەدا هەیە _هەر لەئێستاوە بتڵێکی بەتاڵم لە سوچێکدا داناوە. هەر وەختێکیش هەست بەتەنهایی بکەم، ئەوا هەمیشە دەتوانم لەگەڵ پیاوە یەک مەتریەکەدا قسەبکەم. چونکە ئەو دەمودەست لەو کاتانەدا پەیدا دەبێت کە من تەنها بم و حەزبکەم لەگەڵ یەکێکدا بدوێم. ئێستاکە چوار ڕۆژە لێرەدام.





جاڵجالۆکەکە بووە بە تەونەکەی خۆیەوە و گیربووە. لەپێشدا تەونەکەی بەشێوەیەکی ڕێک و پێک دەچنێت. دواتریش بەهەڵە پێ بەتاڵێکدا دەنێت و خۆی بە تەونەکەی خۆیەوە دەنوسێت.

*

لەکاتی نوسینی ئەم دێڕانەدا هەست بەوە دەکەم کە ماریا کاتی خۆی بە چ شێوەیەکی گەورە پشتی تێکردم. تاڕادەیەک لەمن زیاتر کەللەی ساردبوو. ئەو دەیزانی کە من ناتوانم کەرتێکی تر جگە لەو ئافرەتێکی ترم خۆشبوێت و بەدەرلەوەش هەموو ڕێگایەکی لێم داخست. ئەو بەربەستێکی لە نێوانماندا چەقاند.

من هەرگیز لەوەوپێش بەو شێوەیە بیرم لە ماریا نەکردۆتەوە. من سەرم لەوە دەسوڕمێت. وا هەستدەکەم کە تەنها ئا ئێستا خەریکە لەدوای مردنی دایکمەوە دێمەوە سەرخۆم. باوکم نزیکەی ساڵێک لەمەوبەر مرد. من بەڕاستی زۆر دڵم بە دایکم خۆشبوو.

هێشتام هەستێک لەناوەوەمدایە و پێمدەڵێت کە شتێکی گرنگم لەیادکردووە. وادێتە بەرچاوم کە من بەدرێژایی ژیانم بەو پەڕی توانامەوە هەوڵمدابێت ڕوداوێک لە ڕوداوەکانی سەردەمی منداڵیم بیرنەکەوێتەوە. بەڵام هێشتام بەتەواوەتی ون نەبووە، دەڵێیت لەناو قوڵاییەکی تاریکدا مەلەدەکات و منیش لەسەرەوەی لەسەر توێژاڵێکی تەنکی بەستوو سەمادەکەم. هەر کاتێک کە هێمن دەبم و دەمەوێت ئەو شتەم بیربکەوێتەوە کە هەوڵدەدەم لەیادی بکەم، بیرۆکەیەکی نوێم بەخەیاڵدا دێت و دەست دەکەم بە داڕشتنی چیرۆکێکی تازە.





زۆر جار لە ئاگایی خۆم دەترسم. هەر لەخێوێک دەچێت کە نەتوانم دەستی بەسەردا ڕابگرم.

هەر فەنتاسیە هەڵچووەکەشم بوو کە کاتی خۆی ماریای ترساند. ڕاستە سەرسامبوو، بەڵام دەشترسا.

*

لەگەڵ سەفەرەکەی ماریادا جیهان کرایەوە و هەستیشم دەکرد بەجۆرێک لە جۆرەکان ڕزگام بووە. ماوەیەکی زۆری پێچوو هەتا توانیم دیسانەوە پەیوەندی بە کچانەوە بگرمەوە و هەرزووش دەستم لە خوێندنەکەم هەڵگرت. هەستم دەکرد زۆر پیرتربم لەوەی کە قوتابی بم. لەو کاتەوەی کە دایکم مرد، هەرگیز جیهانم بەو شێوە کراوەیە نەدیبوو.

زۆر بیرم لەو نوسەرە گەنجە دەکردەوە کە لەبری بیرۆکەی ڕۆمانەکەم پارەی شەرابەکەی دا و لەسەروشیەوە سەد کرۆنیشی دامێ. لە ماڵەوە چەندەها تێبینی لەو جۆرەم لابوو. ڕۆمانەکەی ئەو لەپاش دوو ساڵ دەرچوو و لەلایەن ڕەخنەگرەکانەوە زۆر بەباشی باسی لێکرا.

من زوو زوو دەچووم بۆ یانەی 7 و "تۆستروپشێلن" و "کازینۆ" و خانەی هونەرمەندان. بەئاسانی دەمتوانی پەیوەندی بە خەڵکانی ئەو شوێنانەوە بکەم. هێندەشی نەبرد هەموو ئەو کەسانەم ناسی کە شایانی ئەوە بوون قسەیان لەگەڵدا بکرێت. گرفتی من لەو کاتەی سەرەتادا لەوەدابوو کە هەمیشە پارەم پێویستبوو.

منیان بە پیاوێکی گەنجی بەئاگا و پڕلەئەندێشە دادەنا، لەڕاستیدا هەرواشبوو. هەموو ئەوانەی کە قسەم لەگەڵدا دەکردن لە من





بەتەمەنتربوون، زۆربەشیان کەسانێک بوون کە لە خەیاڵدا دەژیان یان کەسانێکی بەتاڵبوون، زۆربەی هەرە زۆریشیان خاوەنی ئومێدێکی هونەری بوون، یان بەلایەنی کەمەوە بەلای خۆیانەوە وەک شتێکی هونەریان دەبینی. من وەک کەسانێکی کورتبین و بیر تەسک دەمبینین. هەندێکیان کتێبێکی وەک "کۆمەڵە شیعر" یان ڕۆمانێکیان نوسیبوو، هەندێکی تریش دەیانوت "دەنوسین" یان "دەمانەوێت شتێک بنوسین". ناچاربوون وا بڵێن، دەنا هەستیان بە نوقسانی ڕەوایەتی خۆیان دەکرد. من لەو ناوەندەدا چالاکیەکانم دەست پێکرد.

زۆر جار ئەگەر یەکێکیان، چ ئافرەت بوایە و چ پیاو، لە کاتێکدا کە لەگەڵیدا دەمخواردەوە بیوتایە "من شتێکم نوسیوە" یان "دەمەوێت شتێک بنوسم"، یەکسەر پرسیارێکم لێدەکرد و دەموت "دەتەوێت دەربارەی چ شتێک بنوسیت؟". بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کە ئەو پرسیارەم ئاڕاستە دەکردن وەڵامێکی وایان پێنەبوو. من ئەوەم بەلاوە سەیربوو. هەر لەو کاتەوە _هەڵبەتە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا زیاترێکیش_ پێکەنینم بەوە دەهات کە کەلتور مرۆڤێک پەروەردەدەکات کە هەم دەتوانێت و هەم دەشیەوێت بنوسێت، بەڵام هیچی پێنیە کە بڵاوی بکاتەوە. بۆچی هەندێ کەس شتێک "دەنوسن" و هەر خۆیان بەدەمی خۆیان و بەڕاشکاوی دەڵێن "ئێمە هیچمان پێ نیە کە بیڵێین و بڵاویبکەینەوە؟" ئەی بۆچی دەست لەیەخەی نوسین هەڵناگرن و بچن خەریکی شتێکی تر ببن؟ مانای ئەو ئارەزوە بەتینە چیە کە بتەوێت شتێک پێشبخەیت و لە هەمان کاتیشدا هیچت پێنەبێت؟ بەڵام ئەو بابەتە بەلای منەوە هەمیشە بەپێچەوانەوە بووە. من هەمیشە لەگەڵ یەکێکدا دەپەڕیم، بەڵام قەت پێویستم بەوە نەبوو منداڵ بخەمە جیهانەوە. ئەم ڕستەیەش هەم بەتەوسەوە دەیڵێم و





هەم بەمانای وشەش بەڕاستیمە. هەرچی دەربارەی ماریاشە، ئەوە شتێکی تەواو جیاوازبوو _من پێویستیم بەو بوو.

من ئەو کاتە لەدەفتەری یاداشتەکەمدا بیرەوەری ڕۆژانەی خۆمم دەنوسیەوە، بەڵام بەو مەبەستە نەمدەنوسینەوە کە بڵاوبکرێنەوە، بەڵکو تەنها چەند شتێکی کورتبوون و خۆم بۆ خۆمم نوسیبوومن، مەبەستم لەوەیە شتێکبوو لە بابەتی چوونە ناو خودی خۆم و قوڵبوونەوەیەکبوو لە خۆمدا و هیچی تر. هەر بۆ وێنە لەشوێنێکی دەفتەری یاداشتەکەمدا نوسیبووم؛

"من هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان ناتوانم ڕۆمانێک بنوسم. چونکە ناتوانم سەرنج بخەمە سەر تەنها یەک چیرۆک. ئەگەر لە سەرەتادا چیرۆکێکی خەیاڵی بخەمەڕوو، ئەوا هەر خێرا بەدوایدا چوار چیرۆکی تر یان هەشت چیرۆکی نوێی تر بۆلای خۆی ڕامدەکێشێت و ئەو کاتەش پێویستیان بەڕێکخستنێکی مەزن دەبێت. چوارچێوەیەکی ئەستوری گێڕانەوە دروستدەبێت و کۆمەڵێک چیرۆکی سەرگێژکەری تێئاخنراوی تێدادەبێت کە چەندەها کەسایەتی بە چەندەها ئاستی گێڕانەوەی جیاواز جیاواز شتی تێدا دەگێڕنەوە، یان دەبێت بەو شتەی کە هەندێک پێیدەڵێن "قوتووە چینیەکان". چونکە من ناتوانم بیرنەکەمەوە، ناتوانم دەست بەسەر بیرۆکە نوێکاندا بگرم و نەهێڵم سەردەربهێنن. تاڕادەیەک شتێکی سروشتیە، شتێکە خۆی بۆ خۆی دێت و دەڕوات. من لەناو ئەو بڕە زیادەیەدا خنکاوم کە لەناو خۆمدایە، من هەمیشە خەریکە بتەقم. مێشکم هەمیشە ئەندێشەی نوێ هەڵدەڕێژێت. ڕەنگە هەر لەبەرئەوە بێت کە حەزم لە کورسی بارەکە کردووە، چونکە لەوێدا دەتوانم هەڵیانبڕێژم".



لێرەوە شێوە "سودبەخشینێک بەیەکتری" بەخەیاڵمداهات؛ من بەلامەوە ئاسانبوو کە بیرۆکە و ئەندێشەی نوێ بهێنمە ئاراوە، بگرە زۆر سەختبوو بۆم کە نەهێڵم لەدایکبن. بەڵام بەلای ئەوانەی کە دەیانویست "بنوسن" بەهەمان ئەو شێوەیە نەبوو. زۆربەیان بۆ ماوەی چەند مانگێک یان ساڵێک دەهاتن و دەچوون بەبێ ئەوەی یەک بیرۆکەی بنەڕەتیان بۆ بێت کە دەربارەی بنوسن. من کۆمەڵێک خەڵک چواردەوریان گرتبووم کە بەشێوەیەکی یەکجار گەورە پێویستیان بە شێوازی دەربڕینبوو، بەڵام پێویستیەکە لە بری دەربڕینەکان گەورەتریکبوو، وە حەز و ئارەزوە بەگوڕەکەش لە پەیامەکان مەزنتربوو. من وام مەزەنە دەکرد کە بازاڕێکی بێسنور چاوەڕوانم بێت. بەڵام بە چ شێوەیەک کارەکەم بەرێک و پێکی دەستپێبکردایە؟

هەر ئەو ڕۆژەی کە ماریا سەفەریکرد بۆ ستۆکهۆڵم، چوومە ناو شار و چەند تێبینیەکم لەگەڵ خۆمدا برد، 20 پەندی پڕحیکمەت بوون. من ویستم بازاڕەکە تاقیبکەمەوە، گەرەکم بوو بزانم بە چ شێوەیەک هەنگاوبنێم. بیرم لەوە کردەوە کە پەندەکانم یەکە یەکە بگۆڕمەوە، بۆ نمونە هەر دانەی بەم بە بیرەیەکی فەلی گەورە. بیرۆکەکانم باشبوون، من ئەوە ناشارمەوە کە بەڕاستی نایاب بوون. بەهەرحاڵ ئامادەبووم کە پەندێکی نایاب بگۆڕمەوە بە بیرەیەکی فەل ـ وە بۆ هەتاهەتاشە باسی ئەوە نەکەمەوە کە هی من بووە. گرنگترین شتیش ئەوەبوو کە کەسێکی گونجاوی بۆ بدۆزمەوە، ئەوەش کەوتبووە سەرئەوەی تا چ ڕادەیەک بتوانم بەتەنها و بەشێوەیەکی نهێنی دوو بەدوو قسە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکەم. جگەلەوەش من مەبەستێکی





کورتخایەنم هەبوو؛ من دواهەمین پارەوپولم لە ماریادا سەرف کردبوو و هیچم پێنەمابوو مەشروبی پێبکرم.

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ لە "یانەی قوتابیان"دا چاوم بە نوسەرێک کەوت. پانزە ساڵ لە من گەورەتربوو، با بڵێین ناوی "یۆهانس" بوو. من لەوەوپێش چەندەها جار قسەم لەگەڵدا کردبوو و دەمزانی کە وەک بلیمەتێک من دەبینێ. ڕەنگە هێندەی بۆ دەرکەوتبێت کە قسەکردن لەگەڵ مندا سودبەخشبێت بۆ بواری نوسینەکانی. کەڕەتێکیان پرسیارێکی لێکردم وتی "کەنگێ نیازت هەیە یەکەمین کتێبت چاپبکەیت؟". بەڵام تۆنی وتنەکەی زیاترێک لەگەڵ ئەو پرسیارەدا ڕێدەکەوت کە بڵێت "کەی نیازت هەیە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ ئافرەتێکدا بخەویت؟". منیش لەوەڵامدا وتم "هەرگیز، قەت نامەوێت کتێب چاپبکەم". ئەو قسەیەم کاریگەری تێکرد. لەو کاتەدا هێندە خەڵکێکی زۆر بەو شێوەیە بیریان نەدەکردەوە.

داواملێکرد کە دەعوەتی بیرەیەکی بکەم. پێشم نەوت کە پارەم پێ نیە. لەدڵی خۆمدا وتم "ئەگەر بەشێوەیەکی خراپ شکایەوە، ئەوا لەو کاتەدا کە فاتورەکە دێنن شتێک هەر دەدۆزمەوە". هیچ کەسێک لەوەوپێش تاوانی درۆی نەدابووە پاڵم. بەڵام زۆر دڵنیابووم لەوەی هەموو شتێک بەو شێوەیە دەبێت کە من دەیخوازم. بڕیارمدا هەموو پەندەکانی خۆمی بخەمە بەردەست. هەڵبەتە لەسەرەتاوە نیازم نەبوو بەو شێوەیە بێت، بەڵام دیسانەوە سەفەرەکەی ماریا خەیاڵی گرتم و دەمویست تا ئەوپەڕی ڕادە دڵنیابم لەوەی کە ئەو ئێوارەیە بەدڵی خۆم دەخۆمەوە. پێیدەچوو ئەو بیست پەندە نرخێکی یەکجار زۆری بۆ "یۆهانس" هەبێت. ئەگەر تەنها ئەوەندە بەشێوەیەکی گونجاو بەکاری بهێنایە و خۆشی شتێکی زیادەی بخستنایەتە سەر،





ئەوا دەبووە کەسایەتیەکی نوێ. ئەو لەماوەی شەش ساڵدا دوو ڕۆمانی بڵاوکردبۆوە، زۆر باشیش نەبوون. لە سەرەتای 1970 کاندا بەدەگمەن ڕێدەکەوت کە ڕۆمانێک 20 پەندی پڕمانای لە خۆگرتبێت.
چووین بۆ "گازینۆ". خۆشبەختانە خەڵکێکی هێندە زۆری لێنەبوو، میوانەکانیش تێکەڵەیەک بوون لە ئەکتەر و نوسەر و ئەوانەی کە هەمیشە دەهاتنە ئەوێ و دەیانویست ببنە ئەکتەر یان نوسەر. ئێمەش سوچێکی ئاراممان دۆزیەوە و بۆی دانیشتین.
پاش نەختێک یەکێک لە پەندەکانم بۆ خوێندەوە. یەکسەر "یۆهانس" پرسیارێکی لێکردم وتی؛ «کێ ئەوەی نوسیوە؟». منیش پەنجەم بۆ خۆم ڕاکێشا و دانەیەکی تریشم بۆ خوێندەوە. یۆهانس وتی «تابڵێیت جوانە». دانەیەکی تریشم بۆ خوێندەوە. ئەوجا وتی «ئەی تۆ خۆت نەتوت کە هیچ نانوسم؟» سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و وتم «من وتم قەت نامەوێت بێمە مەیدانەوە و دەرکەوم» دیسانەوە جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە نامەوێت ببمە نوسەر. ئەوجا ئەو سەری ڕاوەشاند. ڕەنگە لەو ناوەندەدا هیچ کەسێک هەرگیز ئەوەی نەبیستبێت کە یەکێک بڵێت "نامەوێت ببمە نوسەر".
هەموو ناوەند و کەلتورە لاوەکیەکان[24] خاوەنی کۆمەڵێک خاڵی بنچینەیی ڕون و ئاشکرای تایبەتی خۆیانبوون. لەو ناوەندەی "یۆهانس"دا هیچ کەسێک نەبوو کە بڵێت "من نامەوێت ببمە نوسەر". وابزانم ئەوە شتێکبوو کە پاش چەندەها ساڵ ئەوجا لێی تێدەگەیشتن

[24] مەبەست لەو کەلتورانەیە کە تایبەتە بە کۆمەڵێک خەڵکی دیاریکراو کە لە بوارێکی تایبەتیدا خۆیان دەبیننەوە، بۆ نمونە لە بواری نوسیندا .و





و دانیان بەوەدا دەنا کە ناتوانن پێی بگەن. بەڵام لە هەموو شوێنێکدا بەو جۆرە نیە. ئێستاکەش لە چەند شوێنێکی جیهاندا، بەتایبەتی لەو شارانەدا کە دابڕاون، دەکرێت کە کتومت پێچەوانەی ئەو وتەیە ببینین و بەهەمان شێوە بەشتێکی شێتانە لەقەڵەم بدرێت. بێگومان تا ئێستاکەش چەند جوتیارێک هەن کە بەتەواوەتی ڕقیان هەڵدەسێت ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان کوڕە گەورەکەیان لە لەوەڕگاوە یان لە گیاڕنینەوە بێتەوە و بڵێت "دەمەوێت ببمە نوسەر".
ئەمڕۆکە زۆرینەی گەنجەکان دەڵێن "دەمانەوێت ببینە کەسێکی بەناوبانگ" و بەڕاستیشیانە. هەر تەنها بیست ساڵێک لەمەوبەر وتەیەکی ئاوها دەبووە مایەی شەرمەزاریەکی گەورە. دەکرێت لە ماوەی تەنها یەک نەوەدا هەموو بنچینە کەلتوریەکان سەرەوخوار هەڵبگەڕێنەوە. لە ساڵەکانی 1950 کان و 1960 کاندا هەروا بێ ئارەق بۆی دەرنەدەچویت ئەگەر لە کاتی گەنجیتدا وتبێتت "دەمەوێت ببمە کەسێکی بەناوبانگ". هەڵبەتە دەکرا بەهێندە ڕازی بوویتایە و بتوتایە "دەمەوێت ببم بە پزیشک یان بە پۆلیس". بەڵام ئەگەر بتوتایە دەمەوێت ناوبانگ دەربکەم، ئەو کاتە ناچاردەبوویت زیاترێک وردیبکەیتەوە و ڕێک پەنجە بخەیتە سەر ئەو بوارەی کە دەتەوێت تیایدا ناوبانگ دەربکەیت _واتە پێش ئەوەی بەناوبانگ بیت دەبوایە هەوڵوتەقەلای خۆتت بدایە. ئێستاکە چیدی بەو شێوەیە نیە. لەکاتی ئێستا خەڵکی لەپێشدا بڕیاری خۆیان دەدەن کە ناوبانگ دەربکەن و دواتریش لەپلەی دووهەمدا ئەو بوارە دێتە پێشەوە کە دەیانەوێن بەناوبانگبن تیایدا. تاڕادەیەکیش کەس گوێ ناداتە ئەوەی کە ئەوکەسە شایستەی ئەو بەناوبانگیەیە کە پێی دەگات یان نا. لە خراپترین حاڵەتدا وەک کەسێکی کەر و بێئەقل لە "بەرنامەیەکی

قۆڕی تەلەفیزۆندا" دەبێت، بۆ نمونە لە بەرنامەی "ڕوداوی ڕاستەقینەدا"، وە لە هەرە خراپترین حاڵەتیشدا دزیەکی سەرنجڕاکێش دەکات. من پێشوەخت ئەم پێشکەوتنەم دەبینی؛ لەوەدەچوو کە بزانم بەناوبانگبوون ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێتە شتێکی سوک و نزم. من هەمیشە خۆم لەو سوکایەتیە لادەدا.

یۆهانس وتی؛ «پیتەر، تۆ خاوەنی کەسایەتیەکی تایبەتیت».

هەموو ئەو پەڕانەم خستە بەردەمی کە بیست پەندەکانم تێدا نوسیبوونەوە و ئەویش خوێندنیەوە. بەئاشکرا دیاربوو بەخیلی پێدەبردم. پرسیارێکی لێکردم و وتی؛

«بەڕاستی تۆ خۆت ئەمانەت نوسیووە؟ خۆ لەشوێنێکی ترەوە لولت نەکردوون؟»

موچوڕکەم پیاداهات. هەر تەنها بیرکردنەوە لەوەی کە شتێک لە کەسانی ترەوە بدزم و وەک نوسینی خۆم بیخەمەڕوو، دڵمی تێکهەڵدەدا و خەریکبوو بمرشێنێتەوە. من تەنانەت ئەو شتانەشم وەک شتی خۆم نەدەخستەڕوو کە خۆم نوسیبوومن.

دیاربوو کە قسەکانم کاریگەری تێکردبوو و ئامادەبوو، بەڵام هێشتام یاریەکی دژواری شەترەنجم لەبەردەمدابوو. یەکەمین کەڕەت زۆر تایبەتە و منیش بڕیارمدابوو زۆر بەڕێکوپێکی ئەنجامی بدەم. هەستمدەکرد خەریکی بنیاتنانی شتێکم کە لە پاشەڕۆژدا بەردەوامی دەبێت، وام مەزەندە دەکرد کە چووبێتم بۆ تاقیکردنەوەیەک، چونکە ئەو یاریە دەبوایە ببوایەتە سەرچاوەی بژێوی ژیانی داهاتووم. ئەگەر ئەو کەڕەتە بکەوتمایە، نەمدەتوانی هەروا بەئاسانی کەڕەتێکی تر هەوڵبدەمەوە.







دواتر وتم «ئەگەر بتوانین لەسەر چەند مەرجێک ڕێکبکەوین، ئەوا دەتوانیت هەر بیست پەندەکە وەک نوسراوەیەکی خۆت بەکاربهێنیت». واقیوڕما و وتی «مەبەستت چیە، پیتەر؟»

وتەیەکی کورتم بۆ باسکرد و لەدواجاردا هێندەم تێگەیاند کە من بەڕاستی نامەوێت ببمە نوسەر. وا تێگەشت کە من جۆرە شەرمکردنێکی ناوازە دەستی بەسەردا گرتووم. وتم من پێمخۆشنیە ببمە جێی سەرنجی خەڵکی و بەشێوەیەکی نهێنی باشترێک دەیگوزەرێنم، هێندەشم پێوت کە من هەرگیز نامەوێت ئاشکراکردنی ناوی خۆم بە پارە بفرۆشم. زیاترێکیش بەشێوەیەکی باوی ئەو سەردەمە هۆی ئەو بڕیارەم بۆ ڕونکردەوە، زیاترێک بەسیاسەتەوە قسەمکرد و وتم؛ «من گەیشتومەتە ئەوەی کە ناودەرکردن پیشاندانی جۆرە نایەکسانیەکە بەرامبەر ئەوانەی کە کەمترێکیان پێیە». بۆچی کەسێکی چەنەباز کە لەبوارێکدا لەپێشەوەیە، سەری بەسەر خەڵکانی تردا بەرزبکاتەوە؟ باشترێک نەدەبوو گەر هەمووان بەهرە و زانیاریەکی هاوبەش و هاوددممان هەبوایە؟ شتێکیشم دەربارەی "خەڵکانی دژ بەدەسەڵات" وت کە بەردەوام سەرهەڵدەدەنەوە و سەختە بنبڕ بکرێن، وابزانم ڕاستەوڕاست دەربڕینی "خەڵکانی ئاسایی"م بەکارهێنا، کە لەو سەردەمەدا دەربڕینێکی تەروبەڕبوو، بەتەواوەتی وەک وتەیەکی سوک وابوو. بەدەرلەوانەش باسی هونەری بێناوی سەدەکانی ناوەڕاستمکرد و وتم؛ «تا ئێستاکەش کەس نازانێت چ کەسێک "قۆلوسپا" و "تریمسکڤاد"ی نوسیوە» دواتریش وتم؛ «بەڵام با بەڕاشکاوی قسەبکەین یۆهانس، تۆ بەڕاستی لەو بڕوایەدایت ئەوە هیچ ڕۆڵێکی هەبێت؟»

سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم. یۆهانس کەسێکی مارکسی_لینینی بوو. لەبەرئەوە ناچاربووم بەپەلە بڵێم «بەڵام ئەوە دەرئەنجامێکی تایبەت بە خۆمە و شتێکە کە من خۆم پێی گەیشتووم و پەیوەندی بە هیچ کەسێکی ترەوە نیە». دواتریش وتم «من هەردوو ڕۆمانەکەتم خوێندۆتەوە و نرخی ئەوە دەبینم کە کەسێک ببێتە زمانی حاڵی خەڵکی، بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە من خۆم لەو ڕۆڵەدا نابینمەوە».

نەختە نەختە یۆهانس هێندە تێگەیشت کە پاش ماوەیەکی کەم لە "یانەی قوتابیان"دا هەر بیست پەندەکە دەخاتە گیرفانیەوە. بەڵام هێشتام زۆر شتی ترهەبوو کە دەبوایە لەسەری ڕێکبکەوتینایە. من یەکسەر لەباسی "پارە"وە دەستمپێکرد. وتم "ئێستاکە زۆر بێپارەم و ئامادەم هەر "پەندێک"ت بە پەنجا کرۆن پێبفرۆشم، بێگومان دەشتوانیت هەر 20 پەندەکە بە 800 کرۆن بکڕیت". لەسەرەتادا وامزانی داوای زۆرم کردووە، چونکە ئەو کاتە 800 کرۆن بۆ قوتابیان و نوسەرانیش پارەیەکی زۆر زۆر بوو. بەڵام لەوەنەدەچوو یۆهانس بیەوێت پاشگەز ببێتەوە. بەڕاستی تابڵێیت 20 پەندی ناوازە و گرنگبوون و بەدرێژایی پێشنیوەڕۆیەک بیرملێکردبوونەوە هەتا توانیم دایانبڕێژم. هەروەها وتم "بێگومان دەشتوانیت بەئارەزوی خۆت چەند دانەیەکیان لێهەڵبژێریت و تەنها پارەی ئەوانە بدەیت کە بەدڵتن، بەڵام لەسەرێکی ترەوە حەیفە گەر جیایانبکەینەوە". من بەتایبەتی بیرم لە یۆهانس کردبۆوە و پێمخۆشنەبوو مافی بڵاوکردنەوەی ئەو شتانەی کە من نوسیبوومن بەچەند کەسێکی جیاوازی بدەم.

یۆهانس وتی «باشە... هەر هەموویان دەکڕم»

ئەوجا وتم «هەرچی دەربارەی لایەنی پارەکەیە کەمێک هەست بەشەرمدەکەم، بەڵام پێمخۆشە ئەوەندە بڵێم کە ئێمە هێشتام لە









کۆمەڵگایەکی سەرمایەداریدا دەژین و ئێستاکەش بەرهەمێکی فیکری وەک "کاڵا"یەک دەبینرێت». پاشان وتم «هیچ جیاوازیەکی واشی نیە لەگەڵ کەسێکی وێنەکێشدا کە پارە لەبری وێنەکانی وەردەگرێت. لەوێشدا شتێک لە خاوەنێکەوە بۆ خاوەنێکی تر دەچێت و بێگومان هونەرمەندەکە قەت ناتوانێت بڵێت من مافی خاوەندارێتی ئەو وێنانەم هەیە کە فرۆشتوومن». وابزانم یۆهانس دڵی بەوە خۆشبوو کە هێندەی بخەمە بەرچاو کە ئێمە شتێکی ئاسایی دەکەین و کەیفی بەوە دەهات کە ئەو لایەنەی بیربخەمەوە.

ئینجا وتی؛ «بەدوری نازانم کە پێویستیم بە هەندێک لەم نوسینانەت بێت و لەو ڕۆمانەدا بەکاریانبهێنم کە ئێستاکە خەریکی نوسینیم».

منیش لە وەڵامدا وتم؛ «شتێکی باش دەکەیت، پارەشی پێ پەیدا دەکەیت و لەوانەشە پارەیەکی هەر زۆرت بێتەدەست، بەڵام بێگومان شایانی ئەوەیت. ڕێدەکەوێت تابلۆیەک بەنرخێکی دیاریکراو بکڕین و دواتر بەپارەیەکی زۆر زیاتر بیفرۆشینەوە. هەر ڕێک وەک ئەوە وایە کە بەشێوەیەکی زیرەکانە پارەیەک بخەیتە ئیشێکەوە».

خۆشبەختانە هەر خۆی هەستیارترین بابەتی دەهێنایە پێشەوە. ئاماژەی بۆ لاپەڕەکانی سەر مێزەکە کرد و وتی؛ «بەڵام من چۆن دڵنیابم لەوەی کە تۆ هەرگیزا و هەرگیز ڕاستی ئا ئەم دێڕانە نادرکێنیت و بڵێیت من نوسیومن».

لەوەڵامدا وتم «من تەنها دڵم بەوە خۆشدەبێت کە پەندەکانم بڵاوبکرێنەوە و وەک وتم نامەوێت بکەومە بەر سەرنجی خەڵکی. حەزدەکەم بڵێم چەندەها تێبینی و نوسینی تریشم هەیە و ڕەنگە لەبواریکی تردا ئەوانیش بهێنینە پێشەوە». ئەگەر دەمی خۆم





لەبارەی تێبینییەکانمەوە دانەخستایە، ئەوا کەرەتێکی تر بواری ئەوەم نەدەبوو کە شتێکی تری پێبفرۆشم.

ئەوەی دواتر شتێکی زۆر گرنگبوو. دەبوایە زۆر بەڕونی تێمبگەیاندایە کە من بەهیچ جۆرێک جگە لەو (یۆهانس)، نیەتم نیە کە نوسراوێکم بدەم بە کەسێکی تر. کتومت ئەوەش خاڵێکی بنچینەیی و گرنگبوو بۆ ئەوەی بتوانم شێوە تۆڕێکی فرۆشتن بنیاتبنێم و لەوێشەوە چەندین مشتەری لە خۆم کۆبکەمەوە. دەبوایە قەناعەتم بە هەموو تاکە مشتەریەک بکردایە کە ئەو، چ پیاو بوایە و چ ئافرەت، کەسێکی هەڵبژێردراوە و تەنها کەسە و باشترین نوسەرمە.

من لە زۆر لایەنەوە لەو بڕوایەدابووم کە ئەو ستراتیجیەم بۆ ماوەی چەندەها ساڵ بەرگەبگرێت. چونکە نوسەرەکان قەت شانازی بەوەوە ناکەن کە کەسێکی نادیار یارمەتی نوسینیان بدات. هەموویان پێیان خۆشە وەک کەسێکی ڕەسەن خۆیان دەربخەن و بەردەوام دەیانەوێت وەک کەسێکی جێباوەڕ و ڕاستەقینە بناسرێن.

بەهیچ شێوەیەک نیگەرانی ئەوە نەبووم کە مشتەریەکانم ڕۆژێک لەڕۆژان قسە بۆ یەکتری بگێڕنەوە. بەهیچ جۆرێکیش لەوە نەدەترسام کە تۆڕەکەم هەڵبوەشێتەوە، چونکە هەر تاڵێکی تەنها لەنێوان من و مشتەریەکی دیاریکراوادابوو. وریابووم و هیچ دوو مشتەریەکم بە تاڵێکەوە نەدەبەستەوە.

یۆهانس چاوێکی بە هۆڵەکەدا خشاند، ئینجا خۆی بەسەر مێزەکەدا چەماندەوە و بەچرپەچرپ وتی؛ «ئێستاکە دووسەد کرۆنت دەدەمێ و چەکێکی شەش سەد کرۆنیشت بۆ دەنوسم، باشە؟»

سەرم بۆ لەقاند. من بەتایبەتی دڵم بە دووسەد کرۆنەکە خۆشبوو، ئەوەش تەنها لەبەرئەوە نەبوو کە دەبوایە پارەی ئەو بیرانەم بدایە



کە داوامکردبوون، بەڵکو بیرم لەوەش دەکردەوە کە ئەو کاتە بانقە داخرابوو و هێشتام لەسەرەتای ئێوارەکەدا بووین. بەشێوەیەکی هێمن و لەسەرخۆ هەروەک جوڵەیەکی بالێت ئاسا دووسەد کرۆنیەک و دەفتەری چەکەکەی دەرهێنا. هەر بەهەمان شێوەش، هەروەک چۆن خەڵکی ئیمزای خۆیان لەسەر ئیستیمارەی داهاتی ساڵانەیان دەکەن، زۆر لەسەرخۆ و بەوردی چەکەکەی نوسی. دواتر هەرلەسەر مێزەکە بەرورووی من پاڵێکی بە پارەکە و چەکەکەوە نا، منیش پەڕەکانم قەدکرد و بەرەورووی ئەو پاڵێکم پێوەنا. دیسانەوە لەوێشدا چاوێکی بە هۆڵەکەدا خشاندەوە، بەڵام چاوی لە پیاوە بچکۆلەکە نەبوو کە بەخۆی و گۆچانە حەیزەرانەکەیەوە ڕێک لەوێدا خەریکبوو پاشقولی لە یەکێک لە بۆیەکان دەگرت.

یۆهانس بەپەلە لاپەڕە قەدکراوەکانی خنیە ناو گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەیەوە و ئەوجا وتی؛ «بڕۆین؟» منیش وتم «دەمەوێت بیرەیەکی تریشی بۆ بخۆمەوە». «زۆر سوپاست دەکەم پیتەر»، هێندەی وت و هەستایە سەرپێ، ئینجا بەرەو دەرگاکەی دەرەوە بەڕێکەوت. چاوم لێبوو لەو کاتەدا کە لە سوچی شوێنی خۆگۆڕینەکە تێپەڕی، بەهێواشی دەستێکی هێنا بە سەر سنگیدا، وابزانم دەیویست خۆی دڵنیابکاتەوە و بزانێت بەڕاستی لاپەڕە بەنرخەکانی لەگیرفانی ناوەوەیدایە یان نا. بەرلەوەی پارەی چەکەکە وەربگرم، کۆپیەکەم کرد. بەڕاستی نازانم بۆ کۆپیمکرد، بەڵام هەستمدەکرد هەبوونی ئەو یادگاریانە لەداهاتوودا شتێکی باشبێت.

یۆهانس مامەڵەیەکی باشی کرد، چونکە دواتر چەندەها جاری پارەکەی خۆی بەو پەندانە پەیداکردەوە. بەڵام هەموو کاغەزە بەهادارەکان بەو شێوەیەن، کەس نازانێت لە داهاتوودا نرخیان

چەندە بەرز دەبێتەوە. لەلایەکی تریشەوە من ئەو کاتە پێویستیم بەپارە بوو. ڕێک پاش ئەو کاتەبوو کە ماریا بەجێیهێشتم، ئەو لە قیتارێکدا دانیشت و بەرەو ستۆکهۆڵم ڕۆیشت.

ماوەیەکی کەم لەمەوبەر یۆهانس کۆچی دوایی کرد. دێرە ورد و تێڕوانینە پوختەکانیشی وەک سیمایەکی تایبەت بە ئەو لەلای خەڵکی دەمێنێتەوە.

من هەر ئەو کاتە بڕیارمدا کە هەر نوسەرە و شێوازێکی تایبەتی بدەمێ. ئەگەر لە پرێکدا شارەکە جمەی بهاتایە لە یەک جۆر نوسەر، ئەوا دبووە شتێکی گومانلێکراو. تەنها یەک "گا"ی بەپیت هەبوو، بەڵام هەوەسی جوتبوونی هێندە زۆربوو دەیتوانی لەگەڵ یەک ڕەوە نوسەردا بپەڕێت.

تەنها یەک کەڕەت لەو یاسایە لامدا و بەتایبەتی یارمەتی "یۆهانس"مدا، کۆمەڵێک پەندی جوان و ئەندێشەی قوڵ و ڕستەم دایە _ئەو خۆی کەڕەتێکیان ناوی ئەو شتانەی نا "داودەرمان". ئەو یەکێک بوو لەو کەسانەی کە ساڵانە ڕێپێوانی مارکسی_لینینیەکانی ڕۆژی یەکی پێنجی ڕێکدەخست، لەبەرئەوە بەدرێژایی ساڵەکان پێشنیاری چەندەها دروشمم دەخستە بەردەستی، بەڵام پارەم لەبەرامبەر ئەو شتانەدا لێ وەرنەدەگرت.

بەهەرحاڵ ئەو کەڕەتەی کە لەیاساکەم لامدا، بیرۆکەیەکی بنەڕەتی چیرۆکێک بوو کە دەربارەی ڤێتنام بوو. لەدووتوێی ئەو لاپەڕەیەی کە یۆهانس سەد کرۆنیەکی پێدا، شتێکی وەک ئەمەی خوارەوەی لەسەر نوسرابوو؛







«لەسەرتای ساڵەکانی 1950دا دوانەیەکی "یەک هێلکەیی" لە لادێیەکی بچکۆلەی سەر بە دەلتای "میکۆنگ" لەدایک دەبن، تەنها چەند خولەکێکیان بەینە. پێشئەوەی تەمەنیان بگاتە شەش مانگ، سەربازێکی فەڕەنسی دەستدرێژی دەکاتە سەر ناموسی دایکەکەیان و دواتریش دەیکوژێت. دوو خێزانی جیاوازیش هەردوو منداڵەکە هەڵدەگرنەوە و لەکاتی گەورەبوونیاندا قەت یەکتری نابینن. یەکێک لە کوڕەکان پەیوەندی دەکات بە "بزوتنەوەی ڕزگاری ڤێتنام"ەوە و ئەوی تریان پشتگیری حوکمەتەکەی سەربە ئەمریکا دەکات. پاش هێرشێکی توند دوانەکە لەناو جەنگەڵێکدا ڕووبەڕوی یەکتری دەبنەوە. هەردوکیان سیخوڕن و بەرلەوەی شەڕێکی گەورەتر ڕوبدات ڕەوانەی ئەوێ کراون و بەتەنهاشن. بەڕواڵەت و سیما کتومت وەک یەکتری وان و هەردووکیان هێندە تێدەگەن کە برای یەکترین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت یەکێکیان بمرێت. هەردوو سەربازەکە وەک یەک بەخێرایی چەقۆکانیان دەردەهێنن، بەڵام لەبەرئەوەی کە دوانەن هەمان سیفاتی بۆماوەیان هەیە و وەک یەک بەرپەرچی یەکتری دەدەنەوە، هەرلەبەرئەوەش لە هەمان کاتدا زامێکی کوشندە دەکەنە یەکتری.

چەند خاڵێکی سەرەکی گرنگ؛ کاتێکی باش بۆ لۆجیکی شەڕ و ئەو هەڵبژاردنە بەکاربهێنە کە هەردووکیان خۆیان لەبەردەمیدا دەبیننەوە. ئەو کەسەی کە براکەی خۆی نەکوژێت، خۆی دوچاری کوشتن دەبێتەوە. براکان فریای ئەوە دەکەون بەر لەمردنیان هیچ شتێک بەیەکتری بڵێن؟ شتێکی نوێیان بۆ دەردەکەوێت؟ (لێرەدا جێگەی گفتوگۆیەکی بچکۆلە دەبێتەوە؟) مەیدانی شەڕەکەش لەیاد مەکە، ئەو دوانەیەی کە مردوون، پێکەوە لەسکی دایکیاندا لە





ئاشتیەکی تەواودا ژیاون، دواتریش هەربە ئاشتی هەریەکەو شیری لە مەمکێکی سەر سنگی دایکی خواردۆتەوە، بەڵام پاشتر یەکتری دەکوژن. بازنەکە کۆتایی پێدێت. کاتی خۆی لە یەک سەعاتدا لەدایک دەبن و پاشانیش خوێنی هەردووکیان گۆمێک پێکدێنێت. کێ دوانەکە دەدۆزێتەوە؟ بەرپەرچی خەڵکی لەپاش دۆزینەوەیان بە چ شێوەیەک دەبێت؟»

یۆهانس ئەو چیرۆکەی نوسیەوە، بەڵام وەک کورتە ڕۆمانێکی درێژ. پاش نزیکەی ساڵێک لە گۆڤارێکی ئەدەبیدا خوێندمەوە و نوسینەکەیم بەلاوە جوانبوو، بەتایبەتیش سەرسامی ئەو زانیاریە زۆرەی بووم کە دەربارەی چەک و تەقەمەنی هەڵیرشتبوو، هەروەها شێوەی وەسفکردنی وردی ژینگەی ڤێتنامیشیم بەدڵبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نائومێدبووم.

بێگومان چیرۆکەکەی یۆهانس بەشێوەیەکی جیاواز کۆتایی دێت؛ ئەو کوڕەیان کە نمونەی بزوتنەوەی ڕزگاری ڤێتنامە، دڵی نایەت براکەی خۆی بکوژێت، هەرچەندە براکەی سەربازە و نۆکەرێکی ئیمپریالیستی ئەمریکیشە. دواتریش خۆی بەشێوەیەکی دڕندانە دەکوژرێت.

لە ڕۆمانەکەدا چەندین جار دوو وشەی "زۆرزان" و "قارەمان" بەکارهێنراوە، بەڵام نەک تەنها بۆ یەکێک لە براکان، بەڵکو بۆ وەسفکردنی هەردووکیان. یۆهانس بەباشی ئەو لایەنەی بەکارهێنابوو کە دوانەکە دوانەیەکی "یەک هێلکەیی"بوون. یۆهانس چیرۆکەکەی بۆ نیشاندانی خاڵێک بەکارهێنابوو؛ ڕۆڵی حوکمدەری سیفاتە بۆماوەکان چەندکەمە لە گەشەکردنی مرۆڤێکی دیاریکراودا.





نامەوێت بڵێم کە گۆڕینی چیرۆکەکە دڵی داخورپاندم، چونکە ئەوە شتێکی چاوەڕوانکراوبوو. زۆرینەی ئەدەبیاتی ساڵەکانی 1970 بەو شێوەیە دەنوسران. ئەو کاتە ئەدەب نەدەبوو بەپلەی یەکەم گرفتەکان بهێنێتە سەر باسوخواس و بیانکاتە بابەتی گفتوگۆ. ئەو کاتە دەبوایە ئەدەب ڕۆڵێکی ڕۆشنبیرکەرانەی هەبوایە.

*

لەماوەی چەند ساڵێکدا لەسەر ئاستی وڵات دەستبەکاربووم و چەند پەیوەندیەکی کەمیشم لە وڵاتە باکوریەکاندا پەیداکردبوو. بەڵام ماوەیەکی زۆرتری ویست هەتاوەکو توانیم لەسەر ئاستی جیهاندا دەستبەکاربم _ئەوەش هەنگاوی داهاتوومبوو.

یەکێک لە پرێنسیپە گرنگەکانم ئەوە بوو کە تێبینیەکم لە یەک جار زیاتر نەدەفرۆشت. جواندەبوو ئەگەر لە ساڵێکدا دوو ڕۆمانی پۆلیسی لەلایەن دوو نوسەری جیاوازەوە دەربچوایە و هەردووکیشیان لەسەر هەمان بیرۆکەی بنەڕەتی داڕێژرابنایە. هەندێ جار ئەو خەیاڵە فریویدەدام، چونکە زۆر خۆشدەبوو بۆ یەک کەڕەت ئەو حاڵەتەم ببینیایە کە دوو نوسەری جیاواز بە چ شێوەیەک هەمان بیرۆکە بەکاردەهێنن.

لەلایەکی تریشەوە دەبوایە وریابوومایە و ئاگام لەو چیرۆکانە بوایە کە لە دانیشتنێکی ئاساییدا دەمگێڕانەوە. نەمدەویست بوار بە ڕەخنەگرێک بدەم کە بڵێت یەکەمین ڕۆمانی ساڵێک لە ساڵەکان لەسەر چیرۆکێک هەڵچنراوە کە لەوەوپێش دەماودەم وتراوە و دواتریش بڵێت هەر خۆم لەسەر یەکێک لە مێزەکانی "تۆستروپشێلن"دا

گوێم لێبووە کە ئەو چیرۆکەیان گێڕاوەتەوە. بەو شێوەیە ناچاربووم چیرۆکەکانم جودابکەمەوە؛ ئەو چیرۆکانەی کە وەک کەسی خۆم لەدانیشتنێکدا دەمگێڕانەوە، لەگەڵ ئەو چیرۆکانەدا کە نیشانەم کردبوون بۆ کاروباری ئیشەکەم. چارمنەبوو و دەبوایە کۆنترۆڵی وردەکاری ناو ئەو چیرۆکانەم بکردایە کە لە دەممەوە دەردەچوون. من ئەو سنوربەندیەم وەک بەربەرەکانیەکی باش دەبینی، چونکە تائەوپەڕی ڕادە فشاری بۆ دەهێنام کە هەمیشە شتێکی نوێ بدۆزمەوە. بەهەرحاڵ تەنها یەک حاڵەتی گرنگم شکدەبرد کە لەو یاسایە بەدەربوو و هەر لە سەرەتای سەرەتاوە ناچاربووم قبوڵی بکەم؛ من کۆمەڵێک چیرۆکی زۆر نایابم بۆ ماریا گێڕابۆوە و پێموانەبوو بتوانم هەر هەموویان وەلاوە نێم. ئەگەر ماریا ڕۆمانە نەرویجیەکانی ساڵەکانی 1980 و 1990ی خوێندبێتەوە، ئەوا گومانم نیە کە تاوناتاوێک قاقایەکی بەرزی پێکەنینی لەدەمەوە هاتۆتەدەرەوە. لەو چەند ساڵەی پێشتریشدا ئەگەر زنجیرەیەک ڕۆمانی بیانی خوێندبێتەوە، ئەوا بێ هیچ گرفتێک لەتوانایدا بووە بە خەیاڵ بگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە لە باوەشمدابوو. من بیرۆکەی بنەڕەتی چەند فیلمێکیشم لە ئەستۆدایە، یان بڵێم لەناو لیستی کارە باشەکانمدایە، هەڵبەتە ئەو دوو جۆرە تێڕوانینە کەوتۆتە سەر شێوەی بینینمان بۆ بابەتەکە. حەزدەکەم بیر لەوە بکەمەوە کە ماریا دەچێتە سینەمایەک و فلیمێکی کاریگەر دەبینێت کە لەسەر بنەمای یەکێک لەو چیرۆکانە هەڵچنراوە کە من وەختی خۆی لەکاتی پێکەوە خەوتنماندا بۆمدەهۆنیەوە و بۆم دەگێڕایەوە. ئەو کاتە لەبری "مافی بڵاوکردنەوە" من پێویستیم بە هیچ جۆرە ڕێزلێنانێکی تر نەبوو.





بەو شێوەیە هەر لە سەرەتاوە تەنها ماریا دەیتوانی وەک "جاڵجاڵۆکەکە" ئاماژەم بۆ بکات و بمناسێتەوە. من هەرگیز نە باسی ماریام بۆ نوسەرەکان دەگێڕایەوە و نە باسی نوسەرەکانیشیم بۆ ماریا دەگێڕایەوە، هەرچەندە کە بۆ دواجار یەکتریمان بینی، من بەتەواوەتی دەستبەکاربووم لەو ئیشەدا. بەڵام من لەگەڵ ماریادا هەستم بەئارامی دەکرد و ئەویش سودێکی لە چاکەکانی من وەردەگرت. "تۆپەڵە ئاڵتون"ەکەی ماریا لە "ڕۆحێکی پیرۆز" لەدایک بوو. بێگومان ئەو نایەوێت پەردە لەسەر ئەو چیرۆکە لابدات. ڕەنگە هەروەک یۆهانس لەوە بترسێت کە ئاشکرابێت، ئەو لەوەدەترسا ورتەورتێک بەشاردا بڵاوببێتەوە کە من 20 پەندەکەم نوسیوە، ئەو بیست تێبینیەی کە دواتر ئاخنیە ناو ڕۆمانێکەوە و ناوبانگی پێدەرکرد. تاڕادەیەک ماریا کتومت هەروەک یۆهانس لە هەمان حاڵەتدا خۆی دەبینیەوە، بەڵام تەنها تاڕادەیەک.

کە شتێکیش دەفرۆشرا، ئیدی کۆتایی پێدەهات و هیچ گرفتێکیشم لەوەدا نەبوو. تەنانەت وەک خەیاڵێکیش هەرگیز بە مێشکمدا نەهات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بیرۆکەم پێنەمێنێت و بەتاڵببمەوە _ئەوە تەنها بیرۆکەبوو کە دەمتوانی بەقوڵی بیری لێبکەمەوە. من لەکاتی گەورەبوونمدا زۆر تەنها بووم، هەر لە تەمەنی هەژدە ساڵیەوە ئەپارتمانی خۆمم هەبوو... بەڵێ ڕاستە، من هەر لەسەردەمی باخچەی ساوایانەوە لەو بوارەدا بەگوڕ مەشقمکردووە.

بەهەرحاڵ کۆپیەکی هەموو ئەو تێبینیانەم دەکرد کە دەمفرۆشتن. کۆپیەکانیشم لە مەلەفێکی تایبەتیدا دەپاراست کە لێمنوسیبوو "فرۆشراوەکان". لەسەروی لاپەڕەکانیشدا ناوی ئەو کەسەم دەنوسی کە پێم فرۆشتبوو و بڕی پارەکەشم دەنوسی. لەسەرەتادا، پێش ئەوەی



هێندە تێبگەم کە ڕۆژێک لەڕۆژان فشارێک لە دەرەوەمدا لەبەرامبەر فشاری ناوەوەمدا دروستدەبێت، ئەو سیستمی پسوڵەی پارەیە تەنها شێوەبوو کە بەکارمدەهێنا. ئەو کاتە کە قسەم لەگەڵ نوسەرەکاندا دەکرد هێشتام دەستم بەوە نەکردبوو کە "دیکتافۆن" بخەمە گیرفانمەوە، هێشتام نەگەیشتبوومە ئەوەی کە گفتوگۆ تەلەفونیەکانم لەگەڵیاندا لەسەر کاسێت تۆماربکەم. هاوکاتیش هەر لەسەرەتای سەرەتاوە کۆپیەکی سەرتاپای هەموو ئەو چەکانەم کردبوو کە وەرمگرتبوون. ئێستاکە هەموو ئەو کۆپیانە و کاسێتەکانیش لە سندوقی بانکێکدا پارێزراون... ئەوا ئەوەشم وت.

چالاکیەکانی من ڕێک لەو سەردەمەدا پەرەی سەند کە ئامێری کۆپیکردن هاتەئاراوە. بۆ ماوەیەکی کەم ناچاربووم کۆپیەکانم لە کتێبخانەی زانکۆ و "بلیندەرن" بکەم، بەڵام هێندەی نەبرد و بوومە خاوەنی ئامێرێکی کۆپی مارکەی "ڕانک ئێکسیرۆکس". لەساڵەکانی 1980شدا لەگەڵ هاتنی کۆمپیوتەردا هەموو جۆرە کارێکی نوسین و کاغەزکاری زۆر ئاسانتربوو، ئەو کاتەش کە بەگوڕ لەدەرەوەی وڵاتدا کەوتمە ئیشکردن، هەمیشە کۆمپیوتەرێکی جانتایی پێشکەوتووم لەگەڵ خۆمدا دەبرد.

بە حوکمی کارەکەم ناچاربووم کۆمەڵێک خەڵکی زۆر بناسم. جارجارێک هەر بۆ تاقیکردنەوە تێکەڵیان دەبووم، بەڵام هەرگیز ئەو کارەم بەلاوە سەختنەبوو. من کەسێکی ڕوخۆشبووم، خۆشەویست و ڕۆح سوکبووم و زۆرکەم ڕێدەکەوت پارەی خواردن و خواردنەوەی چێشتخانەیەک بدەم. نازانم بۆ بەو جۆرەبوو، بەڵام تارادەیەک هەموو کەرەتێک کە فاتورەیەکیان دابەشدەکرد، یەکێک بەشەکەی منی دەدا. هەمیشە بەو شێوەیەبوو.





من خۆمم وەک کانیەکی پڕ لە ئەندێشە دەبینی. بەڵام خۆزگە هەموو ڕاستیەکەیان دەزانی. من وەک شاخێکی بەفرینی ناو دەریا وابووم و ئەوانیش تەنها بەشی سەرئاوەکەیان دەبینی. من بە چ شێوەیەک بمتوانیبایە بەردەوامی بە داهاتەکەم بدەم، ئەگەر هەموو مشتەریەکانم هێندە تێبگەیشتنایە کە من لە ڕاستیدا تۆڕێکی نایابم چنیوە و ڕۆژێک لە ڕۆژان لەبەر زۆری و ئاڵۆزبوونی تاڵە بەرەڵاکانی هەڵدەوەشێتەوە؟

ڕێدەکەوت کە بەکۆمەڵ لەدەوری مێزێکی قاوەخانەیەک کۆدەبووینەوە، ناوی چەند کەسێکیان لەناو لیستەی مشتەریەکانمدا بووایە، بەڵام هەر هەموویان، چ ئافرەت بونایە و چ پیاو، بەتەواوەتی لەو قەناعەتەدابوون کە خۆی تەنها مشتەریمە، بەلایەنی کەمەوە چەند ساڵی سەرەتا بەو شێوەیە بوو. ئەوان لەو بڕوایەدابوون کە من تەنها لەگەڵ یەک کەسدا دەخەوم، من هەمیشە ئەو حاڵەتەم وەک لایەنێکی تایبەت و خۆشی کارە دەگمەنەکەم دەبینی. هیچ یەکێک لە مشتەریەکانم بە هیچ جۆرێک درکی بەوە نەکرد کە من لە ڕاستیدا پیاوێکم کە لەڕادەبەدەر لەگەڵ چەندەها کەسدا ڕادەبوێرم و دەخەوم. هەندێ جار هەستمدەکرد پیاوێکم و کۆمەڵێک ژنم هەیە، لەیەک کاتیشدا خزمەتی هەر هەموویانم دەکرد. من هەر هەموویانم دەناسی، ئەوانیش منیان دەناسی، بەڵام هیچیان یەکتریان نەدەناسی.

ئەگەر لە دانیشتنەکەماندا شەش کەس یان هەشت کەسی لێبوایە، ئەوا پێیدەچوو سێ کەسیان بیرۆکەیەک یان دوو بیرۆکەی بنەڕەتی ڕۆمانێک یان شانۆگەریەک یان فیلمێکی لێکرپیێتم. بەڵام هەر سێکیان پێیانوابوو پلەوپایەیەکی تایبەتیان داگیرکردبێت، بەو شێوەیەش بەردەوامیان بە ڕێزلێنانی یەکتری دەدا. ئەوان لەسەر ئەوە دەژیان.



رێزگرتنیشیان لەخۆیان شتێکبوو کە زۆربەیان دەمێکبوو ونیانکردبوو.
ئەو کاتە رێزنەگرتن لەخۆ شتێکی هێندە نائاسایی بوو کە من هەستم پێدەکرد، بەڵام ڕەنگە ئێستاکە هێندە هەستی پێنەکەم. ئەمڕۆکە "رێزگرتن لە خۆ" ناوی شتێکی هەر زۆر دەگمەنە و هەر زۆر بەکەمی دەبینرێت. بەهەرحاڵ وەک سیفەتێکی باشە، "رێزگرتن لەخۆ" بەتەواوەتی باوی نەماوە.

بێگومان هیچ کەسێکیان نەیدەوێرا لەپرێکدا هەواڵێکی وا بلاوبکاتەوە و بڵێت لە مانگی داهاتوودا ڕۆمانێک بڵاودەکەمەوە کە لەسەر یەکێک لەو بیرۆکە بنەڕەتیان دارێژراوە کە لە منی کریوە. بەڵام لەلایەکی ترەوە خۆم زۆر کەڕەت هەستم بە جۆرە نائارامیەک دەکرد و لەوە دەترسام لەپرێکدا نهێنیەک بدرکێنم، بۆ نمونە بڵێم ڕۆمانە پۆلیسیەکەی "بێریت" کە ڕەخنەگرەکان زۆر بە باشی وەسفیانکرد، لەڕاستیدا لەسەر بیرۆکەیەکی شەش لاپەڕەیی من هەڵچنراوە و بە 4000 کرۆن پێم فرۆشتووە. من لەو کاتانەدا هەستم بەو نائارامی و نیگەرانیە دەکرد کە قاقای پێکەنینێکی شێتانەم لێدەدا، یان ئەو کاتانەی کە مەیلمدەکرد بەپەلە یان زوو زوو لەسەر بابەتێکی سەرەکی لابدەم و بچمە سەر شتێکی تر.

جارێکیان لە "قاوەخانەی شانۆ" دانیشتبووین و ئاهەنگمان دەگێڕا، چونکە "کارن" خەڵاتێکی نایابی بەهۆی دواهەمین ڕۆمانیەوە وەرگرتبوو، ئەو بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە چاوی لەسەر لانەدەبردم. بەئاشکرا دیاربوو کە بێتاقەتە، بەڵام من خۆم زۆر دڵخۆشبووم. لە ڕونکردنەوەی هۆی پێبەخشینی خەڵاتەکەیدا بەتایبەتی ئاماژە بۆ ئەوەکرابوو کە چیرۆکەکەی لەسەر بیرۆکەیەکی جوان و بەسەلیقە هەڵچنیوە. من بەلامەوە زۆر ئاسایی بوو. ئەو باوەڕی بەو





شتانەکردبوو کە دووبەدوو پێموتبوو. هەموو بەهرەکانی خۆی بەکارهێنابوو.

من لەو بۆنانەدا دەسەڵاتێکی گەورەم هەبوو و چێژیشم لێدەبینی. هیچ شتێکی هەڵەم لەوەدا نەدەبینی کە هەست بکەم "خاوەن دەسەڵاتم". ئەی خۆ مەرج نیە دەسەڵات بەشێوەیەکی خراپ بەکاربهێنرێت، من خۆم نمونەیەکی باشی ئەو حاڵەتەبووم. من دەسەڵاتی خۆمم لەگەڵ خەڵکانی تردا دابەشدەکرد. من هەمیشە لێوانلێوبووم لە فەنتاسی، هێندە پڕبووم کە دەستمکرد بە ڕێکخستنی دابەشکردنی دەسەڵاتی فەنتاسیاکانم. ڕەنگە شتێکی بێشەرمانە بووبێت، لەوانەشە شتێکی زۆر دلێرانەم کردبێت، بەڵام لەهەموو بارێکدا بەخشندە و دڵئاوابووم. لەبەرچاوی میدیاکاندا "بێریت" خاوەن دەسەڵاتبوو و من بێدەسەڵات. بەڵام ئەگەر من بمویستایە شوێنێکم لەبەرچاوی میدیاکاندا هەبێت، ئەوا ئەو کاتە بەهۆی کارەکەمەوە، وەک ئەوەدەبوو کە خۆمبکەمە قوربانی. بەڵام من هەرگیز نەمدەخواست جێگایەکی دیارم لەبەرچاوی خەڵکیدا هەبێت.

من پێمخۆشبوو بزانم نوسەرەکان لەبری ئەو هەموو بیرۆکانەی کە دەمدانێ چیان دەستدەکەوێت، تەنها ئەوەندەبوو و هیچی تر. من کارێکم لەسەربوو، واتە ناچاربووم و دەبوایە شتێکم بکردبایە. لە هەمان کاتیشدا ناچاربووم نانی خۆم پەیدابکەم، هاوکاتیش ناچاربووم بەشێکی ئەو داهاتی کارە بۆ خۆم دابینبکەم کە تادەهات زیاتر و زۆرتر پەیوەستی هێز و توانای من دەبوو.

بێگومان کە دەرئەنجامەکان بە باشی دەشکانەوە هەستێکی خۆشمدەبوو و ئەو کاتانە پێموابوو چواردەورم بەڕەوەیەک ئاژەڵی نوسەری خۆم گیرابێت. جارجارێک هەستمدەکرد پاشایەکم و





لەسەردەمێکی فەرمانڕەوایی تاکەکەسێکی ڕۆشنفیکردا[25] دەژیم. من یاریزانێکی زیرەکی شەترەنجبووم، بەڵام بە داشی زیندوو کارامانەتر یاریمدەکرد. حەزمدەکرد بەشێوەیەکی نهێنی بیانبەم بەرێوە و پێمخۆشبوو ئەو شێوەیە ببینم کە نوسەرە لەخۆباییبووەکان خۆیان پێ دەنواند. مایەی ئاسودەییم بوو کە شێوەی سەماکەیان ببینم.

هەرچەندە کە من ناوم لە هیچ تۆمارێکی کارکردندا نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە کارەکەم شایانی ئەوەبێت کە وەک دامودەزگایەک ناوێکی تایبەتی خۆی هەبێت. هەتا ڕۆژێک لەڕۆژان لەسەر ئەو مەلەفە گەورەیەی کە لامدابوو و تێبینیەکانمی تێدابوو نوسیم "یاریدەدەری نوسەر" _ناوێکی زیرەکانەبوو.
کارەکەم پێویستی بە پەیوەندیەکی دوولایەنە هەبوو لەگەڵ نوسەرەکاندا؛ هەم لەماڵەوە و هەم لەناو شاریشدا. من ناچاربووم لە یەک کاتدا هونەری دڵڕاگرتنی چەندەها "برادەری هەرەباش" بزانم. بەو جۆرەش دوچاری میوانداریەکی زۆر و پیاسەی زۆری کۆتایی هەفتەکان دەبووم، هەر زۆر زۆر.

---

[25] مەبەستی لەو جۆرە فەرمان ڕەواییەیە کە تاکە کەسێک دەسەڵاتی بەدەستەوەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەخوازێت سود بە خەڵکی بگەیەنێت و ڕێگە بە هەندێک چاکسازی لە کۆمەڵگادا دەدات، نزیکترین نمونەی ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی 230 ساڵێک لەمەوبەر، هەروەک 'کاتەرینا'ی دوهەمی ڕوسیا و 'گۆستاف'ی سێهەمی سوید .و





هەرئەوەندەش کە پەیوەندیەکم لەگەڵ کەسێکدا دروستدەکرد، ئیدی خەمی ئەوەم نەدەما کە دواتر بەچ شێوەیەک بەرهەمی نوێی پێبگەیەنم. مشتەریەکان هەرکاتێک پێویستیان بە نوسینێکی نوێ ببوایە، خۆیان بۆ خۆیان دەگەڕانەوە بۆ لام. بەو شێوەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا زیاتر و زۆرتر ئالودەی نوسینەکانی من دەبوون. هەندێکیان گەیشتنە ئەو ڕادەیەی کە چیتر خۆیان بیرنەکەنەوە. کە دەیانبینی من لەتوانامدایە ئەو هەموو ئەندێشە نایاب و ڕەنگاوڕەنگانەیان بخەمە بەردەست، لەوەدەچوو ئەو حاڵەتە مێشکیان بکوژێنێتەوە. هەندێکیان ڕاستەوخۆ دەیانوت "هەستدەکەم بەتاڵم".
من خۆم پێمخۆشنەبوو کە خەڵکی ئالودەی من ببن، بەڵام لەڕاستیشدا من لەسەر ئەوە دەژیام. من داهاتم لەسەر ئەوە وەستابوو کە ماسیەکان ببن بە قولاپەکەمەوە. من نە هیچ جۆرە حەشیشێک و نە هیچ مادەیەکی بێهۆشکەریشم دەفرۆشت، نەجگەرە و نە مەشروبی قاچاخیشم پێدەفرۆشتن. تەنها فەنتاسیابوو، فەنتاسیایەکی پاک و بێزەرەر. بەڵام لە هەمان کاتیشدا کلیلی ڕێزگرتنێکی کەلتوریش بوو، کلیلی شتێکبوو کە هەروەک ناسنامەیەکی "پۆست مۆدێرنیزم" ئاڵۆز و دژواربوو.
کاتێک چاوم بە مشتەریەک بکەوتایە کە پێویستی پێم بوایە، بۆ نمونە لە دانیشتنێکی گەورەدا، ڕایدەکێشامە سوچێکەوە، یان دەیبردمە بەردەرگای دەرەوە، یان جاری واهەبوو پەلکێشی دەکردم بۆ ناو تەوالێتێک. ئینجا بە دڵەڕاوکێیەکەوە تەماشایەکی چواردەوری دەکرد و پاشان بەچرپەچرپ دەیوت؛ «هیچت پێیە، پیتەر؟» یان دەیوت؛ «ئیمڕۆ هیچت بۆ من هێناوە؟» یاخود لەوەش سەیرتری دەوت؛ «چ شتێکم بە هەزار کرۆنیەک دەدەیتێ؟»





من پێرستێکی دورودرێژم دەخستە بەردەستیان، نرخی جیاواز و شێوازی هونەری جیاوازیشم لابوو. بۆ نمونە نرخی تاکە سروشێک یان نوسینێکی بچکۆلە کە تەنها بۆ هاندان نوسیبووم بەتەواوەتی جیاوازتربوو لە نرخی بیرۆکەیەکی داڕێژراوی ڕۆمانێکی گەورە، وە هەر زۆر جیاوازتریش بوو لە بیرۆکەیەکی قوڵ و دەوڵەمەندی فیلمێک. من شیعری نیوە تەواوکراو و چارەکی "کورتە ڕۆمانیشم" دەفرۆشت. کەڕەتێکیان کورتە ڕۆمانێکی تەواوم نوسی و دواتر کردم بەسێ بەشەوە، هەر سێ بەشەکەشم بە سێ نوسەری جیاواز فرۆشت، بەڵام بۆ ئەوە نەبوو پارەی زیاتر لە بازاڕەکەدا بکێشمەوە، بەڵکو تەنها هەر بۆ خۆشیبوو و هیچی تر.

گەلێ جار بیرۆکەیەکی تایبەتیم بۆ مشتەریەکی دیاریکراو دەچنی. یەکێک لەو بیرۆکە دوراوانەم بە پارەیەکی زۆر بەو پیاوە گەنجە فرۆشت کە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە یانەی 7دا بینیبووم، بەڵام ئەو کاتەی کە پێمفرۆشت هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو بەهۆی ئەو تێبینیانەوە کە کاتی خۆی خستبوومە ئەستۆی. ئەویش هەروەک چەندەها کەسی تر کاریگەری "بزوتنەوەی هیپی"یەکانی لەسەربوو و هەروەک "بیتلیس"ەکانیش گرنگی بە لایەنی ڕۆحانیەتی ڕۆژهەڵات دەدا. بەڵام جگەلەوانە "ئەنترۆپۆسۆف"یش[26] بوو. جێگەی سەرنجیشمبوو کە زانیاریەکی فراوانی لەبواری فەلسەفەی

[26] لە وشەی 'ئەنترۆپۆسۆفی'یەوە هاتووە؛ بزوتنەوەیەکی ڕۆحانیە کە لەو بڕوایەدان مرۆڤ هێدی هێدی لە ڕێگەی گەشەکردنی کەسایەتیەوە بتوانێت بە زانیاریەکی سەروسروشتی بگات. 'ڕۆدۆڵف شتاینەر' بە دامەزرێنەری ئەو بزوتنەوەیە دادەنرێت.و





مەتریالیزمدا هەبوو، هەر لە "دیمۆکریت و "ئێپیکور" و "لوکریتس"ەوە هەتا "هۆبیس" و "لا مێتری" و "هۆڵباک" و "بوشنەر". بەهەرحاڵ ڕۆژێکیان هاتە لامەوە و وتی «لەکاتی ئێستادا هیچ شتێکم لانیە لەسەری بنوسم، بەڵام ئەو ماوەی چاوەڕوانیەم بە لێکۆڵینەوەی "باگەڤەدگیتا"وە[27] دەکوژم و بەدوای پردێکدا دەگەڕێم کە تێڕوانینی مەتریالیستی و ڕۆحانی پێکەوە ببەستێتەوە». ئەو نوسراوەی کە بەتایبەتی بۆ ئەوم نوسیبوو لەبازنەی ئەو پرسیارانەدا دەخولایەوە و من لای خۆمەوە وەک کارێک ناوی "مانەوەی ڕۆح"م لێنابوو، نوسینەکەم بەکورتی وەک ئەم شێوەیەی خوارەوەبوو؛

ڕۆحانیەکان ڕاستیانکرد، مەتریالیستەکانیش هەروەها. هەموو کەسانی "دوالیست"ی دونیا و هەموو ئەوانەش کە باوەڕیان بە دۆناودۆنی ڕۆح بوو، هەقی خۆیانبوو ئاهەنگ بگێڕن.

ئەو کاتەی کە ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی کەمێک لەسەرو دوانزە ملیاردەوە جێگیربوو، منداڵێکی تایبەتی لە "پۆلیڤیا"دا لەدایکبوو، لە لادێیەکی ناوچە شاخاویەکانی تەنیشت دەریاچەی مەزنی "تیتیکاکا"وە چاوی بەدونیا هەڵهێنا. ناوی "پابلۆ" بوو و لەزۆربەی منداڵەکانی تر جوانتربوو، دەنا وەکی تر هەر لە کوڕە منداڵێکی ئاسایی دەچوو. ئەویش وەک زۆرینەی منداڵی ساوای تر هاواریدەکرد، هەموو توانا سروشتیەکان و غەریزەیەکی هەبوو، بەڵام لەچاو تێکڕای منداڵانی تردا زووتر زمانی پێگەیشت و زووتریش فێری کۆنترۆڵکردنی

[27] 700 دێڕ شیعری ئاینی هیندۆزیە و لە بنەڕەتدا بە زمانی 'سانسکریتی' نوسراونەتەوە، ڕەنگە لە ئەدەبیاتی ئاینی هیندیدا بەناوبانگترین تێکستی خوێنراوە بێت.و

جوڵەی ماسولکەکانی لەشی بوو. هێدی هێدی لەگەڵ گەورەبوونیشیدا، هەموو چواردەورەکەی زیاتر و زۆرتر بۆیان ڕوندەبووەوە کە منداڵەکە هیچ توانایەکی ڕۆحی نیە. چەندین کەڕەت خرایە بەر فەحسی نەخۆشیەکانی دەمار، بەڵام هەموو جارەکان وادەردەکەوت کە هیچ نەخۆشیەکی مێشکی یان پەشێویەکی لەشیی نەبێت. تەنانەت لەچاو زۆرینەی منداڵی هاوتەمەنی خۆیدا زووتر فێری خوێندنەوە و ماتماتیک بوو، بەڵام ڕۆحی نەبوو. پابلۆ کیفێکی بەتاڵبوو، توێکڵێکی بێ میوەبوو، قوتویەکی خشڵی بێ خشڵبوو. لێرەدا بەئاسانی دەکەوینە هەڵەوە ئەگەر بڵێین "لە فرە لایەنەوە توانا ڕۆحیەکانی گەشەی نەکردبوو" _ئەو بڕگەیە بەشێوەیەکی گشتی ناهاوسەنگیەکی ئایدیۆلۆجی بەهێزی تێدایە، چونکە وای نیشاندەدات کە توانا ڕۆحیەکان شتێکن کە شیاوی "گەشەکردنبن"، هەروەک چۆن لایەنە جەستەییەکان یان پڕۆسێسە مرۆییەکانی تر گەشەدەکەن. نەفرینی پابلۆ لەوەدابوو کە بە هیچ شێوەیەک توانای ڕۆحی نەبوو، ئەنجامەکەشی ئەوەبوو کە وەک مرۆڤێکی ئاژەڵی گەورەبوو، بەهیچ جۆرێک ویژدانی نەبوو، بیری لە خەڵکی تر نەدەکردەوە. تەنانەت بیری لە خۆشبەختی خۆشی نەدەکردەوە، تەنها ئەوەندەبوو کە لە چرکەیەکەوە بۆ چرکەیەکی تر دەژیا و تەواو، هەروەک ڕۆبۆتێکی پرۆگرامکراوی زۆرزان دەژیا.

هەر لەو کاتەوەی کە تەمەنی پابلۆ گەیشتە ساڵ ونیوێک، دایک و باوکی نەگبەتی ناچاربوون پەتێکی پێوەبکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەشەی لادێکە سوربوو لەسەر ئەوەی کە وەک هەموو منداڵانی تر بواری بدرێت و بخرێتە بەر خوێندن. لە شەشەم ساڵیەوە بە ماشێنێکی شت گواستنەوە لە ماڵەوە دەیانبرد بۆ قوتابخانە و هەر









بەو ماشێنەش دەیانهێنایەوە ماڵەوە، لە پۆلەکەشدا لەسەر مێزێکی تۆکمە دەیانبەستەوە و مێزەکەشیان بەبرغو بە چیمەنتۆی عەرزەکەوە چەسپاندبوو. ئەو بەلایەوە ئاسایی بوو چونکە بەهیچ جۆرێک هەستی بە شەرم نەدەکرد و هیچ نرخێکی بۆ خۆی دانەدەنا. پابلۆ هەر زۆر بەئاسانی فێری شتدەبوو، لەو بوارەدا تاڕادەیەک لێی دەترسان، یادوەریەکی نایابی هەبوو، هەرزوو یەکێک لە مامۆستاکان وتی کە کوڕێکی بێوێنەیە لە زیرەکیدا. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکانیشدا خەڵکی هێندەیان بۆ ڕونبووەوە کە پابلۆ ڕۆحی نیە. ئەوەش تەنها نوقسانییوو کە هەیبوو.

چەند چرکەیەک پاش ئەوەی پابلۆ هاتە دونیاوە، منداڵێکی تری لەو شێوەیە لەناوەڕاستی لەندەندا لەدایک بوو، کچبوو و ناویان نا "لیندا" و ئەویش لەڕادەبەدەر جوانبوو. لە دەقەی دوابەدوایدا منداڵێکی تری بێ ڕۆح لە شارۆچکەی "بۆپارد"ی سەرقەراغ ڕوباری "ڕاین"دا لەدایکبوو، یەکێکی تریش لە "لیلۆنجو"ی پایتەختی وڵاتی "مالاوی" ئەفریقادا و 12 منداڵی تر لە چین و دووان لە یابان و هەشت لە هیندستان و چواری تریش لە بەنگلادش لەدایکبوون. لە هەر هەموو حاڵەتەکاندا چەند ساڵێک تێدەپەڕی ئینجا دامودەزگای تەندروستی وڵاتە جیاوازەکان دەیانتوانی بە وردی وەسفی ئەو نەخۆشیە دەگمەنە بکەن. بەشێوەیەکی گشتی بەو منداڵانەیان دەوت "ئەو منداڵانەی کە نەخۆشی مێشکیان هەیە"، بەڵام ئەو زاراوەیە بەردەوام لەلایەن خەڵکانی پسپۆڕەوە تاوتوێدەکرا، چونکە ئەو منداڵە بێ ڕۆحانە لەزۆرینەی حاڵەتەکاندا زیاد لەڕادە زیرەکبوون.

تەمەنی پابلۆ گەیشتە بیست ساڵ و تائەو کاتە چەندین جار دەستی درێژکردبوو بۆ ناموسی ئافرەتان و چەند تاوانێکی کوشتنیشی لە





ئەستۆدابوو، هەر لەنێوانیاندا دایکی خۆی کە زۆر دڕندانە بە تەور کوشتبووی. پاش بیست ساڵ لەدوای لەدیکبوونی پابلۆ ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی "WHO" ڕاپۆرتێکی جیهانی بڵاوکردەوە و ڕایگەیاند کە 2000 لەو حاڵەتە لەسەرانسەری جیهاندا هەیە و بۆ تاقیکردنەوە ناوی "LSD"یان لێنا، کە کورتکراوەی " The Lack of Soul Disease"بوو[28]. خاڵێکی ڕاپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتوەکان لە هەموو شتێکی تر سەرنجڕاکێشەرتربوو، لەڕاپۆرتەکەدا سەلمێنرابوو کە منداڵانی "LSD" لە یەک کاتی زۆر کەمدا لەدایک بوون. نزیکەی نیوەی ئەو 2000 حاڵەتەی کە لە ڕاپۆرتەکەدا هاتبوو، لەماوەی کەمترێک لە شەوڕۆژێکدا لەدایکبووبوون، دواتریش پاش چوار ساڵ بەهەمان شێوە 600 منداڵی "LSD"ی تر لەماوەی چەند کاتژمێرێکی کەمدا لەدایک بووبوون و ئینجا پاش هەشت ساڵ شەپۆلێکی نوێی ئەو منداڵانە هاتبوونە دونیاوە و نزیکەی 400 منداڵێکی لەو بابەتە بوون. واتە وەک کات منداڵە "LSD" کان پەیوەندیەکی بەتینیان پێکەوە هەبوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەک شوێنی جوگرافی "بڵاوبوونەوەیان" پەیوەندی بەیەکەوە نەبوو. تەنها پاش چەند چرکەیەک لەدوای لەدایکبوونی پابلۆ لە پۆلیڤیادا، لیندا لە لەندەندا چاوی بەدونیا

---

[28] واتە نەخۆشی نوقسانبوونی یان نەبوونی ڕۆح، بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم بڵێم کە کورتکراوەی 'LSD' هاوکات ناوی یەکێکە لەو مادە بێهۆشکەرە بەهێزانەی کە تا ئێستاکەش لە لایەن هەندێ خەڵکانی ئالودەوە بەکاردێت، گرنگە ئەوەش بڵێم کە بەو کەسانە دەوترێت 'کەسانی بێ ڕۆح'، چونکە هێندە بە هێز خەڵکی بێهۆشدەکات کە لەوە دەچێت کەسەکە ڕۆحی تێدا نەمێنێت.





هەڵهێنا، بەڵام لەو کاتەوە هیچ حاڵەتێکی تری "LSD" نە لە پۆلیڤیا و نە لە لەندەنیشدا ڕوویندایەوە. بەهیچ شێوەیەک گومانیان نەبوو کە نەخۆشیەکە ساری بێت، هەروەها بەهۆی جینەکانیشەوە نەبوو.
کۆمەڵێک ئەستێرەناس هەر زۆر خێرا لێکدانەوەیەکیان بۆ منداڵانی "LSD" هێنایەوە و وتیان ئەو منداڵانە گەورەترین نیشانەی کاریگەری ئەستێرەکانمان نیشاندەدات، بەڵام هەر پاش ماوەیەکی کەم دەرکەوت کە دەرئەنجامەکەیان شتێکی هەڵەشە و ساویلکانەبوو.
کۆمەڵێک توێژەرەوەی هیندی بەهۆی بەکارهێنانی ئامارێکی ورد و گشتی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەویەوە گەیشتنە ئەوەی کە منداڵانی "LSD" هەمیشە لەو کاتانەدا لەدایک بوون کە ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی لە چەند مانگێکی بەر لەدایکبوونیاندا گەیشتۆتە سەرو ئاستێکی دیاریکراو. لەپاش نەخۆشیەکی ساری کوشندە، یان کارەساتێکی مەزنی سروشتی، یاخود شەڕێک کە ژمارەیەک مرۆڤی زۆری تێدا کوژراوە، هەمیشە ماوەیەک تێپەڕیوە ئینجا منداڵانی "LSD" هاتوونەتە دونیاوە، تۆژەرە هیندیەکان هەر زۆر وردبوون لە خەملاندنەکانیاندا؛ ژمارەیەک ڕۆحی دیاریکراو لە گەردووندا هەیە و لەوەش دەچێت کە ئەو ژمارەیە 12 ملیارد بێت. هەموو کەڕەتێک کە ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی لەو ژمارەیە تێدەپەڕێت، کتوپڕ کۆمەڵێک منداڵانی "LSD" بەردەوام لەدایک دەبن هەتا ئەو کاتەی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی دەچێتەوە ژێر 12 ملیارد ڕۆح.
ئەو ڕونکردنەوە نوێیانە هەموو جیهانی هەژاند و بێگومان شێوە تێڕوانینێکی ڕادیکاڵانەی نوێی لە چەندەها بواردا هێنایە کایەوە. تێڕوانینێکی سودبەخشبوو بۆ کڵێسەی کاتۆلیکی و هەر خێرا یەک و دوو شێوازێکی نوێیان دەربارەی کۆمەڵێک پرسیاری گرێدراو و دژواری





کۆن گرتەبەر، بۆ نمونە لەبواری قەدەغەکردنی ڕەسمی کڵێسە بۆ کەرەسەی پێشگرتنی (مەنعکردنی) سکپڕبوون. پاپا و یاریدەدەرە گەورەکانی کڵێسەی کاتۆلیکی خێرا دەستیان بە هەڵگیرسانی بزوتنەوەیەکی جیهانی کرد و هەندێ جار بەنیشانداندانی یەک دروشم ئامانجی خۆیان دەخستەڕوو و دەیانوت؛ "لەگەڵ یەکتریدا بخەون، بەڵام کرم دروستمەکەن!" بەدەرلەوەش دەسەڵاتی کڵێسە بەبێ هیچ چەندوچونێک ڕەفزی ناولێنانی منداڵانی LSD دەکرد لەکڵێسەدا. لەو بڕوایەدابوون کفرێکی گەورە بێت و هەروەک ناونانی سەگێک بێت لە کڵێسەدا.

لایەنی مافی سزادانیش شێوازێکی نوێی وەرگرت. هەندێک لە وڵاتان بەردەوامبوون لەسەر شێوازی سزادانیان و تاوانباری منداڵانی "LSD"یان هەروەک هەموو تاوانبارێکی تر سزادەدا، بەڵام زۆرینەی کۆمەڵگاکان هەرزوو گەیشتنە ئەوەی کە تاوان خستنە ئەستۆی خەڵکانی "LSD" بەهۆی هەڵسوکەوتەکانیانەوە، وەک ئەوە وایە کە تاوان بخەنە ئەستۆی تۆفانێکەوە یان بورکانێکەوە. جگەلەوەش بەردەوام وەک شەپۆلێکی ئاو گفتوگۆیەک بەرز و نزم دەبۆوە؛ تا چ ڕادەیەک کۆمەڵگا _یان تاکە کەسێک_ وەک مۆراڵ مافی ئەوەی هەیە کە منداڵێکی "LSD" بکوژێت، هەڵبەتە لەو کاتەدا کە بەدڵنیاییەوە وەک منداڵێکی لەو جۆرە دەستنیشان دەکرا. جێگەی داخە کە لەڕێگەی فەحسی ئاوی کۆرپەڵەوە نەدەکرا منداڵێکی "LSD" دەستنیشانبکرێت، چونکە بێگومان نەبوونی تواناکانی ڕۆح شتێک نەبوو کە لە جینەکاندا بێت.

لەماوەی دوو ساڵی ڕابوردوودا هەندێک لە منداڵانی "LSD" پێکەوە کۆکرانەوە، تەنها بۆ ئەوەی بزانن بە چ شێوەیەک ڕەفتار لەگەڵ



یەکتریدا دەکەن، لەنێوان یەکەمین ئەو کەسانەدا "پابلۆ"ی پۆلیەکی و "لیندا"ی بەریتانی بوو. هەر پاش ئەوەی کە پشتوێن و قایش و دەمبەستیان لێکردنەوە، یەکسەر بەربوونە یەکتری و بەشێوەیەکی زۆر توند وتیژ و دڵڕەقانە خۆشەویستیان لەگەڵ یەکدا دەکرد، هێندە کێوییانە لەگەڵ یەکتردا دەخەوتن، کە لە ماوەی سەعاتی دواتردا "کاماسوترا"یان[29] کردە شتێکی منداڵانە. پابلۆ و لیندا خاوەنی ڕۆحێک نەبوون کە بەکاریبهێنن و لەڕێگەیەوە ئاوێزانی یەکتری بن، بەڵام ژن و پیاوێک بوون و هەموو غەریزە سێکسیەکانیان لەناوەوەدابوو. دووربوون لە شەرم و شکۆوە و هیچ شتێکیان لەبەرچاو نەدەگرت، چونکە ڕۆحێکیان نەبوو کە زاڵبێت بەسەریاندا یان دەستبەسەر ئارەزوە سێکسیەکانیاندا بگرێت، ئیتر چۆن بتوانن لەپەیوەندیەکی ئاوها گەورەتردا کۆنترۆڵی خۆیان بکەن.

دوابەدوای پێکگەیشتنی نێوان لیندا و پابلۆ، لیندا دووگیانبوو و دواتریش منداڵێکی بوو، ئەوەی جێگەی سەرنجبوو ئەوەبوو کە کچێکی هەر زۆر ئاساییان بوو و وەک هەموو منداڵێکی ئاسایی تر لەش و ڕۆحی هەبوو. بەڵام لەلایەکی تریشەوە دەیانوت؛ بۆچی ئەو حاڵەتە هێندە جێگەی سەرنجبێت کە ڕۆحێکی بەتاڵ بێتە ناو منداڵێکەوە کە لە دایک و باوکی بێڕۆحەوە هاتۆتە دونیاوە؟ ئایا ڕاست و دروست ئەوە شتێک نەبوو کە چاوەڕوانیدەکرا؟ تەنها شتێک کە پێویست بێت بۆئەوەی مرۆڤێک بخولقێنرێت، ئەوەیە کە ڕۆحێک لە 12 ملیارد ڕۆحەکەی گەردوون بێتە ناو لەشی کۆرپەیەکەوە. دیسانەوە

[29] کتێبێکی فێرکاری سێکسی دێرینی هیندیە، تایبەتە بە هەندێ تەکنیکی شێوازی پێکەوە خەوتنی زۆر سەخت و.





هاوسەنگیە گەردوونیەکە لاسەنگ وەستایەوە، چونکە بۆ ماوەیەکی کەم ژمارەی ئەو ڕۆحانەی کە لەبەردەستدابوون، کەمتریکبوو لە وانەی کە داوادەکران.

کچەکەی پابلۆ و لیندایان ناونا "کارتیسیانا"، کە لەناوی فەیلەسوفی فەرەنسی "ڕینێ دیکارت"ەوە[30] وەرگیرابوو، چونکە "کارتیسینا" یەک جار و بۆ هەتاهەتایە هێندەی نیشانی جیهاندا کە ڕۆح دیاردەیەکی جەستەیی نیە. بێگومان ڕۆح شتێکی بۆماوە نیە. سیفاتە لەشییەکانمانە کە دەمێننەوە. ئێمە نیوەی جینەکانمان لە دایکمانەوە بۆ دەمێنێتەوە و نیوەکەی تریشی لە باوکمانەوە، بەڵام ئەو جینە بۆماوانە بەتەواوەتی پەیوەستی لایەنی بایۆلۆجی مرۆڤن _یان لایەنی ئامێریی مرۆڤن. ئێمە نیوەی ڕۆحمان لە دایکمانەوە بۆ نامێنێتەوە و نیوەکەی تریشی لە باوکمانەوە. ڕۆح شتێک نیە کە بکرێت بە دوو کەرتەوە، وە بەهەمان شێوەش دوو ڕۆح ناتوانن یەکبگرن و ببنە ڕۆحێک. ڕۆح شتێکە کە شیاوی دابەشکردن نیە، "مۆنادە"یەکە[31].

ئەوە یەکەمین جارنەبوو کە هاوشێوەی نێوان فەیلەسوفە ڕۆژئاواییەکانی وەک "دیکارت" و "لایبنیز" و قوتابخانە هیندیەکانیانی وەک فەلسەفەی توندڕەوی دوالیستی "سامکیا" دەردەکەوت. دووهەزار وپێنج سەد ساڵ لەمەوبەر "پلاتۆن" و کۆمەڵێک بیرمەندی هیندی ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە ڕۆح چەندەها و چەندەها جاری بێکۆتایی لە لەشی مرۆڤدا جار لەدوای جار لەدایک

[30] ناوی لاتینی دیکارت 'کارتیسۆس'ە.

[31] لەفەلسەفەدا یەکەیەکی ڕۆحیە، وزەیەکی تاکەکەسە کە بەپێی 'لایبنیز' هەقیقەتی بوونەوەر پێک دەهێنێت.



دەبێت و لەدایک دەبێتەوە. کاتێکیش کە هەموو ڕۆحەکانی گەردوون لە هەمان کاتدا لە لەشی مرۆڤدا دەبن، حاڵەتێکی وەستانی تەواوەتی لەدایکبوون دێتە ئاراوە _بەردەوامیش دەبێت هەتا ئەو کاتەی دیسانەوە خەڵکێکی زیاتر دەمرن وەک لەوانەی کە لەسەرلەنوێ لە دایک دەبن.

"کارتیسینا" منداڵێکی دەم بە پێکەنینبوو و هەر لەدوای لەدایکبوونیەوە خێرا ڕەوانەی "خانەی پاراستنی منداڵان" کرا، هەڵبەتە بەهۆی ئەوەوەبوو کە واچاوەڕوان دەکرا دایک و باوکی خۆی نەتوانن خزمەتی بکەن. لەڕاستیشدا هەر هەستیشیان پێنەکرد. ئیدی ڕێگەیان پێدان کە بۆ خۆیان پێکەوە بن. لەو کاتەدا زۆربەی خەڵکی حوکمێکی پێشوەختیان لەبەرچاوادابوو و پێیانوابوو کە شتێکی ناسروشتی و نائاکاری بێت ئەگەر ڕێگە بە خەڵکانی تری "LSD" بەن کە وەچە بخەنەوە. لەپاش هاندانی کڵێسەشەوە، زۆربەی ئەو کەسانەیان بەزۆرەملێ خەساند.

بێگومان لەو ڕۆژەوە خەڵکانی سەر زەوی وەک بوونەوەرێکی ڕۆحانی ڕێزێکی مەزنتریان لەیەکتر دەگرت. خەڵکی هەروا بە ئاسانی تووڕە نەدەبوون لە ڕۆحێک، هەروا بەئاسانیش نەفرینی ڕۆحێکیان نەدەکرد، چونکە لەوانەیە 100 یاخود 100 ملیۆن ساڵی تر دیسانەوە بیبیننەوە.

لەدوای دواهەمین شەپۆلی لەدایک بوونی منداڵانی "LSD"یەوە، ژمارەی دانیشتوانی زەوی بڕێکی باش لەژێر 12 ملیاردەوە وەستا، بەڵام هەموو کەسێک ئەو گەشەکردنەی پێخۆشنەبوو. تاکوتەرای خەڵکی دەیانوت کارێکی سودبەخشە ئەگەر هەزارەها منداڵی "LSD" لە کەمپێکی یان لەشوێنێکی گەورەدا بە مەبەستی بەخێوکردنیان





کۆبکرێنەوە و لە چواردەوریان داببڕن، بۆ ئەوەی دواتر بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێنرێت کە ئەندامەکانی لەشیان لە کاتی پێویستیدا بدرێت بەو کەسانەی کە ئەندامیان پێویستە. کەسانێکی تریش دەیانوت «با ئەو "ئافرۆدیت"[32] و "ئادۆنیس"انە[33] لە سۆزانیخانەیەکی گشتیدا بخرێنە بەردەستی ئەو ژن و پیاوانەوە کە بەبێ ویستی خۆیان لەتەنیایدا دەژین[34].

رێژەی ئەو کەسانەی کە پێیان باشترێکە دیسانەوە ژمارەی دانیشتوانی خەڵکی بگەڕێنینەوە سەرو 12 ملیارد، لە کاتی ئێستاکەدا رێژەیەکی سەدی کەم پێکدەهێنن.

هەندێ جار بۆ ئەوەی مشتەری نوێ پەیدا بکەم، هەندێ لە ئەندێشەکانم دەبەخشیەوە و زۆرجاریش لەبەرامبەریدا داوای هیچ شتێکم نەدەکرد ـ ئێ خۆ تەنانەت لە بازاڕەکانیشدا ببووە شتێکی باو و ئەو کۆمپانیانەی خۆراکیان بەرهەمدەهێنا، خواردنی جۆراوجۆریان بۆ تاقیکردنەوە دەخستە بەردەمی خەڵکی. بەڵام ئەو کاتەی کە مشتەریەکان دەهاتنەوە بۆ لام و داوای بیرۆکەیەکی تێروتەسەلیان

---

[32] لەناو میتۆلۆژیای یۆنانیدا خواژنی خۆشەویستی و جوانیە.

[33] دیسانەوە لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا، 'ئادۆنیس' ئەو کوڕە قۆزەیە کە 'ئافرۆدیت' خۆشی دەوێت.

[34] لێرەدا نوسەر وشەیەک بۆ کەسانی تنیا بەکاردەهێنێت کە بەتایبەتی ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە هۆی ئاینەوە دورن لە سێکس و ژن و پیاوەوە.





دەکرد و منیش کۆمەڵێک ئەندێشەی جۆراوجۆرم دەخستە بەردەستیان، بە هەقی خۆمم دەزانی کە داوای پارەیان لێبکەم.

بۆ نمونە رێدەکەوت نوسەرێک یان کۆلکە نوسەرێک پارەی تەکسی ماڵەوەم بۆ بدات و منیش لەبەرامبەردا لەسەر پارچە لاپەڕەیەکی بچکۆلە یان لەسەر دەستەسرێکی کاغەز بیرۆکەیەکی پوخت و چری کتێبێکم بۆ دەنوسی و دەمدایە. بۆ وێنە لەبری پارەی تەکسیەک بۆ "تۆنسنهاگن" بیرۆکەیەکی کورتی کتێبێکم بەم شێوەیەی خوارەوە لەسەر پشتی فاتورەی چێشتخانەیەک دەنوسی و دەمدانێ؛ "کتێبێک بۆ منداڵان (نزیکەی 100 لاپەڕەیەک) تەنها پرسیاربکە و بەشێوەیەکی هەرەمی بابەتە سەرەکیەکان و لاوەکیەکانی کتێبەکە رێکبخە".

لەوە زیاترم نەدەوت، بەڵام هێندە بەسبوو بۆ ئەوەی گورێک بدەم بە کەسێک لەو کەسانەی کە بەئاشکرا دیاربوو فەنتاسیای پێنەمابوو. ئەوە بەلای مشتەرییەکی رێکەوتەوە بیرۆکەیەکی بلیمەتانە بوو. من جەختم لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویست ناکات کتێبێکی ئاسایی پڕلەپرسیار بنوسێت. هەموو بیرۆکەکە لەوەدابوو کە هانی ئەو منداڵانە بدات، کە کتێبەکەیان بۆ دەنوسێت، کە خۆیان بەپێی لۆجیکی خۆیان دەرئەنجامی پرسیارەکان بدۆزنەوە. لەو کاتەشدا کە چوومە ناو تەکسیەکەوە وتم؛ «بەڵام مەرج ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە ساڵێک خەریکی ئەو پرۆژەیە بیت». من دەمزانی کە ئەو کەسە زۆر ورد ئیش دەکات، هێندەشم دەزانی کە زۆر خێرا ناتوانێت بیربکاتەوە.

زۆرجاریش هەندێ لەو نوسراوە بچکۆلە نایابانەم کۆدەکردەوە کە چەند ساڵێکبوو لێرە و لەوێ لەلام مابوونەوە و دەمکردنە دەستە نوسراوێکی سەرسوڕهێنەر. بۆ نمونە دەستەیەکم لەو نوسراوانە



کۆکردەوە و ناومنا «26 چیرۆکی "هێمایی" (مەجازی) لە "A" تاوەکو "Z"»، ئەو بابەتەم بە 10 هەزار کرۆن فرۆشت. لەڕاستیدا پارەیەکی زۆرم لەبری ئەو کۆمەڵە تێبینیە داوانەکرد، چونکە بەسبوو بۆ ئەوەی سەرجەمی نوسراوەکانی نوسەرێک بخوڵقێنێت.

ئەو کاتە بەردەوام ناچاربووم دەنگەکانی ناو مێشکم بەتاڵبکەمەوە و بیانکەم بە نوسین، یەکێک لەو نوسینانە 52 گفتوگۆی لێدەرچوو. هەروەها ئەو بابەتەش دەکرا سەرجەمی نوسینەکانی نوسەرێک پێکبهێنێت و 15 هەزار کرۆنی بەناوچەوانەوە بوو. دیسانەوە لەوێشدا پارەیەکی زۆرم داوانەکردبوو. تا ئێستاکە دوو گفتوگۆیان کراوە بە شانۆنامەی رادیۆ، لەم ماوەی دوادواییەدا یەکێکی تریان وەک شانۆیەکی یەک بەشی لەسەر تەختەی "شانۆی نەتەوایەتی "بێرگن" نمایشکرد، هەروەها سێ دانەشیانم وەک ئەدەبی گفتوگۆ بەچاپکراوی بینیوە. بێگومان کار لەسەر گفتوگۆکان کراوە و کەمێک گەشەیان پێداوە. یەکێکیان پێکهاتبوو لە گفتوگۆیەکی دورودرێژی، تارادەیەک کێشەی ژیانی، نێوان دوانەیەکی "سیامی" و بەتایبەتیش گرنگیەکی زۆرم بە بەکارهێنانی هەردوو راناوی "من" و "ئێمە" بەخشیبوو. ئەو دوو خوشکە دوانەیە لەبواری تەندروستیدا رووداوێکی سەرسورهێنەربوون، چونکە ناچارانە تا سەرو تەمەنی 60 ساڵی پێکەوە ژیان، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا تارادەیەک جۆرە تێڕوانینێکی پێچەوانەیان بەرامبەر بە ژیان لەلا گەڵاڵەبوو. لەو کاتەدا کە گفتوگۆکەم دادەڕشت، بیرم لەوە کردەوە کە نوسینەکەم جوانترێک دەبێت ئەگەر یەکێکیان وەک منداڵێک لەدایک بوایە کە کۆمەڵێک نیشانەی"LSD"ی تێدا دیاربوایە _هەڵبەتە ئەو کاتە هەر زۆر بەئاسانی لەیەکتری جودادەکرانەوە _ بەڵام من مەبەستمبوو





هێندە دەربخەم کە دوو رۆحی جیا لەیەک تۆپەڵە گۆشتدا لەدایک بوون. مێشکی "دیزی" و "لیزی" بەتەواوەتی سەربەخۆبوون لەیەکتری، بەڵام تەنها هێندەبوو کە حوکم کرابوو بەسەریاندا کە لەیەک لەشدا بژین. تاوناتاوێک زۆر بەتوندی شەڕیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد و بەسەر یەکتریدا دەیان نەڕاند، زۆرجاریش بۆ ماوەی چەند رۆژێک لەسەریەک قسەیان پێکەوە نەدەکرد، ئیدی شەوانە خراپ دەخەوتن، بەڵام هەرگیز ئازاری لەشی یەکتریان نەدەدا.

ئەگەر بمزانیبایە نوسەرێک هێندە توانای هەیە کە بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەسەر رۆمانێکی مەزن کاربکات، بۆ نمونە رۆمانێکی 700 بۆ 800 لاپەڕەیی، ئەوا ئەو کاتە بیرۆکەیەکم بەوردەکاریەوە بۆ دادەڕشت، رویدەدا تا 30 لاپەڕەی بۆ بنوسمەوە. کەڕەتێکیان یەکێک لەو بابەتانەم بە 20 هەزار کرۆن بە نوسەرێکی بەناوبانگ فرۆشت. من خۆم ناوی تێبینیەکەم نابوو "مرۆڤایەتیەکی بچکۆلە" و زۆر بە کورتی هەندێک لە فاکتەرەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەبوو؛

نەخۆشیەکی کوشندە بەناوی "ڤایرۆسی ئەمەزۆن"ەوە، کە لەوە دەچوو لە "مەیمونێک"ەوە سەریهەڵدابێت، بەجیهاندا بڵاوبووەوە و تارادەیەک لەماوەی چەند مانگێکی کەمدا زەویەکی وشکی بەدوای خۆیدا جێهێشت، ئەمرۆکە لەپاش بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیەوە هەموو مرۆڤایەتی تەنها 339 کەسی ماوەتەوە. ئەو کەسانەش لەرێگەی ئینتەرنێتەوە پەیوەندی لەگەڵ یەکتریدا دەگرن.

هەموو مرۆڤایەتی یەکتری دەناسن. لە کاتی ئێستاکەدا کۆلۆنیەکی 85 کەسی لە "تەبیت"دا دەژین، 28 کەسیش لەسەر دورگەکانی "سیشیل"، 52 کەس لە باکوری "ئەلاسکا"، تەواوی 128 کەسیش لەسەر دورگەی





"سڤالبار"، 11 کەسیش لەو شوێنەدا دەژین کە کاتی خۆی پێی دەوترا "مەدرید"، خێزانێکی شەش کەسی لە لەندەندا، 13 کەس لە شاری "شوکویکاماتا"ی "تشیللی" و 16 کەسیش لە پاریسدا دەژین.

واتە زۆرینەی ئەو کەسانەی کە ماونەتەوە کەم تازۆر لەشوێنی دابڕاوی وەک تەبیت و ئەلاسکا و سڤالبار و دورگەکانی سیشیلی ناو ئۆقیانوسی هیندیدا دەژین، بێگومان ئەوەش نیشانەیەکە بۆ ئەوەی کە خەڵکانی ئەو ناوچانە هەرگیز بەر لێشاوی ئەو نەخۆشیە ساریە نەکەوتوون. هەرچی ئەوانەشە کە لە مەدرید و لەندەن و پاریسدا ماونەتەوە، پێیدەچێت کە مادەیەکی کاریگەری دژ بەو نەخۆشیەیان لە لەشدا بووبێت. لەلایەکی تریشەوە ڕەنگە چەند گروپێکی خەڵکانی تر هەبن کە تا ئێستاکە پەیوەندیان بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە نەکردبێت، لەوانەشە تاک و تەرای خەڵکی دابڕاویش هەبن (لەوانەیە لە ڕێگەی ڕوداوەکانی ڕۆمانەکەوە ئەو کەسانە دەربکەون). ئەو کەسانەی کە ماونەتەوە بەو ڤایرۆسەی کە نزیکەی هەموو مرۆڤایەتی سڕییەوە دەڵێن "تۆڵەی ئەمەزۆن"، چونکە دەیبەستنەوە بە داربڕینی شێتانە و بێشوماری جەنگەڵەکانەوە. ئێستاکەش وا مرۆڤایەتی خۆی هەڕەشەی قەلاچۆکردنی لێدەکرێت.

پیشە و توانای زیرەکی ئەو کەسانەی کە ماونەتەوە سنوربەندە. تەنها هەشت پزیشک ماونەتەوە، لەنێوانیاندا یەک پزیشکی دەمار و تایبەتمەندێکی نەخۆشیەکانی دڵ و یەک پزیشکی نەخۆشیەکانی ژنان هەن. لە پاریسدا ژنێکی 58 ساڵە دەژی کە لەپێش نەخۆشیەکەدا یەکێک بوو لەو کەسە پێشەوایانەی کە لەبواری مایکرۆبایۆلۆجیدا لەسەر ئاستی جیهاندا ناسرابوو، ئێستاکەش تەنها کەسە لەو بوارەدا. لە ئەلاسکاشدا کەسێک ماوەتەوە کە کاتی خۆی





پرۆفیسۆربووە لە بواری ئەستێرەناسیدا و لەسەر دورگەی "سڤالبار"یشدا تایبەتمەندێک لەبواری بەفر و چاخە بەفریەکاندا دەژی، هەرلەوێدا چوار زەوی ناسیش ماونەتەوە کە یەکێکیان کارامەیە لە بواری زانستە بەبەردبووەکاندا.

پاش دابڕانێکی 30 ساڵی، کە بەهیچ شێوەیەک خەڵکی کۆڵۆنیە جیاوازەکان وەک جەستە یەکتریان نەدەبینی، پسپۆڕەکان تەبابوون لەسەرئەوەی کە کاتی ئەوە هاتبێت سەرلەنوێ خەڵکانی جیهان بەیەک بگەنەوە. ئەلاسکا و سڤالبار و تەبیت دەتوانن تا دوو یان سێ نەوەی تر خۆیان ڕابگرن، بەڵام بۆ ئەوەی نەهێڵن ئاکامی نەگەتیڤی زاوزێکردن لەناو خودی خێزانەکاندا ڕوبدات، کۆڵۆنیە بچکۆلەکان ناچاربوون بەپەلە خوێنی خۆیان لەگەڵ خەڵکانی دەرەوەی کۆڵۆنیەکەی خۆیاندا تێکەڵ بکەن. دەڵێن لە لەندەن باوکێکی سەرلێشێواو ناچاربووە کچەکەی خۆی دووگیان بکات، بۆ ئەوەی نەهێڵێت کۆڵۆنیەکە بفەوتێت.

هێشتام زۆرینەی ڕێگاکانی جیهان بەڕێک و پێکی وەک خۆیان ماونەتەوە، بە سەدان ملیۆن ماشێنیش هەن کە زۆربەی هەرە زۆریان هێشتام ئیشدەکەن. لە فڕۆکەخانەکانی جیهانیشدا بە هەزاران فڕۆکە ئامادەن کە هەڵسن. لەلایەکی تریشەوە ئەو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیە بچکۆلەیە خاوەنی ئەمبارێکی بەنزینێکی بێسنورن، بەڵام تەنها یەک کەسی شارەزا لە بواری تەکنیکی فڕۆکەدا ماوەتەوە و لە تەبیت دەژی، وە تەنها دوو فڕۆکەوانیش هەن، یەکێکیان لە ئەلاسکا دەژی و ئەوی تریان لەشاری "لۆنگیاردبوین" لە دورگەی سڤالباردا دەژی. وێنەی سەتەلایتەکان وای نیشاندەدات کە هەندێک لە شارەکانی جیهان سوتاون، بەڵام زۆرینەی شارەکان هەروەک 30 ساڵ لەمەوبەر

وەک خۆیان ماونەتەوە. زۆربەی ئاژەڵە ماڵییەکان تۆپیون، بەڵام هەندێکیان ماونەتەوە. لەلایەکی تریشەوە ژینگەی سەر زەوی بە خێرایی بەرەو باشتر دەچێت. تویژاڵی ئۆزۆن خەریکە سەرانسەر چاک دەبێتەوە و کەژوهەوای زەویش لەچاو چەندەها دەساڵەی ڕابوردودا زۆر جێگیرترە.

ئەمە ئەو سیناریۆییە کە تۆ وەک نوسەرێک پێی تێدەخەیت. دووهەمین بڵاوبوونەوەی مرۆڤایەتی بەسەر زەویدا بە چ شێوەیەک دەبێت؟ لەسەرەتای بڵاوبوونەوەیاندا چی ڕوودەدات؟ چ جۆرە کێشە و سەختییەک ڕووبەڕووی یەکە بەیەکەی مرۆڤەکان دەبێتەوە؟ بە کورتی؛ هەست بە چی دەکەیت ئەگەر سەربە کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی بچکۆلەبیت؟ بڵێیت زیاتر هەست بە ئازادی بکەیت؟

تۆ خۆت ڕێک ئەو ڕوداوە هەڵبژێرە کە دەتەوێت لەسەری بنوسیت، بوارەکانی بەردەستت هێندە زۆرن سنوریان نیە، مەگەر فەنتاسیاکانی خۆت سنوریان بۆ دابنێیت. هەرچەندە فریای هێندە ناکەویت کە باسی هەر هەموو ئەو کەسانە بکەیت کەماونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە شتێکی خراپ نەبێت گەر خۆت بۆ خۆت ناوی هەر 339 کەسەکە بنێیت و زیاترێک لەلای خۆت کەسایەتیان ڕونبکەیتەوە، چونکە مادەکەی بەردەستت، چارەنوسی ئەو 339 کەسەیە.

ئەوانەی کە ماونەتەوە بە چ شێوەیەک لەو پەتا کوشندەیە دەڕوانن کە نزیکەی هەموو مرۆڤایەتی سەر ڕوی زەوی سڕییەوە؟ هەر یەکێکیان چ کەسێکی نزیکی لەدەستداوە و ئەو لایەنە بە چ شێوەیەک کاریگەری تێکردوون؟ هێندەت لەیادبێت کە زۆر بەوردی وەسفی ساتە کاریگەر و دڵتەزێنەکان بکەیت. ئەوەندەشت لەبیربێت کە هەموو ئەوانەی کە



ماونەتەوە بێگومان دەبێت لە کاتێک لە کاتەکاندا خەیاڵیان بۆ ئەوە چووبێت کە خۆشیان ڕەنگە ببنە قوربانی ئەو پەتا کوشندەیە.

ئەی ئێستاکە ئەو تاکە کەسانەی کە ماونەتەوە بە چ شێوەیەک ژیانیان دەگوزەرێنن؟ چ خوشک و برایەک ناچاربوون منداڵ پێکەوە دروستبکەن بۆئەوەی ڕەگەزەکەیان نەفەوتێت؟ باوکێک بە چ شێوەیەک ئەو حاڵەتە دەبینێ کە کچەکەی خۆی دووگیان بکات؟ ئەی کچەکەی بە چ شێوەیەک لەوە دەڕوانێت؟

یەکێک لەو کێشە گەورانەی کە دەبێت ڕونبکرێتەوە لەوەدایە کە خەڵکانی سەر کیشوەرە جیاکان بە چ شێوەیەک پەیوەندی بەیەکەوە دەگرن. بەشێوەیەکی تێروتەسەل لەسەر یەکەمین پێکگەیشتن بڕۆ، بۆ نمونە ئەو کاتەی کە خەڵکی تەبیت بۆ یەکەمین جار پەیوەندی بە خەڵکانی ئەلاسکاوە دەکەن. سود لە چ جۆرە ئامێرێکی پەیوەندیگرتن وەردەگرن؟ بڕی ئەو وزەیەی لە کۆلۆنیەکاندا لەبەردەستدایە چەندێکە؟ دەتوانیت لەم بارەیەوە پرسیار لە ئەندازیاران و تایبەتمەندانی بواری ئەلەکترۆنی و کۆمپیوتەر بکەیت.

دەتەوێت کۆمەڵێک کەسایەتی سەرەکی کەم هەڵبژێریت و ڕۆمانەکەتی بەدەوردا هەڵبچنیت؟ یان دەخوازیت ڕوداوەکان لەنێوان کۆمەڵێک کەسایەتی زۆرتردا ڕوبدەن؟ بێگومان مەرج نیە ڕۆمانێکی قێزەوەند دەرچێت ئەگەر بتەوێت هەر 339 کەسەکە بخەیتە ناو ڕوداوەکانی ڕۆمانەکەتەوە، تەنها ئەوەندەیە کە دەبێت بەشێوەیەکی زیرەکانە و ڕون نیشانبدرێن ـڕەنگە ئەوە مۆرکێکی مەزن بە چیرۆکەکەت ببەخشێت.

پرسیارەکان هەر زۆر زۆرن و وەڵامەکانیش لەدەستی تۆدایە وەک نوسەرێک و "خودا"یەک. هەموو چیرۆکەکان بگێڕەوە، بەڵام شێوازی





هونەری دارشتنی تێڕوانینە سەرەکیەکە لەدەست مەدە، مەبەستم لە خودی ئاراستە و جوڵەی چیرۆکە گەورەکەیە. کەخوێنەرێک ڕۆمانەکەت بەتەواوەتی دەخوێنێتەوە، دەبێت فرمێسک بەچاویدا بێتە خوارەوە، چونکە ناچارە دەستبەرداری هەموو کەسایەتیەکانی ئەو ڕۆمانەبێت، کە لە ماوەی چەند حەفتەیەک یان چەند مانگێکی پێشودا لەگەڵیاندا ژیاوە و زۆر بەگوڕ لەنزیکەوە ئاشنایی لەگەڵیاندا هەبووە. ڕەنگە مادەکە ناچارت بکات کە چەند بەرگێک بنوسیت. بەڵام لە هەموو بارێکدا نابێت فریو بخۆیت و ڕۆمانێکی زۆر کورت بنوسیت. ئەوە دوهەمین مێژوی مەزنی مرۆڤایەتیە و تۆش تەنها کەسیت کە ئاگای لەو مێژوەیە.

لایەنی بینینی ئەو خۆشیە بێ وێنەیەش ون مەکە کە لەگەڵ لەدایکبوونی هەر تاکە منداڵێکی نوێدا دێتە ئاراوە. ئەو کاتەش کە چیرۆکەکەت تەواودەبێت، بێگومان یەک دوو نەوەیەک تێپەڕیوە و پێدەچێت ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی گەلێک زیادی کردبێت.

یان لەبری ئەوە ئاراستەیەکی تر هەڵدەبژێریت و کۆتایی بە ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی دەهێنیت. ئەوەشیان دەتوانیت بکەیت. ئەی لەو کاتەدا دواهەمین کەسی دونیا بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئەو، چ پیاوبێت و چ ئافرەت، لەو کاتەدا تەنها کەسی گەردوونە...

لەکۆتایدا دەمەوێت ئامۆژگاریەکی باش بخەمەڕوو؛ لەپێشدا "حەکایەتە ئیسلاندیەکان" بخوێنەرەوە و ئینجا دەستبکە بە نوسین، بەرلەوە تەنانەت یەک دێڕیش مەنوسە. مەسەلێکیش هەیە دەڵێت؛ "ئەو کاتە ڕێگایەک دروستدەبێت کە تۆ پێی تێدەخەیت".

هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم!





من هەرزوو لەوە تێگەیشتم کە یەکە بەیەکەی نوسەرەکان چ شتێکیان لێم دەوێت، مەبەستم لەوەیە بەئاگابووم لەوەی کە پارەیان بە چ شتێک دەدا، بەڵام هاوکات دەبوایە لایەنێکی تریشم بە وردی لێکبدایەتەوە؛ دەبوایە هێندەم بزانیبایە کە چ کەسێک دەتوانێت کار لەسەر چ تێبینیەکی دیاریکراو بکات. لەپێش هەموو شتێکدا دەبوایە شتێکی بەنرخم نەدایە بە کەسێک کە نرخی نەزانیبایە. ئەگەر نوسەرێکی قۆڕ ڕێگەی پێبدرایە کە بەئارەزوی خۆی یاری بە بیرۆکەیەکی "ڕۆلس ڕۆیس" بکات، ئەو کاتە ڕێک وەک ئەوە دەبوو کە فڕێتدابێتە تەنەکەی خۆڵەکەوە. جگەلەوەش هەرزوو دەبووە جێگەی گومان. من هەر لەو کاتەوەی کە لە قوتابخانەدا یاریدەی قوتابیەکانی ترم دەدا، هێندە فێربووم کە وەڵامێکی 10 نمرەیی بۆ کەسێک نەنوسمەوە کە شایانی 5 نمرەبێت. بەهەرحاڵ مەسەلەکە هەر ئەوەندە نەبوو کە پارە پەیدابکەم... نا، نا، من ناچاربووم جۆریەتی ئەو نوسینانەی کە دەمفرۆشتن بەپێی جۆریەتی ئەو نوسەرانە هەڵبسەنگێنم کە پێم دەفرۆشتن. "یاریدەدەری نوسەر" دامودەزگایەکی وردبین بوو.

لە هەندێ حاڵەتیشدا لەبری پارە تێبینیەکی بەنرخم بەشتێکی تر دەگۆڕیەوە و بەجۆرێکی تر هەقدەستیان دەدامێ. ئەگەر نوسەرێکی ئافرەتم بەدڵبوایە، ئەوا لەبری "ساتێکی خۆشی" بابەتێکم پێدەبەخشی. هەستمدەکرد کەسێکی دڵفراوانبووم، چونکە بەو شێوەیە نوسەرە ئافرەتەکە هەستێکی وای لادروستنەدەبوو کە شتێکی لێکڕیبێتم. بۆ نمونە دەموت ؛«دەمەوێت ئەو تێبینیەت هەروا بدەمێ... کە ڕۆیشتیت لەگەڵ خۆتا ببیە، بەڵام وابزانم سەعاتێکی تریش لەلام دەمێنیتەوە، وا نیە؟»





ئافرەتان لەبواری گۆڕینەوەی دیاری و چاکەدا زۆر باشتریّکن وەک لەوەی مامەڵەی ئیشێک بکەن. زۆرجار کە نوسراوێکی ئامادەم بۆ شانۆگەریەک یان ڕۆمانێک پێدەبەخشین، لەڕادەبەدەر کاری تێدەکردن. ئیدی گەر ژنی بەمێردبوونایە یان بە بەشێوەیەک لە شێوەکان دەستگیرانی کەسێکی تربوونایە، هیچ گرنگیەکی نەبوو. لە هەموو سەردەمەکاندا پێشبینیکردنی پاشەڕۆژێک کە بۆنی دەسەڵات و ناوبانگدەرکردنی لێهاتبێت، هەمیشە وای لە ئافرەت کردووە کە ئارەزوی سێکس بکەن، وایلێکردوون حەز لە ئەڤین بکەن.
هاوکات لەو حاڵەتانەشدا ڕویدەدا کە نهێنی پۆشینی کارەکەمان مەرجێکی ئەو نوسەرەبێت. ئافرەتان توانایەکی سەرسوڕهێنەریان تێدایە و دەتوانن ئەوەندە بشارنەوە کە سێکس لەبری دەستکەوتنی شتێک بەکاربهێنن. من هیچ شتێکم بە ئافرەتەکان نەدەفرۆشت، بەلایەنی کەمەوە ڕێک وەک پێچەوانەکەی وابوو _ئەوان شتیان بە من دەفرۆشت.
من دەستم لەوە هەڵگرتبوو کە کچانی دەرەوە بهێنمەوە. هەستمدەکرد ئەو تەمەنەم بەسەربردبێت، بەڵام خۆشبوو بۆ ماوەیەک بەنهێنی لەگەڵ کەسێکدا ڕابوێرم و بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە هەستێکی قوڵ تێکەڵی بابەتەکە بکەم. ئەو کاتە ڕابواردنی نهێنی شتێکی ئاسایی نەبوو.

*

بەشێکی گرنگی بازاڕەکەم ئەو نوسەرانەبوون کە شەش حەوت ساڵێک لەوەوپێش ڕۆمانێک یان کۆمەڵێک کورتەچیرۆکیان بڵاوکردبۆوە و لەو





کاتەوە ئیدی هیچی تریان نەنوسیبوو و دەنگیان نەمابوو. ئەو کەسانە بوون کە نائومێدبوون. زۆربەیان بە بەردەوامی دەهاتنە بازنەی ئەدەبیەوە. هەندێکیان هەمیشە غەمگین و دڵتەنگ دەهاتنە بەرچاو، بەڵام هەرئەوەندەی لەناکاوێکدا بیرۆکەیەکی وردی ڕۆمانێکیان دەخرایە بەردەست، خێرا دەکرانەوە و زۆرجاریش ئامادەبوون پارەیەکی باشی پێبدەن. لە حاڵەتە هەرە خراپەکانیشدا، هەر بەو پارەیەی کە دەیاندا، چوار پێنج لاپەڕەی یەکەمیشم بەخۆڕایی بۆ دەنوسینەوە، تەنها بۆ ئەوەی کە بیانخەمەوە سەر پێ، تەنها بۆ ئەوەی گوڕێکیان پێبدەمەوە و دەستپێبکەنەوە.
کۆمەڵێکی تر ئەو نوسەرانەبوون کە باشیان دەنوسی، بەتەواوەتی دەسەڵاتیان بەسەر دارشتنی زمانەوانیدا هەبوو و لەو بوارەدا مامۆستابوون، بەڵام لە هەمان کاتدا نائومێدیشبوون، چونکە هیچی وایان لا نەبوو کە باسی بکەن. من زیاتر حەزمدەکرد لەگەڵ ئەو گروپەدا کاربکەم. زۆرجار شتێکی هەر زۆر کەمیان دەویست _ڕێگەشم بە خۆم نەدەدا کە زیاد لەڕادە پێداگرم. نەمدەتوانیّ کۆمەڵێک تێبینی پڕ لە توانای گێڕانەوەی فەنتاسیا یان زانیاریەکی خەیاڵی بدەمە نوسەرێک کە بە وەسف و دەربڕینێکی بەهێز بەناوبانگبوو، من بەهیچ جۆرێک ئەوەم نەدەکرد. بەڵام دەمتوانی شتێکیان بخەمە بەردەست کە لەسەری بنوسن، بۆ نمونە سەرگوزشتەیەک یان ئەندێشەیەکی وەستایانەم دەدانیّ، بەو شێوەیەش ئەو جۆرە نوسەرانە بەردەوامیان بە کارەکانیاندەدا و بەرەو ئامانجێکی نویّ دەڕۆیشتن. دواتریش باسی هەندێک لەو نوسەرانەیان دەکرد و دەیانوت "لەپڕێکدا پێشکەوتنیان" لە نوسینەکانیاندا بەدەستهێناوە. من ئەو دوو وشەیەم (پێشکەوتنێکی لەپڕ) بەدڵبوو. شێوە ڕزگاربوونێکی مەزن لەوەدا دەبینرێت کە شتێک





ڕوودەدات، شتێک دەگاتە حاڵەتی تەقینەوە و لەناکاودا دەبێتە هۆی هەنگاوێکی مەزن و پێشکەوتنێک ـزۆر جار تەنها پێویستیت بە یەک مشت باروتی وشک دەبێت.

من بۆیە بەتایبەتی نوێنەرانی ئەو کۆمەڵە نوسەرەم خۆشدەویست، چونکە زۆربەی جارەکان بەشێوەیەکی زیرەکانە و ڕێکوپێک ئەو مادەیەیان بەکاردەهێنا کە دەمدانێ. کاتێکی باشیان بۆ تەرخاندەکرد و بابەتەکەشیان خەسار نەدەکرد. ڕەنگە بتوانین بڵێین نوسەری مەزن نەبوون، بەڵام وەستابوون و هونەری نوسینیان دەزانی. "یاریدەدەری نوسەر" پڕاوپڕ لەگەڵ ئەم گروپەدا ڕێکدەکەوت، لەوێدا تەنها بیرۆکە و ئەندێشەی زۆر نایاب بەکاردەهێنرا. بەڕاستی نامەوێت هێندە بشارمەوە کە ئەو نوسەرانە توانایەکیان هەبوو کە من خۆم بەهیچ شێوەیەک نەمبوو؛ ئەوان دەیانتوانی بە مێشکێکی ئارامەوە دانیشن و بۆ ماوەی دوو یان سێ یان چوار ساڵ لەسەر یەک ڕۆمان کاربکەن، لەڕادەبەدەریش پێیان خۆشبوو، گەورەترین چێژیان لێوەردەگرت. زۆرینەیان مامۆستابوون لەبواری جوانناسیدا. زۆر حەزیان لەهۆنینەوەی زمان دەکرد، وەسفێکی وردی کەسایەتیەکانیان دەخستەڕوو و درێژەیان بە شێوەی هەستکردنی هەموو کەراکتەرەکانی ڕۆمانەکە دەدا. بەڵام زۆرینەی ئەو شێوازی کارکردنە مەکراویەیان لەسەر زمان بەلای منەوە کەمێک دەستکرد و هەڵبەستراوبوو، ناسروشتی و هەڵچنراو دەهاتە بەرچاوم. بەپێچەوانەی ئەو شێوازی قوڵبوونەوەیە لەلایەنە هەستیەکاندا و نیشاندانیان، من خۆم سەرقاڵی بیرۆکەکانی خۆم بووم، نە هەڵیشم دەبەستن و نە دەستکردیشبوون، وەک پۆلە باڵندەیەک بەرورووم دەهاتن و منیش





هێندەم لەسەربوو دەستیان بۆ بکەمەوە و بەخۆشیەوە پێشوازیان لێبکەم.

پەیوەندی سودبەخشینی دولایەنەی نێوان نوسەرەکان و "یاریدەدەری نوسەر" کتومت لەناو پەیوەندیەکی پەرۆشانەی نێوان سروشتێکی خۆبەخۆ و کارێکی هونەری تەواوبوودا دەبینرایەوە. بێگومان بیرۆکەکان لە مێشکی مندا لەدایک دەبوون، بۆ نمونە لەو کاتانەدا کە پیاسەیەکم دەکرد، بەڵام دواتر کاری سەختی ڕازانەوەیان دەخرایە سەر ئەستۆی مامۆستا نوسەرەکان. لە هەموو بارێکدا ئەوان لەو بوارەدا زۆر باشترێکبوون لە من.

بەو شێوەیە کاری هەر یەکێک لە نوسەرەکان دیاریکراوبوو. بەڵام ژمارەیان زۆربوو، چەند نوسەرێکی زۆر لە یەک کاتدا خەریکی نوسینبوون و هەر هەموویان ئیشیان بۆ من دەکرد. لەدڵی خۆمدا دەموت "ڕەنگە لەپاش مردنم، چیتر هیچ چیرۆکێک نەمێنێتەوە کە بیگێڕنەوە"، من بیرکردنەوەی بەو جۆرەم بەلاوە خۆشبوو. من هەموو ساروخەکانم تەقاندبوو، هەموو باروتەکەم بەیەک کەڕەت سوتاندبوو. لەپاش منیشەوە دەبوایە بێدەنگی باڵی خۆی ڕاکێشایە. دەبوایە هیچ بیرۆکەیەکی ورد و زیرەکانە نەمایەتەوە، دەبوایە هیچ شتێک نەمایەتەوە کە بیریان لێبکردایەتەوە. من ئامێرێکی گەورەم بەڕێوەدەبرد، من نایابترین و گەورەترین فیستیڤاڵی ئەدەبیم ڕێکخستبوو، وە زۆر بەنهێنیشەوە کارەکەم ئەنجامدەدا.

سێهەمین گروپی مشتەریەکانم لە هەموو ئەو کەسانە پێکهاتبوو کە لە ژیانیاندا هیچیان نەنوسیبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوەتی دڵنیابوون لەوەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبنە نوسەر. لەسەرەتادا گەورەترین گروپم بوون و بەهیچ شێوەیەکیش نائومێدیان





پێوەدیارنەبوو. لەدیدەیاندا بەناوبانگی دەبینرا و پڕبوون لە چاوەڕوانی. نوسەرێکی خەفەبووبوون و تەنها ئەو کاتە نائومێد دەبوون کە بۆیان دەردەکەوت کە پارەیەکی زۆریان داوە بە بیرۆکەیەکی نایابی ڕۆمانێک کە هەرگیز ناتوانن بینوسن. بەو شێوەیەش لەژێرەوە بەدەستێکی نهێنی پەردەم لەسەر چەندەها حاڵەتی خۆهەڵخڵەتاندن هەڵدەماڵی. من ئەو کارەم بە شتێکی گرنگ دەزانی. پێیدەچێت شتێکی باشبێت گەر بیبیتە هۆی دەرخستنی هەقیقەتی خەڵکی و وایان لێبکەیت کە بزانن لە هەقیقەت هەڵهاتوون. "یاریدەدەری نوسەر" بەتایبەتی وەک هاندەرێکی "خۆناسین" وابوو. دەبوایە چەندەها فرمێسک بسڕمەوە. بەو شێوەیەش هەندێ جار سودم لە توانای دەروون ناسیەکانی خۆم دەبینی.

من هەمیشە خۆمم وەک دەروونناسێکی زیرەک دەبینی. بێگومان گرنگترین شت بەلای دەروونناسێکەوە ئەوەیە کە مرۆڤ بناسێت، منیش لەو بڕوایەدابووم کە شارەزاییەکی فراوانم لەو بوارەدا هەبێت، بەتایبەتیش بڕێکی زۆر لەو هەموو شانۆگەری و فیلمانەوە فێربووبوم کە لەوەوپێش بینیبووم. لەلایەکی تریشەوە ئەو کاتەی بەسەر شارەکەدا دەفڕیم و لە پەنجەرەکانەوە تەماشای ماڵەکانم دەکرد، شتێکی زۆری دەربارەی ژیانی خەڵکی فێردەکردم. من تەماشای هەزاران ماڵم دەکرد. هەموو کەسێک بواری ئەوەی نەبوو تەماشای هەزاران ماڵ بکات.

بەدەرلەوەش کەسێکی دەروونناس دەبێت بتوانێت دڵنەوایی خەڵکی بداتەوە، ئەوەش توانایەک بوو کە لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا فێری بووم. دڵدانەوە مانای ئەوەیە کە وشەت لێنەبڕێت، بەو شێوەیەش دڵدانەوە شتێکە کە خزمایەتیەکی زۆری لەگەڵ فەنتاسیادا هەیە. کە





لەسەرەتای فیلمی "گڵۆپەکانی شار"دا "کالڤیرۆ" دڵنەوایی "تێری" دەداتەوە، هانا بۆ سەرچاوەی ڕوانگە و تێڕوانینەکانی خۆی دەبات. "کالڤیرۆ" کەسێکی ئەلکحولی و گاڵتەجاڕێکی بێپارەشبوو، لەو حاڵەتەدا ئەو دوولایەنە کۆبونەوەیەکی نایاب بوو. بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر خۆت گەورەترین نائومێدی ژیانت بەسەرداهاتبێت، ئەو کاتە ئاسانترێک دەتوانیت دڵنەوایی کەسێکی تر بدەیتەوە.

"تێری" لەسەر جێگای خەوەکەی "کالڤیرۆ" پاڵکەوتوو و قژە ڕەشە درێژەکەی بەسەر چەرچەفە سپییەکەدا بڵاوکردۆتەوە. پزیشکەکە جێیهێشتوون و لەوێدا "تێری" لەپاش هەوڵێکی خۆکوژی خەبەری دەبێتەوە. "کالڤیرۆ" تەماشایەکی دەکات و پێی دەڵێت؛ سەرت دێشێ؟

تێری؛ «لە کوێدام؟»

کالڤیرۆ؛ «لە ژورەکەی مندایت. من لە دوو ئەپارتمانی سەروی تۆوە دەژیم»

تێری؛ «چی ڕویداوە؟»

کالڤیرۆ؛ «ئمم... ئەم ئێوارەیە کە گەڕامەوە بۆنی غاز لە ژورەکەی تۆوە دەهات. منیش دەرگاکەم شکاندیت و تەلەفونێکم بۆ پزیشکێک کرد، دواتریش پێکەوە تۆمان هێنایە سەرەوە بۆ ئێرە»

تێری؛ «بۆ نەتهێشت بمرم؟»

کالڤیرۆ؛ «جا پەلەی چیتە؟ ئازارت هەیە؟ (تێری سەری بۆ ڕادەوەشێنێت) ئەوە لە هەموو شتێک گرنگترە. هەموو شتەکانی تر خەیاڵن. پێگەیشتنی ئاگایی مرۆڤ بە بلیۆن ساڵی پێچووە، تۆش هەروا دەتەوێت بیسڕیتەوە؟ ئەی پەرجوی هەموو بوونەوەرەکان چی؟ لە هەموو شتێکی تری سەرانسەر گەردوون گرنگترن. ئەستێرەکان دەتوانن چی بکەن؟ هیچ ، هەر بۆخۆیان لەئاسماندا وەستاون و تەواو.





ئەی خۆر _گڕی خۆی بە بەرزایی دوو سەد هەزار میل هەڵدەدات _ ئێ، ئەی پاشان چی؟ ئەو هەموو سەرچاوە سروشتیانەی خۆی بەفیرۆدەدات. خۆر دەتوانێت بیربکاتەوە؟ بەئاگایە؟ نەخێر، بەڵام تۆ بەئاگایت. ("تێری" خەوتووە و بەدەنگێکی بەرز دەپرخێنێت) بمبوورە، خەتای من بوو!

دواتریش چەند جارێکی تر لەفیلمەکەدا "کالڤیرۆ" بەهەمان شێوە ناچاردەبێت ویستی ژیان لەناو ئەو کچە سەماکەرەی بالێتدا بهێنێتەوە دەرەوە، ئەو بەردەوام لە جێگادا کەوتووە چونکە قاچەکانی ئیفلیج بوون. لە شوێنێکی فیلمەکەدا پێی دەڵێت؛ «گوێ بگرە! کە من منداڵبووم هەمیشە گلەییم لە باوکم دەکرد و دەموت یاریم نیە. ئەویش دەیوت؛ (کالڤیرۆ ئاماژە بۆ کەللەی سەری خۆی دەکات) ئا ئەمە مەزنترین یاریە کە تا ئێستاکە خوڵقێنرابێت. نهێنی هەموو ئاسوودەییەکان لێرەدایە!»

زۆرجار نوسەرە خەفەبووەکان[35]، هەرچی دەربارەی پاشەڕۆژیانە وەک نوسەرێک، چاوەڕوانی ڕۆڵێکی خەیاڵی "یاریدەدەری نوسەر"بوون لەو بارەیەوە. هەرئەوەندەی ئەندێشەیەکی نایابیان دەکەوتە دەست، ئیتر وا چاوەڕواندەبوون کە ئەوی تری خۆی بۆ خۆی بڕوات. بێگومان بەو شێوەیەش نەبوو. هەبوونی بیرۆکەیەکی باش بەس نیە، تەنانەت بیرۆکەیەکی پڕلە وردەکاری و پتەویش بەس نیە. ڕەنگە واباشترێک بێت کە بیرۆکەکە هێندە زۆر وردەکاری تێدا نەبێت، لەوانەیە

---

[35] هەڵبەتە مەبەستی لە گروپی سێهەمی مشتەریەکانیەتی، کە هیچیان نەنوسیوە و لای خۆیانەوە دڵنیان کە دەبنە نوسەر.و





واباشترێک بێت کە زۆر پتەو نەبێت، بەڵام لەسەرو هەموو شتێکەوە دەبێت توانای نوسینی ڕۆمانێکی تەواوت هەبێت، دەبێت هێندە توانات هەبێت کە گێڕانەوەیەکی باوەڕپێکراو دابڕێژیت، وە بەدەرلەوەش دەبێت بەسەر هەندێک دارشتنی بنچینەیی زمانەوانیدا دەسەڵاتت هەبێت. هەرچەندە زۆر کەم ڕێدەکەوێت کە لەو بوارەدا شکستی بهێنیت. ئەگەر پاش 12 ساڵی قوتابخانە فێری نوسین نەبوویت، ئەوا باشترێکە تازووە بچیت خولێکی فێربوونی نوسین بخوێنیت. چەندەها خولی فێربوونی نوسین هەن، بازاڕێکی فراوانیان هەیە. ئەو شتەی کە نوقسانە ئەوەیە کە شتێک بدۆزیتەوە کە لە سەری بنوسیت، ئەوەش ناکرێتە وانەیەک و بچیت بیخوێنیت. هیچ خولێک نیە فێری ئەوەت بکات کە شتێک بدۆزیتەوە کە لەسەری بنوسیت. بەڵام من هەبووم. من ئەو کارە نوێیەم بەهۆی ئەو نوقسانیەوە داهێنا.

زۆربوون ئەو کەسانەی کە دەیانویست ببنە نوسەر و تەنانەت شتێکی هێندە بنچینەیی وەک ئەزمونی ژیانیان لەلا دەست نەدەکەوت. ئەوە تێنەگەیشتنێکی پۆست مۆدێرنیە کە لەو بڕوایەدابێت لەپێشدا بتوانیت بنوسیت و دواتریش بژیت. زۆربەی گەنجەکان بەپلەی یەکەم بۆیە دەیانەوێت ببنە نوسەر، چونکە پێیان خۆشە وەک نوسەرێک بژین. ئەو کاتە شتەکان سەرەونخوندەکەینەوە. لەپێشدا دەبێت بژیت، ئەوسا ئەو لایەنە هەڵبسەنگێنیت کە شتێکت پێیە بیڵێیت یان نا، ئەوەش شتێکە کە دەگەڕێتەوە بۆ خودی ژیان. نوسین بەرهەمی ژیانە... ژیان بەرهەمی نوسین نیە.

بۆ ئەوەی هەتا بکرێت بەشێوەیەکی ئەقڵانی "یاریدەدەری نوسەر"ەکەم بەڕێوە بەرم، گەیشتمە ئەوەی نوسراوێکی ڕەسمی بنوسم و خۆم ناومنابوو "دە ئامۆژگاری باش بۆ تۆ کە دەخوازیت ببیت بە



نوسەر". من مامۆستایەکی ئاسایی قوتابخانە نەبووم. هەستمدەکرد لەژێر پلەوپایەی منەوە بێت گەر بەردەوام بەناچاری شتێکی دیاریکراو بڵێم و بڵێمەوە. لەبەرئەوە زۆر ئاسانتربوو پارچە نوسراوێکی دیاریکراو بخەمە دەستی ئەو مشتەریانەوە کەبەئاشکرا دیاربوو پێویستیان پێی بوو. ئەوەشم بەشێوەیەکی زۆر نهێنی دەکرد. من ئەو نوسراوەم بە هەر نوسەرێک بدایە، جەختم لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەو دە ئامۆژگاریە باشەم بەتایبەتی بۆ ئەو نوسیوە، ئیدی چ ئافرەت بوایە و چ پیاو، دەشموت بێگومان پێویست ناکات نامەیەکی تایبەتی خۆت لە "بلیندارن" یان لە "کارڵ یۆهان"دا بەدەستەوە بگرێت و پیشانی هەموو کەسێکی بدەیت. لەسەر نامەکەشم نەدەنوسی «دە ئامۆژگاری باش بۆ تۆ کە دەخوازیت ببیت بە نوسەر» بەڵکو دەمنوسی؛ «بۆ "ئانەرس"ی ئازیز» یان «بۆ "ئانا لیسا"ی ئازیز».

هێدی هێدی تاڕادەیەک بووم بە کەسێک کە گوێم بۆ خەڵکانی نائومێد شلدەکرد و دڵنەوایم دەدانەوە، گوێم بۆ ئەوانەش دەگرت کە هیچ پاشەڕۆژێکی وایان نەبوو کە ببنە نوسەر، بەڵام ئیدی ناچاربووم نەختە نەختە خۆم لەو حاڵەتە بدزمەوە. دەبوایە گوێم بۆ کۆمەڵێک گەنجی زۆر شلبکردایە. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش بوو کە نوسراوێکی ترم نوسی و ناومنا "دە ئامۆژگاری باش بۆ تۆ کە ناخوازیت ببیتە نوسەر". "نەبوون بە نوسەر"یش یەکێک بوو لە هەڵبژاردنەکان و دەبوایە ڕێزی لێبگیرایە. شتێک بوو کە من خۆم هەڵمبژاردبوو. یەکەمین کۆپلەی ئەو نوسینەم بەم شێوەیە دەستی پێدەکرد؛ «ڕێیتێدەچێت بەبێ ئەوەی ببینە نوسەر، ژیانێکی تەواو و پڕاوپڕ







لەسەر ئەم زەویە بەرینە سەر. تۆش یەکەمین کەس نیت کە ناچاردەبیت بەدوای کارێکی تردا بگەڕێیت».

من هەرگیز هەوڵم نەدا خۆم لەلای نوسەرە گەورەکان شیرینبکەم. کاتێک کە نوسەرێکی گەورە هیچ شتێکی پێنابێت کە باسی بکات، دەچێت شتێکی تر دەکات، ڕەنگە بچێت تەختە لەتلەتبکات بۆ ئاگردانەکەی. نوسەرێکی مەزن هەوڵنادات شتێک بدۆزێتەوە کە لەسەری بنوسێت. ئەو تەنها لەو کاتەدا دەنوسێت کە ناچارە بنوسێت. من خۆم نوسەرێکی گەورە نەبووم. من بەردەوام ناچاربووم بیرکردنەوەکانی مێشکم بەتاڵبەکەمەوە، نەمدەتوانی ئەو ئەندێشانە ڕابگرم کە ڕۆحم دەریدەدان، بەڵام قەت هەستم نەدەکرد کە پێویست بەوە بکات ڕۆمانێک بنوسم. هەرگیزیش تەختەم لەتلەت نەکردووە بۆ ئاگردانەکەم. هەمیشە لەو کاتانەدا کە دەمویست مشتەریەکی نوێ پەیدابکەم، زۆر بەوریایانەوە دەچوومە پێشەوە. من کاتێکی باشم دەخستە بەردەم بەرامبەرەکەم کە خۆی بکێشێتە دواوە و بەهیچ شێوەیەک نەمدەهێشت واتێبگات کە نیازمە بیرۆکەیەکی ئەدەبی پێبفرۆشم. دەبوایە بەرلەوەی بەرامبەرەکەم بەتەواوەتی لەوە تێبگات کە باسی کڕین و فرۆشتن لەئارادایە، هێندە فریابکەوتمایە کە مادەیەک ڕابکێشمەوە بۆ خۆم. دەبوایە شێروڕێویم بهێنایەتەوە، دەبوایە بەئەسپایی بەدەوریدا بخولێمەوە و دەشبوایە توانای ئەوەم هەبوایە کە لە ماوەی نیو چرکەیەکدا هەموو شتێک هەڵگبێڕمەوە و وایدەربخەم کە تەنها هێندەم دەمەوێت بزانم ئەو نوسەرە بە چ شێوەیەک لە نوسینەکەم دەڕوانێت. من بۆ نمونە دەموت «ئەم نوسینەم هیچ نرخێکی هەیە لەلات؟» بێگومان ئیتر نەمدەتوانی لە

قسەکەم پاشگەز ببمەوە، بەڵام لەڕاستیدا پرسیارێکی ئاساییە و دەکرێت بەم شێوەیە مانایەکی تریش ببەخشێت؛ «ڕات چیە بەرامبەر بە نوسینەکەم؟ بەدڵتە یان نا؟». هەندێ جار ئا بەو شێوەیە کۆبونەوەکەمان بەتەواوەتی هەڵدەگەڕایەوە و دوای ئەوەش ناچارانە دەبوایە من دانیشم و گوێ بۆ قسەکانی نوسەرەکە شلبکەم. مایەی ڕسوایی بوو.

من لەو لایەنەدا زیرەکبووم کە بەئەسپایی بەدەوریاندا بخولێمەوە. من ئەو کاتە بەتەواوەتی فێری ئەوە بووم کە پەیوەندیم بە کچانی نامۆوە دەکرد و ڕازیمدەکردن لەگەڵمدا بێن بۆ شانۆ و سینەما. بەئەسپایی خولانەوە بەدەوری شتێکدا شێوەیەکە لە شێوەکانی شانۆی خۆبەخۆ _دەشکرێت لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا بەراوردبکرێت کە لەسەر پەتێک هاوسەنگی خۆت ڕابگریت و هیچ تۆڕێکیش لە خوارەوەتدا نەبێت کە پارێزگاریت بکات. لەوانەیە لە شوێنێکی بەرزەوە بکەویتە خوارەوە، بەڵام شێوەیەکی نایابی هاوسەنگی ڕاگرتنی داهێنانە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند جارێکی کەم ئەوەش ڕویدا کە پاش ئەوەی بابەتێکم بەشێوەیەکی پێویست دەخستە بەردەمیان، "یارمەتی"یەکەی منیان ڕەتکردەوە. کەڕەتێکیان نوسەرێک برۆکانی بۆ بەرزکردەمەوە، یەک دوو دانەی تریش زۆر بە توندی سەریان بۆ ڕاوەشاندم، هەندێکی تریش بەتوندی ڕەتیانکردەوە. بەڵام لەبەرئەوە نەبوو کە نوسینەکەی منیان بەدڵ نەبوو، بەڵکو هەستمدەکرد بەپێچەوانەوە بوو، وابزانم ئەندێشەکانی منیان زۆر بەدڵبوو، چونکە بەهای ڕاستەقینەی ئەو شتەیان دەزانی کە لەناکاوێکدا بواری ئەوەیان هەبوو کە ببنە خاوەنی. شێوەی فریودانەکەم لە سیمایاندا دەبینی، بەڵام تەنها بۆ ماوەیەکی کەمبوو و منیش چێژم لەو جۆرە







شتانە دەبینی. بەهەرحاڵ پاش ماوەیەکی زۆر ئەو جۆرە نوسەرە بەرتیل نەخۆرانە مەترسیەکی کاریگەریان خستە سەر سەلامەتی "یاریدەدەری نوسەر".

ئەو نوسەرە بەرتیل نەخۆرانە کەسانێکی بێگەردبوون. هیچیان زەرەر نەدەکرد کە باسی یارمەتیەکانی من لەلای نوسەرانی تر بگێڕنەوە. هەندێکیان تا ماوەیەکی زۆر لەبواری نوسیندا پێویستیان بە سەرنجە تایبەتیەکانی من دەبوو ، من ئەو جۆرە "دڵڕاگرتنی نوسەرانەیەشم" دەبەخشی. بەڵام لەوە دەچێت یەکەمین ورتەورت دەربارەی چالاکیەکانم لەو بازنەیەوە سەریهەڵدابێت. ڕەنگە هەر ئەو نوسەرە پاکانەش بووبن کە ناوی "جاڵجاڵۆکە"یان خستە ناو ناوانەوە. ئەو ناوە هیچ پەیوەندیەکی بە زەرەکە دێرینەکەوە نەبوو کە من و باوکم کاتی خۆی لە مۆزەخانەی جیۆلۆجیدا بینیمان. من لە ژیانمدا دوو کەڕەت نازناوی "جاڵجاڵۆکە"یان لێناوم... ئمم، لەوانەیە بەڕاستی جاڵجاڵۆکە بم.

جاڵجاڵۆکە هەموو شتێکی دەرەوەی خۆی بەهۆی شتێکی ناوخۆیەوە دەچنێت. یان هەروەک "ئینگە هاگەروپ" دەڵێت «زۆر تایبەتە کە جاڵجاڵۆکە بیت و تەونێک لەناوەوەتدا بێت و بەردەوام شت بچنی».

بەڵام هەموو نوسەرەکان ئاوها ناکەن. هەندێکیان وەک مێرولە وان، لێرەو لەوێ شت دەهێنن و دوایش وەک شتێکی خۆیان تەماشای ئەو شتە فێڵبازانەیە دەکەن کە کۆیان کردۆتەوە. ڕەخنەگرەکان زۆر بەئاسانی لەو بڕوایەدان کە نزیکەی هەموو نوسەرەکان سەر بەو گروپەبن. زۆرجار ئاماژە بۆ کتێبێکی دیاریکراو دەکەن و دەڵێن "کاریگەری"، "سەر بە" یان "قەرزارباری" کتێبێکی تری سەردەم یان کتێبێکی تری مێژوی ئەدەبە _تەنانەت ئەگەر نوسەرەکە بە هیچ





شێوەیەکیش ئەو کتێبەی نەدیبێ کە باسی دەکەن. بەڵام ڕەخنەگرەکان تاڕادەیەک گریمانەی ئەوە دەکەن کە هەموو نوسەرەکان وەک خۆیان ڕوناکبیر و بێ فەنتاسیابن. لە خەیاڵیاندا وەک بیرۆکەیەکی سەرەکی لەوەدەچێت کە وایدابنێن کە چیتر هیچ ئەندێشەیەکی ڕەسەن لە وڵاتێکی بچکۆلەدا سەرهەڵنەدات، بەلایەنی کەمەوە لە وڵاتێکی وەک ئەمەی ئێمە. بەڵام لەڕاستیدا گروپێکی سێهەمیش بوونیان هەیە؛ ئەو نوسەرانەی کە سودیان لە یارمەتیەکانی "یاردیدەدەری نوسەر" وەردەگرت لە هەنگ دەچوون. دەهاتن و لە باخچەی جاڵجاڵۆکەکەدا گوڵاوی گوڵەکانیان دەمژی، ئەوان بەو شێوەیە مادەی سەرەتاییان پەیدادەکرد، بەڵام زۆرینەیان ئەرکێکی سەختیان لەسەر شان بوو و کاریان لەسەر مادە کۆکراوەکە دەکرد و گەشەیان پێدەدا. گوڵاوی گوڵی باخچەکەیان هەزمدەکرد و دەیانکردە هەنگوینێکی تایبەت بە خۆیان.

تاکوتەرای ئەو نوسەرانەی کە مشتەریم بوون پێیان ناخۆشبوو هێندە بهێننە بەرچاویان کە من ڕەنگە لەو بازنەیەدا بخولێمەوە و یارمەتی نوسەرانی تربدەم، ئامۆژگاری باشی نوسینیان بکەم. بەلای منەوە ئەو کەسانە دورەپەرێزبوون لە هەموو چێژێک. من نوسەری وام بینیوە کە گەلەیی لەوە کردووە کە هاوەڵێکی سروشی لەوەوە بۆ هاتووە کە بتڵێک شەرابی خواردۆتەوە، یان شتێکی کێشاوە، یان تەنانەت سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردووە. خراپترین شتیش، هەروەک زۆربەی نوسەرەکان دەزانن، ئەو کاتە ڕوودەدات کە نوسەرێک بچێت خولێکی نوسین بخوێنێت. زۆرینەی نوسەرەکان شانازی بەوەوە ناکەن کە جگە لە خۆیان سروشیان لەهیچ شتێکی ترەوە بۆ هاتبێت.





لەو کاتانەدا کە ئەدەب پەرەدەسەنێت، نوسەر بڕی زۆرینەی وزەکانی لەوەدا بەکاردەهێنێت کە بیسەلمێنێت نوسەرەکانی تر هیچ ئامانجییێکیان نیە. لە کۆتایی 1970 کاندا هێدی هێدی خەریکبوو لە گەوری نوسەرەکاندا جێگا تەسکبێتەوە، وەک ئاشکراشە کە ئاخوڕەکە بەتاڵ دەبێت، ئەسپەکان گاز دەگرن. کاتێک کە جوتیارەکان کەرە یان گەنمی زۆر بەرهەمدەهێنن، زیادەکەی فرێدەدەن. کاتێکیش کە نوسەرەکان تێکستی زۆر بەرهەمدەهێنن، بەردەبنە یەکتری.

بێگومان هەموو ئەو شتانەی کە من دەمفرۆشتن نەبوونە کتێب، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشی خۆم بەرپرسیاریم لەو هەڵئاوساندنی ئەدەبیەدا هەیە کە ئێمە لە دواهەمین چارەکی سەدەی پێشوو بووینە شاهیدی. دەیانوت لەڕادەبەدەر کتێب دەردەچێت، ئیدی ڕەخنەگرێکی دانیمارکیان وەک کارمەندێک دامەزراند _ئەوەش هەر لە کۆتایی ساڵەکانی 1970دا بوو. ڕەخنەگرە دانیمارکیەکە هەموو نوسینە نەرویجیەکانی ساڵەکەی خوێندەوە و هێندەی بۆ دەرکەوت کە نزیکەی هەر هەموویان بێ ئامانجبوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە گرفتەکە لەوەدا نەدەبینرا کە چەندەها کتێبی خراپ نوسرابوون، بەڵکو لەوەشدابوو کە چەندەها کتێبی زۆری باشیش نوسرابوون. ئێمە سەربە نەوەیەکی پڕ لە وشەین. ئێمە بڕێک کەلتوری زیاتر بەرهەمدەهێنین وەک لەوەی بتوانین هەزمی بکەین.

لەماوەی چەند ساڵی ڕابوردودا لەڕادەبەدەر گرنگیمان بە شتێکی بچکۆلەی وەک وێنە کێشان و نوسینی نایاسایی سەر قیتارەکان بەخشیوە، هاوکاتیش چەندەها ملیۆن کرۆن لە دروستکردنی کتێبخانەی نوێی نەتەوایەتیدا بەکاردەهێنین. بەڵام خۆ وێنە و نوسینی نایاساییش لە سەر یادوەری نەتەوایەتی دەنەخشێنرێن.





نیتشە دەڵێت ئەو کەسەی کە لەڕادەبەدەر کەلتوری خواردووە لە مارێک دەچێت کە کەروێشکێکی کێوی خواردبێت و بۆ پشو لەبەر خۆردا پاڵکەوتبێت، ناتوانێت بجوڵێتەوە.

ئێستاکە سەردەمی دێڕە شیعری کورت و پڕلە حیکمەت بەسەرچووە. لەژێر بەندەرگەی "بێرگن"دا پارچە تەختەیەکی کۆنیان دۆزیوەتەوە کە لەسەری نوسراوە؛ «ئەو کاتەی کە من لە "ستاڤانگە"دابووم، "ئینگەبیۆرگ" خۆشی دەویستم». بێگومان کاتی خۆی ئەوە تارادەیەک کاریگەری لە نوسەرەکە کردووە، ڕەنگە پاش 800_900 ساڵێکی دواتریش هێشتام هەر کاریگەری لە خوێنەربکات. ئەگەر ئەو نوسەرە کەمدووە ئەمرۆکە بژیابایە، ئەوا ئەو نوسینەی دەکردە ڕۆمانێکی 400 لاپەڕەیی بێهودە و دەیسوو بە یادوەری سەردەمدا، ڕۆمانێکی بێنرخ و قۆڕی دەربارەی پێکگەیشتنی لەگەڵ "ئینگەبیۆرگ"ی خۆشەویستیدا دەهۆنیەوە. یان دەیکردە ئاوازێکی دڵگیری "پۆپ" و مێشکی سەری خەڵکانی هاوچەرخی پێدەبرد. پارادۆکساڵەکە لێرەدایە؛ ئەگەر لەو 800 ساڵەی پێشودا هێندەی 1970 کان ڕۆمان بنوسرایە، ئەوا ئەو کاتە هیچ کەسێکمان نەماندەتوانی ئەو شێوەی دابونەریتی چڕی نوسینە بگەڕێنینەوە بۆ شتێکی سادە، بەڵکو چێژمان لە چیرۆکی "ئینگەبیۆرگ" دەبینی؛ ئەو_کاتەی_کە_من_لە_"ستاڤانگە_دابووم، "ئینگەبیۆرگ"_خۆشی_ دەویستم. ڕاستە ئەو چیرۆکی خۆشەویستیە پڕلەجۆش و خرۆشە تا ئەو پەڕی ڕادە کورتکراوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پڕە لە مانای شاراوە. جگەلەوەش خوێنەر بواری هەیە کە شتێک بخەملێنێت و بابەتێکی کەوتۆتە بەردەست کە دەتوانێت بەخەیاڵی خۆی شتی زیاتری لەسەر بهۆنێتەوە. بەڵام خۆ ناتوانین





شتێکی زیاتر لەسەر ڕۆمانێکی 400 لاپەڕەیی بهۆنینەوە و درێژەی پێبدەین.

نوسینی کتێب هەر زۆر ئاسان بووبوو، بەدڵنیاییشەوە لەگەڵ هاتنی کۆمپیوتەردا ئەو کارە سەختتریش نەبوو. ئەو نوسەرانەی کە وەک جاری جاران کتێبیان دەنوسی، مەبەستم لەو کەسانەیە کە بەدەست یان بە ئامێری چاپ شتیان دەنوسی، لەو بڕوایەدابوون ئەو کتێبانەی کە بە کۆمپیوتەر دەنوسران جۆرە ئەدەبێکی خراپن، چونکە خودی پرۆسەی نوسینەکە ئاسانتریش بوو. نەفرینی ئەو نوسینە لەوەدابوو کە پێیان دەوت "نوسینی ئەلەکترۆنی". نەفرینێکی تری هاوشێوە کاتی خۆی لەسەردەمی ڕێنیسانسدا سەریهەڵدا، ئەو کاتە خەڵکانێکی زۆر دەیانوت هونەری چاپکردنی کتێب هەڕەشە لە کەلتوری نوسین دەکات. ئەو سەردەمەش چەندەها و چەندەهای خەڵکی کتێبی چاپکراویان دەخوێندەوە، ئەوە شتێک نەبوو کە نکۆڵی لێبکرێت. بەڵام تا ماوەیەکی زۆریش کتێبی چاپکراویان وەک کتێبێکی ڕاستەقینە نەدەبینی، بەڵکو تەنها وەک "جێگرێک_بەدیلێک" تەماشادەکرا.

بێگومان نوسەرانێکی زۆریش هەبوون کە نەیاندەتوانی بە هیچ شێوەیەک ئەو مادانە بکاربهێنن کە من پێم دەفرۆشتن. ئەوەش کاریگەریەکی خراپی لەسەر ئیشەکەم بەجێدەهێشت. بەڵام خۆ دەبوایە خەتاکە بخەنە ملی کەسێکەوە، ئیدی وەک کەسێکی نادیار دەکرامە قوربانی. لەڕاستیدا لەو کاتانەدا کە بیرۆکەیەکی منیان بەکاردەهێنا و نەدەبووە کتێبێک، تەنها ئەو نوسەرانەی نائومێد نەدەکرد کە لەوەوپێش هیچیان نەنوسیبوو. نائومێدیەکە بەشێوەیەکی



ئاشکراش لەلای ئەو نوسەرانەش دەبینرا کە لەوەوپێش خۆیان وە بەبێ یارمەتی من کتێبێکیان بڵاوکردبووەوە.
هەڵبەتە دەزگای چاپەکانیش بڕێکی زۆری کتێبەکانی ڕەتدەکردەوە و لەسەرەتادا من بەهیچ شێوەیەک دەسەڵات و کاریگەریم لەو بوارەدا نەبوو. ڕێژەی گەڕانەوە بەشێوەیەکی ئاسایی لەنزیکەی لەسەدا نەوەتدا وەستابوو. بەڵام کۆمەڵێکی زۆری پڕۆژەکان هەر بەرلەوەی بگەنە ئەو ئاستە، نەدەبوون بە هیچ و سەریان نەدەگرت. جارجارێک تاکوتەرای مشتەریەکانم داوایان دەکرد مامەڵەکەمان هەڵبوەشێنینەوە. ئەوەش نەک تەنها منداڵانەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەی مەرجە دیاریکراوەکانیشمانەوە بوو، بەڵام کێشەیەکی هێندە گەورەش نەبوو. بێگومان من زەرەرمەدەکرد، چونکە نەمدەتوانی تێبینیە گەڕاوەکان بە کەسێکی تر بفرۆشمەوە، بەڵام هیچ چارەیەکیشم نەبوو. بەدڵنیاییەوە مشتەریەکانم پارەکانیان وەردەگرتەوە. ئەو کاتە من باری دارایم بەهێزبووبوو و ناچاربووم بەشێوەیەکی ستراتیجیانە بیربکەمەوە، ناچاربووم گرنگیەکی زۆر بە ناوبانگی و جێ متمانەیی "یاریدەدەری نوسەر" بدەم.
هەڵبەتە هەر بە حوکمی کارەکەم هەتا ئەو کاتەی مشتەریەکانم مادەیەکیان نەکڕیبایە، نەمدەتوانی هەروا بەئاسانی بابەتێکیان بخەمە بەردەست. نەمدەتوانی بڵێم فەرموو ئەوە تێبینیەک و تا دە ڕۆژی تریش بۆت هەیە بۆم بگەڕێنیتەوە. هەر ئەوەندەی کە یەکەمین لاپەڕەی بیرۆکەیەکم بۆ مشتەریەک دەخوێندەوە، ئیدی دەبوایە بگەیشتینایەتە مامەڵەیەک، دەنا ناچاردەبووم بۆ هەتاهەتایە ئەو بیرۆکەیەم لەبازاڕەکەدا ڕاکێشایەتەوە. لەوێشدا دیسانەوە دەبوایە بەئەسپایی بەدەوریاندا بخولێمەوە، من چێژم لەوە دەبینی. من





لەوەوپێش بەهونەرەوە پرسیارم لە کچێک دەکرد گەر بمویستایە هێندە بزانم کە دەیەوێت لەگەڵمدا بخەوێت یان نا، وە بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ بزانێت کە من مەبەستم لەوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەک وەڵامی دەدامەوە کە دڵنیای دەکردم کە دواتر لە هەمان ئێوارەدا دەڵێت "بەڵێ"، ڕێشدەکەوت کە دواتر من تاقیکردنەوەکە بگۆڕم.
هەتا ئەو کاتەی بەتەواوەتی لە دەرەوەی وڵاتدا دەستبەکار نەبووم، هیچ جۆرە بیرۆکەیەکم لەو بیرۆکانەی کە چەند ساڵێک لەوەوپێش دابووم بە نوسەرێکی نەرویجی، نەخستە بەردەم نوسەرێکی ئەڵمانی یان فەرەنسی. ئەوەش لە چەند حاڵەتێکی زۆر کەمدا بووە هۆی کەوتنەوەی ئاگرێکی بچکۆلە و ناچاربووم بەپەلە بیکوژێنمەوە، بەڵام من مامۆستابووم لە کوژاندنەوەی ئاگردا. ئاگر کوژاندنەوە وەک دڵنەوایی دانەوە وایە.

*

خاڵێکی گرنگی وەرچەرخانی کارەکەم لەو کاتەدا ڕویدا کە لەسەرەتای 1980 کاندا لەوە تێگەیشتم کە من چیتر پێویست ناکات تەنها بەهێندە ڕازیببم کە یەک کەڕەت هەقی بیرۆکەیەک وەربگرم کە لەڕوانگەیەکی تیۆریەوە ڕێی تێدەچوو ببێتە کتێبێکی بەناوبانگ و زۆری لێبفرۆشرێت. داوام لە نوسەرەکە دەکرد کە ڕێژەیەکی داهاتی داهاتووی کتێبەکەم پێبدات، بۆ نمونە لەپاش ئەوەی کە 5 هەزار یان 10 هەزار دانەیەکی لێدەفرۆشرا. من ئاستێکی لە سەدا "دە"وە بۆ لەسەدا "سی" داهاتی نوسەرەکەم داوادەکرد، هەڵبەتە دیاریکردنی

ئەو ڕێژەیە کەوتبووە سەرئەوەی بیرۆکەکەم تا چ ڕادەیەک وردەکاری تێدابووە و تا چ ڕادەیەکیش ڕێپێتێدەچوو لە ڕێگەی دەرخستنی لایەنە خەفەبووەکانی تێبینیەکەمەوە نوسەرەکە بتوانێت بیکات بە کتێبێک کە زۆری لێبفرۆشرێت. ئەو خاڵی وەرچەرخانە پاڵێکی یەکجار گەورەی بە باری ئابوریمەوە نا و دواتریش نەختە نەختە بەهۆیەوە بووم بە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند. بەڵام _لەدواترێکدا بۆمدەرکەوت کە پڕلەمەترسیش بوو.
ئەو کاتانەی کە مامەڵەم لەسەر ڕێژەیەکی داهاتی نوسەرێک دەکرد، هەمیشە "دیکتافۆن"ێکم لە گیرفانی چاکەتەکەمدا دادەنا. هەستمدەکرد بەو شێوەیە دڵنەواییەکی زیاترم بە مشتەریەکان دەبەخشی. بێگومان ڕێکەوتن نامەیەکی دەمگۆیی هەروەک پەیمان نامەیەکی نوسراو سەنگ و کاریگەری خۆی هەبوو. بەڵام کێشەکە لەوەدابوو کە ڕێکەوتنێکی دەمگۆیی کتومت کەوتبووە سەر یادوەریەکی باشی هەردوو لا. ئا لەو کاتانەدا "دیکتافۆن" ئامێرێکی هەتا بڵێیت پێویستبوو و لە یەک حاڵەتی دیاریکراویشدا ناچاربووم ناوی ببەم. بەدەرلەوەش چەند جارێک ناچاربووم بە مشتەریەکان بڵێم کە من چەندین ساڵە ئامێرێکی تۆمارکردنی دەنگم بە تەلەفونەکەمەوە بەستووە، تەنها بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێبکەم کە پارەم لەلایان ماوەتەوە و دەبێت بمدەنەوە. من کەسێک بووم کە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک کارەکانم ڕێکدەخست، ڕەنگە هەندێ کەس وامبیبنێت کە من شتی بچکۆلە گەورەبکەم.

کەرەتێکیان یەکێک لەو نوسەرە نائومێدانە _یا ناوی بنێین "ڕۆبێرت"_ هات بۆ ماڵەوە بۆلام. دە ساڵ لە خۆم گەورەتربوو،









بەرەگەز نیوە "فلامیش"بیوو[36] و هەتا ئەو کاتە ژیانێکی سەختی بەسەربردبوو. نوسینەکانیشی نەگەیشتبوونە ئەوەی ببێتە کاسبیەکی باش، بەتایبەتیش بە هۆی ئەوەوەبوو کە لە تەمەنێکی گەنجدا منداڵێکی کەمئەندامیان بووبوو، کوڕەکەیان نەخۆشیەکی بچکۆلەی مێشکی هەبوو. بێگومان ئەوەش فشارێکی خراپی خستبووە سەر ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ "وێنشە"دا، وێنشەش خەریکبوو لەگەڵ نوسەرێکی تردا دەستی تێکەڵدەکرد. "وێنشە" و "ڕۆبێرت" هێشتام هەر پێکەوە دەژیان، بەڵام بەهۆی کوڕە کەمئەندامەکەیانەوە شێوە ژیانێکیان بەسەردەبرد کە هەر لە ئامێری شێدەرخستنی سەردەمی زەمانی زوو دەچوو[37]؛ لەو کاتانەدا کە پیاوەکە لەماڵەوە دەبوو، ژنەکە دەچووە دەرەوە و لەو کاتانەشدا کە ژنەکە لە ماڵەوە دەبوو، پیاوەکە دەردەپەڕیە دەرەوە. من نەمدەزانی کە "ڕۆبێرت" خۆی بەئاگایە لەوەی کە "وێنشە" پەیوەندیەکی لەگەڵ "یۆهانس"دا هەیە یان نا، بەڵام من خۆم ئاگام لەو پەیوەندیەیان بوو. شتەکانی ئەو بازنەیە بە ڕونی دەبینران.
"ڕۆبێرت" یەکێکبوو لەو گروپە نوسەرانەی کە بەشێوەیەکی یەکجار گەورە چاوەڕوانی من بوون کە بەرپرسیاری هەموو لایەنەکانی ژیانیان هەڵبگرم. هەروەها سەر بەو گروپەش بوو کە وێنەی خۆیانیان تێکەڵی نوسینەکانیان دەکرد. چەند مانگێک لەوەوبەر پێکەوە لە "گازینۆ"دا دانیشتبووین، نزیکەی هەموو ئەو ئێوارەیە بەپەستیەوە

[36] بەشی 'فلامیش'ی بەلجیکا.
[37] ئامێرێکی زۆر هەستیاربووە و هەر ئەوەندەی کەمێک شێی هەوا بگۆڕایە یەکسەر نیشانی دەدا.







باسی پەیوەندی خۆی و "وێنشە"ی بۆ کردم و دەیوت "پەیوەندیەکەمان هەمیشە پێبەپێی سەرکەوتن و نشوستی نوسینەکانم بەرز و نزم بۆتەوە". ئەو کاتانەی کە بەختی یاردەبوو و کتێبێکی سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، لەناو جێگەی خەویشدا بەختی هەڵدەسایەوە و هەرئەوەندەش کە ڕەخنەیەکی خراپیان لێبگرتایە، ئیدی یەکسەر سزادەدرا و دەبوایە وەک پیاوێکی سەڵت لەژوری نوستنەکەیاندا بخەوتایە. منیش وتم «ئەوە بەهیچ شێوەیەک کێشەی تۆ نیە، بەڵکو ئەوە کێشەی "وێنشە"یە».

من بەهیچ جۆرێک پێم خۆشنەبوو کە هەر لەخۆیەوە بەبێ ئەوەی پێشوەخت پێمبڵێت خۆی کرد بە ماڵەکەمدا، لەوەوپێشیش ئەوەم پێڕاگەیاندبوو. من بەرلەوەی ڕێگەم بە کەسێک بدایە کە بێتە ئەمدیو دەرگای ماڵەکەمەوە، پێمخۆشبوو هەموو نوسین و مەلەفەکانم کۆبکەمەوە و وەلایان بنێم ـ ڕێدەکەوت کە لەڕادەبەدەر نوسین و تێبینیم بەماڵەکەدا بڵاوبووبێتەوە. بەڵام هەر لەناو دالانەکەوە زۆر تورە دەهاتە بەرچاوم، لەبەرئەوە ڕێگەم پێدا بێتە ژورەوە. بەرلەوەی بڕۆینە ژوری دانیشتنەکە، پرسیارێکم لێکرد و وتم؛

«چی قەوماوە ڕۆبێرت؟ دیسانەوە چەقیویت؟»

ڕاستەوخۆ چووە ناو بابەتەکەوە و وتی؛ «گومان لەوەدەکەم کە تۆ جگە لە من یارمەتی خەڵکانی تریش بدەیت»

هیچ بە پێویستم نەزانی کە نکۆڵی لێبکەم، لەبەرئەوە وتم؛ «باشە... ڕەنگە خەڵکانێکی زۆری تریش سود لە یارمەتیەکانی من وەربگرن... ئێ، جا ئەوە چ پەیوەندیەکی بە تۆوە هەیە؟ تۆ خۆت ئەو شتانەت بەدڵنیە کە لە منت وەرگرتوون؟»



لەوێدا ئەو چیرۆک و بەراوردکاریانەی مەسیحم بیرکەوتەوە کە دەربارەی کریکارەکانی سەر ڕەزی ترێکە وتونی. ڕۆبێرت یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لەسەرەتادا دەستی یارمەتیم بۆ ڕاکێشا و پەیمانێکی ڕون و ڕەوانمان لە نێواندابوو. پێویستی نەدەکرد بیر لەوەبکاتەوە کە من چ جۆرە پەیمانێکی ترم لەگەڵ کرێکارەکانی تری ڕەزی ترێکەدا بەستووە.

لەسەر کورسیەکی نایاب دامنیشاند و دوو بیرەم هێنا. ئینجا چوومە لای ئامێری مۆسیقا لێدەرەوەکەوە و وتم؛ «"شۆپان" یان "برامس"؟»

وەڵامی نەدامەوە. یەک دوو کەڕەت هەناسەی قوڵی هەڵکێشا و وتی؛ «تۆ خۆت وتت کە تەنها یارمەتی من دەدەیت؟»

وامدەرخست کە ڕای خۆمم گۆڕیبێت؛ «بەڕاستی وام وت؟»

شانەکانی هەڵدەلەرزین. دوو شانی پانی پێوەبوو. بەشێوەیەکی زۆر قوڵ بەچرپەچرپ وتی؛ «پیتەر، من وامدەزانی تەنها من و تۆ بووین و تەواو»

لەوێدا وتم؛ «دە گوێ بگرە... تۆ دەچێتەوە سەر قسەیەک کە من نزیکەی 12 ساڵێک لەمەوبەر وتوومە. ئەو کاتە هەموو شتێک جیاوازبوو، من نکۆڵی لەوە ناکەم»

دیسانەوە وتیەوە؛ «بەڵام من وامدەزانی تەنها من و تۆ بووین و تەواو».

زۆر حەزم لە پەستی و ڕووە مۆنەکەی نەدەکرد. تازە درەنگبوو گلەیی لەوەبکات کە خەڵکانێکی تریش لەو یاریە هەرەمیە نایابەدا بەشدارن، بەتایبەتیش لە کاتێکدا کە خۆشی بۆ ماوەی چەندەها ساڵ ئالودەی دیاریە بەخشندەکانی "جاڵجاڵۆکە"کە بوو. بەڵام هەستپێکردنی پیاوەتی لە جیهاندا باوی نەماوە. هەرئەوەندەی کە





پرۆفیسۆر "هایجینس" کچێکی گوڵفرۆشی ئاسایی دەهێنا و فێری زمانێکی پاراویدەکرد، یەکسەر داوای لێدەکرد کە ببێتە ئافرەتی هەرە گرنگی ژیانی.
ئەوجا وتم؛ «باشە پێتخۆشدەبوو ئەگەر بتزانیبایە کە من یارمەتی نیوەی هەموو نوسەران دەدەم و بابەتیان دەدەمێ کە لەسەری بنوسن؟ ئەو کاتە حەزتدەکرد پێکەوە ئیشمانبکردایە؟»
سەرێکی ڕاوەشاند و وتی؛ «بەهیچ جۆرێک»
ئیدی لەوێدا ئاماژەم بۆ شتێک کرد و وتم؛ «بەڵام وەسفکردنی ڕەخنەگرەکانت بەدڵبوو کەلەسەر دواهەمین ڕۆمانت نوسیبویان. وابزانم "وێنشە"ش ئەوەی پێخۆشبوو. تۆ بیرۆکەیەکی هەشت لاپەڕەییت لە من وەرگرت، زۆر بە هەرزانیش پێم فرۆشتیت. بەڕاست، منیش لەگەڵ ئەو ڕەخنەگرەدا تەبام کە نوسیبووی هەندێک جار زمانێکی تێکەڵ و پێکەڵ بەکاردەهێنیت. دەبوایە دەستنوسەکەت بهێنایە بۆم تا بمخوێنایەتەوە. خۆت دەزانیت من پارەیەکی هێندە زۆر داواناکەم لەبری خوێندنەوەی دەسنوسێک»
تۆزێک هاتەوەسەرخۆی و وتی؛ «حەز دەکەم بزانم یارمەتی چ کەسێکی تریش دەدەیت؟»
پەنجەیەکەم خستە سەر دەمم؛ «تۆ شێت بوویت کابرا؟»
بەچاوێکی پرلەبڕوای ساویلکانەوە تەماشایەکی کردم. وابزانم هێشتام هەر پێیوابوو کە نهێنیەکی زۆر تایبەتیمان لە نێواندا بێت. ئەوجا وتم؛ «باشە تۆ پێت خۆشدەبێت ئەگەر باسی تۆ بۆ "بێرت" و "یۆهانس" بدرکێنم؟»
«یارمەتی "یۆهانس" دەدەیت؟»





«نەء، تۆ سەیریت ڕۆبێرت. هەستدەکەم هیلاکبیت کابرا. بڵێ بزانم ئا ئێستاکە چۆنی دەگوزەرێنیت؟»
وتی؛ «هەتا بڵێیت خراپم»
ڕەنگی تێکچووبوو. جێگای سەرنجبوو کە لەماوەی چەند ساڵێکی پێشودا تاڵە سپیەکانی قژی بە ئاشکرا لەناو قژە ڕەشەکەیدا دەرکەوتن. یەکێک بوو لەو کەسانەی کە تا تەمەنێکی زۆر قژێکی پڕ بەسەریانەوەیە و لەناکاودا قژیان دەروتێتەوە.
دواتر ڕۆبەت پرسی؛ «لەلای هیچ کەسێک باسی منت کردووە؟»
منیش ڕاستیەکەم بۆ باسکرد و لەوەڵامدا وتم؛ «بێگومان نەء. من تا ئەو پەڕی ڕادە نهێنی دەپارێزم. وەستایانە هەردوولای مامەڵەکە دەبینم. بەهیچ شێوەیەک پێویست ناکات بیر لەوە بکەیتەوە، بەلایەنی کەمەوە هەتا ئەو کاتەی ئاوها بەرێکوپێکی ڕەفتاربکەیت، پێویست ناکات خەیاڵی خۆت بەوەوە بگوشیت»
پاش چەند حەفتەیەک دیسانەوە پەیدا بووەوە، ئەو جارەشیان هەر ڕێک بەبێ ئەوەی لەوەوپێش پێیوتبێتم لەدەرگای دامەوە. جارێست بووم. من پێم خۆشنەبوو یەکێک لە نوسەرەکان وردە وردە دەست وەرداتە ناو ژیانی تایبەتیمەوە. من هەر لەو کاتەوەی کە منداڵبووم و منداڵە چڵمنەکان دەهاتن بۆلام بۆ ئەوەی یاری کاوبۆ و هیندیە سورەکانیان لەگەڵدابکەم، زۆر ڕقم لە تەپوهوری سەر پێپلیکانەکانبوو. بەشکم میوانێکم هەبوایە، بەشکم لەگەڵ ئافرەتێکی نوسەردا لە گەرمەی تاوتوێکردنی باسێکی گرنگ و خۆشدا بومایە. یاخود بۆ نمونە بەشکم بە قوڵی سەرقاڵی شتێکی دیاریکراو بومایە. جگە لەوەش من بەرلەوەی میوانم بێت، زۆربەی جارەکان پیاوە یەک





مەتریەکەم دەبردە ژوری نوستنەکە. من ئەوەم بەلاوە سەیربوو کە بەبێ هیچ بەرەنگاریەک ڕازیدەبوو و بەقسەی دەکردم.
دڵنیابووم لەوەی کە چەند کەسێک پێکەوە قسەیان کردووە. مەزەنەی ئەوەم دەکرد باسی ئەوەیان کردبێت کە من چالاکیەکی ڕاوێژکاریی گەورە و فرەلایەنەم هەبێت. واشم دادەنا کە هەموو ئەوانەی پێکەوە قسەیان کردبوو، نکۆڵیان لەوەکردبێت کە ناوی خۆیان لەناو لیستی مشتەریەکانی مندا بێت. من هەمیشە لە مەزەنەکردنی شتەکاندا زیرەکبووم. هەمیشە دەمتوانی ئەو شتە بخەملێنم کە هاوشێوەی چیرۆکێکی هەڵبەستراوی جێباوەربوو.
ئالەوێدا بۆ یەکەمین جار لەوە تێگەیشتم کە ڕییتێدەچێت ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێکی دیاریکراو بیەوێت زەرەرم لێبدات. هەستم بە فشارێکی زۆر دەکرد و بەپێویستم زانی باسی کاسێتە تۆمارکراوەکانم بۆ ڕۆبێرت بگێڕمەوە. لەسەرو ئەوەشەوە چەندەها جار چەکم لەو وەرگرتبوو و بەپێی یاساکانی خۆم کۆپیەکی هەموویانم لای خۆم پاراستبوو، ئەوانەشم بۆ گێڕایەوە و دواتریش وتم "من پلانێکی وردی تریشم دارشتووە و ئەگەر شتێکم لێبێت یەکسەر سندوقی بانکەکەم دەکەنەوە و هەموو شتێک ئاشکرادەبێت". من وای بۆچووم ئەو قسەیەم هێمنی بکاتەوە. لەسەرەتادا زۆر تورەبوو و هەڵچوو، زۆر کەتەشبوو، بەلایەنی کەمەوە بستێک لە من درێژتربوو. بەدەرلەوەش لەوەوپێش یەک دووجار لەو کاتانەدا بینیبووم کە نەیدەتوانی دەست بەسەر خولق و مەزاجیدا بگرێت. بەڵام هێندەی نەبرد و مێشکی هێوربووەوە و ئەویش ناچارانە خۆیدا بەدەستەوە، من خۆشحاڵبووم بەو حاڵەتە. ئەگەر لەڕاستیدا لە حاڵەتێکی بێ ئومێددا ببین، ئەوا هەرگیز باش نیە بەو هیوا خەیاڵییەوە بژین کە شتێکی دیاریکراو سودێکمان پێدەبەخشێت.





کە بەڕاستی لە حاڵەتێکی نائومێددا خۆمان دەبینینەوە، ئەو کاتە چاوەڕوانکردن و خۆبەستنەوە بە ڕودانی پەرجویەکی خەیاڵی کە حاڵەتەکەمان باشترێک بکات، زیاترێک ئازارمان پێدەبەخشێت. لەو کاتانەدا تاڕادەیەک سستبوون حاڵەتێکی باشتری مێشکە. من بە شێوەیەکی میهرەبانانە قسەم لەگەڵدا کرد و وامنیشاندا کە لێی تێدەگەم، ئەوەش شتێکبوو کە وەک خزمەتێک پێشکەشی نوسەرەکانم دەکرد. هێندەشم پێوت کە هەرگیز هیچ کەسێک بەو شتانە نازانێت کە ئەو لێیکریبووم. دوو پەرداخی گەورەی ویسکیم تێکرد و کەوتمە باسی "وێنشە" و ویستم بزانم ئەو بە چ شێوەیەک دەیگوزەرێنێت.
پاش دوو ساڵ ئینجا بینیمەوە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و وتی "نوسینەکانم وەستاون". لەو کاتەدا، هەروەک خۆی پێی وتم، زۆری پێخۆشبوو کە ڕۆمانێکی پۆلیسی بنوسێت، منیش دوو بیرۆکەی ڕۆمانێکی لەو جۆرەم خستەبەردەستی و ڕێگەمپێدا یەکێکیان هەڵبژێرێت. ڕەفتارێکی میهرەبانانەم لەگەڵدا کرد. ڕۆبێرت زۆر بەباشی دەیزانی کە ئەو بیرۆکەیەی کە تەنها تەماشای دەکات و نایکرێت، یەکسەر دەبێتە شتێکی بێنرخ. ناچاربووم لە مەلەفی ئەو تێبینیانەدا دەریبهێنم کە دامنابوون بۆ فرۆشتن و بیخەمە ناو مەلەفی ئەو چیرۆکانەوە کە دامنابوو خۆم لە دانیشتنەکاندا بیانگێڕمەوە. من نەمدەتوانی بە تەواوەتی دەست لە گێڕانەوەی چیرۆک هەڵبگرم، چونکە هەمیشە هەبوونی چیرۆکی نوێ شتێکی باشبوو و دەمتوانی لەڕێگەیانەوە مشتەری نوێ پەیدابکەم.
ئەو بیرۆکەیەی کە لەگەڵ خۆیدا بردی ناوی "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە" بوو و ڕەنگە تۆزقاڵێک سروشی لە گۆرانی "Lusy in the sky with diamonds"ی بیتلیس"ەوە وەرگرتبێت. تێبینیەکانم





نزیکەی 15 لاپەڕە دەبوون، بەڵام بەشێوەیەکی کورت چیرۆکەکە بەم شێوەیەی خوارەوەبوو؛

سێ برا بەناوی "ویم" و "کییس" و "کلاس" لە شاری "ئانتوێرپ"ی بەشی "فلامیش"ی بەلجیکادا دەژیان. "ویم" پەڵەیەکی سوری گەورە بە دەموچاویەوە بوو و هەر لە منداڵیەوە دوو برا گەورەکەی شەڕیان پێدەفرۆشت و ئازاریان دەدا. لەسەرەتای تەمەنی بیست ساڵیدا چاوی بە "لوسی" شۆخ و شەنگ دەکەوێت و دڵی داگیردەکات، "لوسی" لەڕادەبەدەر جوانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دوو حەفتە پێش ئەوەی شوو بە "ویم" بکات، "کییس"ی برای هەڵیدەگێڕێتەوە و بۆ خۆی دەبات. پەیوەندی نێوان خێزانەکەشیان لەو کاتەدا هێندەی تر تێکدەچێت کە دایک و باوکی یەک لەدوای یەک لە ماوەیەکی کورتدا کۆچی دوایی دەکەن. دایک و باوکی وەسێتنامەیەکی ورد و ڕونیان نوسیبوو و بەئاشکرا دیاربوو کە بەشە میراتی "ویم"یان زۆر کەم دانابوو. دەڵێن بەهۆی ئەوەوە بووە کە دایک و باوکی کەوتبوونە ژێر کاریگەری و فرت و فێڵی دوو برا گەورەکەوە، بەتایبەتیش "کلاس" کە یارمەتی دابوون وەسێت نامەکەیان بنوسنەوە. ئەو خۆی پارێزەربوو و بۆ ماوەی چەند ساڵێکیش لەپاش مردنی دایک و باوکی بەشاری "ئانتوێرپ"دا دەسوڕایەوە و تاڕادەیەک شانازی بەوەوە دەکرد کە کاتی خۆی توانیبووی دایک و باوکی پیر وپەککەوتەی بکاتە ئەڵقەیەکی پەنجەی خۆی.
بەهەرحاڵ "ویم" پشتی بە خۆی بەست و توانی ببێتە ئەڵماس فرۆش، لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکانیشدا هەر زۆر زۆر دەوڵەمەندبوو. گەورەترین خەم و پەژارەی ئەوەبوو کە خێزانی دانەمەزراندبوو. جگە





لە "لوسی" هیچ ئافرەتێکی تر لە ژیانی "ویم"دا نەبوو، لێرەشەوە هیچ کەسێکی نەبوو کە میراتیەکەی بۆ بمێنێتەوە. تەنها شتێک کە دڵی خۆشدەکرد و ڕوناکیەکی کزی دەخستە ژیانیەوە، لەوەدابوو کە "لوسی" جارجارێک هەر بۆ ڕێزلێنانی برادەرایەتیە کۆنەکەیان سەردانێکی دەکرد. هێدی هێدیش سەبارەت بە ژیانی هاوسەری داوای ئامۆژگاری لێدەکرد، چونکە "کییس"ی مێردی پیاوێکی وا نەبوو کە کەس بتوانێت بەئاسانی نان و جێگای لەگەڵدا دابەشبکات.
ئەگەر "ویم"ی برا بچکۆلە لەپێش دوو برا گەورەکەیەوە بمردایە، ئەوا ناچاردەبوو لەبەر قسەی خەڵکی بەشێکی زۆری سامانەکەی بۆ "کییس" و "کلاس" جێبهێشتایە. وا ڕێکەوت لەتەمەنێکی گەنجدا توشی نەخۆشیەکی کوشندەبوو و لە وەسێت نامەکەیدا نوسیبووی "دواهەمین خۆزگەم ئەوەیە کە "کییس" و "کلاس" لەدوای مردنم پێکەوە قاسە گەورەکەی پارەکانم بکەنەوە". ورتەورتێک لەناو شاری "ئانتوێرپ"دا بڵاوبووبوەوە و دەیانوت بایی چەندەها ملیۆن فرانکی بەلجیکی، ئەڵماسی سافکراو لە قاسەکەیدایە.
"ویم" لەبەرچاوی چەند گەواهێکدا ئیمزای لەسەر وەسێتنامەکەی کرد و دوو مانگێک دواتر مرد، "کییس" و "کلاس"یش بۆ کردنەوەی قاسەی پارەکەی هاتن. لەگەڵ خۆشیاندا پارێزەرێکی بەناوبانگی تایبەتیان لەبواری ئیشوکاردا هێنابوو. لەو کاتەدا کە بە چاوێکی پڕ لە تەماحەوە دەرگا دڵفرێنەکەیان کردەوە، زرمەی قومبەلەیەکی گەورە بەرزبووەوە و هەر سێکیان دەستبەجێ مردن. لەناو قاسەکەشدا نە ئەڵماسی تێدابوو و نەپارەی وردە و کاغەزیش. "کییس" و "کلاس" تەنها قومبەلەیەکیان بە میراتی بۆ مابووەوە، بەڵام نرخێکی یەکجار مەزنی هەبوو و لە فرەلاوە زیرەکانە بۆیان دانرابوو.

ئەو ڕوداوە سەیروسەمەرەیە لە ڕۆژنامەکاندا دەنگیدایەوە، وەک "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە" گوزارشتی لێدەکرا و کردیان بە بابەتێکی گەورە و وەک سەرئەنجامێک چەند دانیشتنێکی دادگایی بەدواداهات. "ویم" لە وەسێت نامەکەیدا جگە لە شتەکانی ناو قاسەکەی، هەموو شتە بەنرخەکانی تری خۆی بۆ "لوسی" ژنی "کیبس" بەجێهێشتبوو. بەڵام ئایا دادگا دڵنیایە لەوەی کە "لوسی" دەستێکی نهێنی لەو پلانەدا نەبووە؟ هیچ کەسێک گومانی لەوەدا نەبوو کە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابوردودا سەردانی دوکانەکەی کردبوو و لە ماوەی ساڵی ڕابوردشدا زیاترێک چووبوە لای، ئەو خۆشی نکۆڵی لەوە نەدەکرد. ڕەنگە ئەویش توانییەتی قاسەکە بکاتەوە. بەدەر لەوانەش دادگا هێندەی بۆ ڕونبووەوە کە "لوسی" لەماوەی پێشودا پارێزەرێکی گرتووە و ویستویەتی لە "کیبس"ی مێردی جودا ببێتەوە، چونکە بەبڕوای ئەو ژیانێکی هاوسەری وشک و سارد و وەجاخ کوێری لەگەڵدا بەسەربردووە.

دواتر پارێزەرێک دادەنێن بۆ ئەوەی پارێزگاری بەرژەوەندیەکانی ئەڵماس فرۆشە مردووەکە بکات. چونکە کێ دەڵێت لەپاش مردنی "ویم"ەوە، "لوسی" خۆی قومبەلەکەی لەناو قاسەکەدا دانەناوە؟ بەڕاست، ئەی ئەڵماسەکان کوان؟ ئایا پێش ئەوەی هەموو شتێک لە دادگادا ڕونبێتەوە، جێگەی گومان نیە کە ئەو ئەڵماس فرۆشە دەوڵەمەندە وەک بکوژی سێ کەس لە قەڵەم بدرێت؟

هەرگیز "لوسی" تاوانبار نەکرا، بەڵام بەهۆی شێوازی بەڵگەکانەوە دادگا بڕیاریدا بە هیچ شێوەیەک "ویم"ی کۆچکردوو وەک بکوژێک باسنەکرێت. یان هەروەک دادوەرەکە خۆی وتی؛ «هەموو تاوانبارێک بێگوناحە لەبەرچاوی دادگادا هەتاوەکو ئەو کاتەی پێچەوانەکەی





دەسەلمێنرێت»، دواتریش کە کۆتایی بە دادگاکە هێنا وتی؛ «لەدوای مردوو سەڵاوات خۆشە».

دواتریش "لوسی" بڕیاردەدات شاری "ئانتوێرپ" بەجێبهێڵێت، هەڵبەتە بەهۆی ئەو هەموو دادگاکاری و باسی ناو ڕۆژنامە و لەدەستدانی مێرد و شوبراکەیەوە ئەو بڕیارە دەدات. چەند ڕۆژێکی کەم بەرلەوەی تەمەنی ببێتە 30 ساڵ، سواری فڕۆکەیەک دەبێت و بەرەو شاری "بیونۆس ئایرس" دەڕوات بۆ ئەوەی لەلای کچە مامێکی بمێنێتەوە. لەڕۆژی لەدایک بوونەکەشیدا پیاوێکی جلوبەرگ جوان لەدەرگاکەیان دەدات. خۆی پێدەناسێنێت و دەڵێت «من نوێنەری کۆمپانیایەکی گەورەی دەڵاڵیم و بەڕێوەبەرەکەم داوای لێکردووم کە ئەم جانتا بچکۆلەیە ڕێک لەم ڕۆژەدا بگەیەنمە دەستی "لوسی ڤان دا هایدن"». "لوسی" ئیمزای وەرگرتنی جانتاکەی بۆ دەکات و لەپاش ڕۆیشتنی پیاوەکەوە جانتاکە دەکاتەوە. پڕە لە ئەڵماسی سافکراو. لەگەڵ ئەڵماسەکاندا پارچە کاغەزێکی بچکۆلەشی تێدایە کە بەدەست لەسەر نوسراوە؛ «"لوسی" گیان، پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونی سی ساڵەت لێدەکەم. تۆ لەبری هەردووکمان بژی. "ویم"ی خۆشەویستت».

*

نەختە نەختە خەریک بوو شێوازی تەونەکەم دەگۆڕا. لەو کاتە بەدواوە جۆرە تاڵێک لەنێوان مشتەریەکانیشدا دەبینرا. بەو شێوەیەش تەونەکەم هێدی هێدی زیاتر و زۆتر چڕبووەوە، زیاتر و زۆرتر مایەی





مەترسی بوو. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیشدا نیشانە خراپەکانی لە چوار گرووپی جیاوازەدا دەرکەوتن.

گرووپی یەکەم هەموو ئەو کەسانەی دەگرتەوە کە نەیاندەتوانی ئەو پرۆژانە تەواوبکەن کە دەستیان پێکردبوو، لەبەرئەوە هەر زۆر بەئاسانی گلەییان لە جۆریەتی ئەو نوسینانەدەکرد کە کڕیبویان. من زۆرم لەو کەسانە بینی کە بیروبۆچوونی خۆیان بەو شێوەیە هەڵدەگەڕانەوە. پێکەنینم پێیاندەهات. مایەی پێکەنینە ئەگەر گلەیی لە توانای ماشێنێکی بێوێنەی وەک "جاکوار" بکەین، لەکاتێکدا کێشە راستەقینەکە لە شۆفێرەکەدا بێت کە نەتوانێت لەپشتی سوکانەکەیەوە دابنیشێت و لێی بخوڕێت. لەو کاتەدا گرفتەکە لە توانای لێخوڕینی شۆفێرەکەدایە، نەک لە جۆرێتی ماشێنەکەدا.

گرووپێکی تر هەموو ئەو کەسانە بوون کە بەرتیلیان نەدەخوارد. ئەوانە زیاد لەڕادە دەمدەمی بوون، چونکە خۆیان هیچ شتێکیان نەبوو کە لێی بترسن. نیگەرانبوون. بێئارامبوون چونکە من یارمەتی نوسەرانی ترمدەدا، تاکوتەرایان لەڕادەبەدەر لەوە دەترسان کە شتێکی لەو جۆرە ڕویدابێت. وەک ماسیگر وابوون، بەڵام دەریایەک ورتەورتی ئێرەوئەوێیان لەبەردەستابوو کە تۆڕەکانیانی تێفرێبدەن. نەیانتوانی تەنانەت یەک ماسی راستەقینەش بگرن. بەرتیل نەخۆرەکانیش لەناو ئەو شێوە تێنەگەیشتنەدا دەژیان و پێیانوابوو کە یارمەتیەکانی من زۆر تایبەتی بن، بەڵام لەلایەکی تریشەوە وایلێکردن کە زیاترێک چاوبکەنەوە و بپرسن؛ ئەی کەواتە لە راستیدا یارمەتی کێ دەدا؟ بڵێیت یارمەتی ئەو نوسەرە تازەیەی دابێت کەلەپڕێکدا ئازایانە دەرکەوت و خەڵاتی ڕەخنەگرەکانی بردەوە؟





سێهەمین گرووپ ئەو کەسانەبوون کە پارەیان لابوو و هەمیشە بەئاسانی نەیاندەدامەوە. کەڕەتێکیان مشتەریەک لە مشتەریەکانم پارەیەکی زۆری لابوو. نە من و نە مشتەریەکەش دەمانویست هێندە بەر گوێی خەڵکی بکەوێت کە باشترین ڕۆمانی ساڵەکە لەسەر کۆمەڵێک تێبینی ورد هەڵچنراوە کە هی نوسەرەکە نین. هیچ یەکێکمان پێمانخۆشنەبوو کە لەناچاریدا واملێهات باسی کاسێتە تۆمارکراوەکانی بۆ بکەم، بەڵام بەڕاستی جارجارێک هیچ چارەیەکی ترم نەبوو. ئەو میتۆدە زۆر کاریگەربوو. "یاریدەدەری نوسەر" لەبنەڕەتەوە پەرشوبڵاوبوو، هەر لەبەرئەوەش زۆر گرنگبوو کە بەلایەنی کەمەوە پەیوەندیەکی ڕێکوپێکی لەگەڵ مشتەریەکانیدا هەبێت.

دواهەمین گرووپیش هەموو ئەو کەسانە بوون کە سودێکی مەزنیان لە "یاریدەدەری نوسەر"ەوە وەرگرتبوو، هەم وەکو لایەنی ئەدەب و هەم وەکو لایەنی پارەش، بەڵام کە زانیان چەندەها نێچیری تریش بەتۆڕەکەوە بوون، ئیدی هەستیاندەکرد پێیان خستۆتە شتێکەوە کە دەسەڵاتیان بەسەریدا ناشکێت. ئەو نوسەرانەی کە زیاترێک سودیان لە یارمەتیەکانی من وەرگرتبوو، زیاترێک کەوتبوونە ژێرەوە، زیاترێک لەوە دەترسان کە ئابڕویان بچێت. لەلایەکەوە شەرمەزاربوون کە یارمەتیان لە کەسێک وەرگرتووە و لەلایەکی تریشەوە شەرمەزاری ئەوەبوون کە کڵاویان کرابووە سەر. من بەباشی لەوە تێدەگەم، بەڵام خۆیان بوون کە خۆیان فریودا کە ئاوریشم بکڕن.

دواتریش هەرچەندە کە هەندێک لە مشتەریەکانم زانیان کە من لە فرەلایەنەوە دەستبەکارم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان فریویان دەخوارد و داوای ڕێکەوتن نامەی نوێیان لێدەکردم. زۆر بەباشی





دەیانزانی لەسەر کەشتیەکن کە لە نقومبووندایە، بەڵام ئیدی بەسەختی نەخۆشکەوتبوون و دەستیان لە خۆیان شۆریبوو، لەبەرئەوە داوای زیاتر و زیاتر و زیاتریکیان دەکرد. هەروەک هەموو جۆرە ئالودەبوونێکی تروابوو، بەڵام لەوێدا تەنها ئەوەندەبوو کە کاتی ڕوهەڵماڵینەکەیان دواخستبوو. پرسیارێکم لە یەکێکیان کرد و وتم "ناترسیت لەوەی لەپاش مردنت پەردە لەسەر هەموو نهێنیەکانت هەڵماڵرێت؟"، سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم و وتی "ئێ خۆ ئەو کاتە چیتر من لێرەدا نیم، ڕۆیشتووم". من وەک بێشەرمیەک ئەوەم دەبینی، بەڵام هاوکات مانایەکی زۆریشی هەبوو لەلام. یەکێک لە سیفەتە باوەکانی شارستانی پۆست مۆدێرنی لەوەدا دەبینرێت کە تارادەیەک بە هیچ جۆرێک ڕێز لە سەروەری پاش مردن ناگرن. ژیان شارێکی یاری و خۆشی و ڕابواردنە و ئەندێشەی قوڵ و دووربینیش لەو کاتە زیاترێک تێناپەڕێت کە شاری یاریەکە دادەخرێت.

لەلایەکی تریشەوە زۆر ڕێی تێدەچوو کە ئەو مشتەریانە ڕقیان لێمبێت. زۆر ڕێی تێدەچێت کە ئالودەی هیرۆین بیت و لە هەمان کاتیشدا قێزت لەو کەسە بێتەوە کە بۆت پەیدا دەکات.

من خۆم هەر بەئارامی مامەوە، هەتا ڕۆژێکیان وتارێکی کورتم لە "دار سپایگل"دا خوێندەوە کە دەربارەی ڕۆمانێکی سەرسوڕهێنەر بوو کە لە ئەڵمانیا دەرچووبوو، ڕۆمانەکە باسی یاری شەترەنجی دەکرد. ڕۆمانەکەم پەیداکرد و تا هەموویم نەخوێندەوە دامنەنا، بەتەواوەتی سەرسامبووم.

ڕۆمانەکە کتومت لەسەر ئەو چیرۆکە داڕێژرابوو کە من چەندین ساڵ لەووبەر لە "فرۆگنەرسێتەر"دا بۆ ماریام گێڕایەوە، ئەو کاتە هەر چەند حەفتەیەک بەر لە سکپڕبوونەکەی ماریابوو. کۆمەڵێک





وردەکاری لە ڕۆمانە ئەڵمانیەکەدا جیاوازبوون، ناوەکان گۆڕدرابوون، شوێنی ڕوداوەکان گوێزرابوونەوە بۆ ئەڵمانیا، بەڵام خودی چیرۆکەکە بەتەواوەتی وەک ئەو چیرۆکەبوو کە من کاتی خۆی هۆنیمەوە _لە هەندێ شوێنی دیاریدا لەسەدا سەد وەک ئەوەی من بوو. نوسەرەکە ناوی "ویلیامین ویتمان" بوو، من بە هیچ شێوەیەک لەوەوپێش ناوی ئەو نوسەرەم نەبیستبوو، بەڵام بێگومان پێدەچوو نازناوێک بێت.

من لەسەدا سەد دڵنیابووم کە ئەو چیرۆکەم تەنها بۆ ماریا گێڕابووەوە، وە تەنها لەبەرئەوەش بەهیچ کەسێکم نەفرۆشتبوو، چونکە تا ئەو کاتە هیچ نوسەرێکی وام نەدۆزیبووەوە کە بەبڕوای من بتوانێت ئەو ڕۆمانە بنوسێت. تەنها دوو بوار ڕێیتێدەچوو؛ یان ماریا بەڕێکەوت ئەو چیرۆکەی "لۆرد هامیلتن"ی بۆ کەسێک گێڕاوەتەوە، بۆ نمونە بۆ نوسەرێک. یاخود _قبوڵکردنی ئەم بوارەیانم بەلاوە سەختترێکبوو_ ماریا خۆی نوسیویەتیەوە و بە نازناوی "ویلیامین ویتمان"ەوە بڵاوی کردۆتەوە. چیرۆکەکە جوان داڕێژرابوو، تارادەیەکیش ئەنجامەکەیم بەدڵبوو، هەرچەندە بەلای منەوە بەتەواوەتی بەسترابوو بە ناوچە بەرزاییەکانی سکۆتلەنداوە.

دەرکەوتنی لەناکاوی ئەو نیشانە زیندوەی ماریا هەژاندمی. بیرۆکەی ئەو ڕۆمانی شەترەنجەی کە بەئەڵمانی ناویان نابوو "نهێنی یاری شەترەنج" تەنها یەکێک بوو لە چەندەها و چەندەها چیرۆکی تری من کە کاتی خۆی هەروا بۆ ماریام گێڕابووەوە، زۆریشیان بووبوون بە ڕۆمان و بڵاویش کرابوونەوە. بڵێیت چەند چیرۆکێکی تریش لەلایەن "ویلیامین ویتمان"ەوە بڵاوبکرێتەوە؟ لەو حاڵەتەدا ڕێیتێدەچوو "یاریدەدەری نوسەر" بکەوێتە کێشمەوکێشێکی ڕاستەقینەوە.

لەوێدا ماریا هێندەی نیشاندام کە یادوەریەکی زۆر بەهێزی هەیە و دەستی بە یاری شەترەنج کردووە.

## نوسراوی سەر دیوارەکە

لەو کاتەدابوو کە بەگوڕ لە دەرەوەی وڵاتدا دەستبەکاربووم. کاتی خۆشی بوو، چونکە تەونەکەی نەرویجم زۆر چڕبووبووەوە. ڕاستە خەڵکی وڵاتی ئێمە پەرشوبڵاوە، بەڵام هەرچی دەربارەی نوسەرەکانیەتی تابڵێیت خەڵکەکانی نزیکی یەکن. بەڕاستی کاتی ئەوە هاتبوو کە زوو زوو سەفەربکەم بۆ ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و فەرەنسا و ئیسپانیا و بەریتانیا.

لەپێشدا ناچاربووم کارێک لە دەزگایەکی چاپەمەنیدا بدۆزمەوە. من دەمێکبوو دەمزانی کە ئەوە قۆناغێکی پێویستە. هەر لەمێژەوە چەندەها سەرنوسەر هێندەیان بۆ دەرکەوتبوو کە من کەسێکی یاریدەبەخشم، کەسێکم بەخۆشبەختیەوە ئەندێشە و بیرۆکەی جیاواز بەناو نوسەرەکاندا پەخشدەکەمەوە، من جێگەیەکی بەرزم لەلای ئەوان داگیرکردبوو. زۆر کەڕەت هەر بەئاشکرا داوایان لێدەکردم کە ببمە ڕاوێژکاری کتێبێک. شتێکی جیاواز و خۆشبوو بەلامەوە، لەلایەکی تریشەوە دڵشادبووم بەوەی کە چەند کاغەزێکی ڕەسمیم پێبوو و دەیسەلماند کە پارەم پەیدا کردووە، چونکە هەروا بەئاسانی نەمدەتوانی قەناعەت بە دائیرەی باج بکەم وبڵێم بەڕاستی هەندێک لەو پارانەی پەیدایاندەکەم باجیان لەسەرە.









ئیشێکی کاتیم بۆماوەی ساڵێک لە دەزگایەکی گەورەی چاپەمەنیدا دۆزیەوە، وەک سەرنوسەری ئەدەبیاتی وەرگێڕدراو دایانمەزراندم. من یەکێک بووم لە نێوان چەندەها کەسی تردا کە داوای ئەو کارەیان کردبوو، بەڵام هەرئەوەندی پێمراگەیاندن کە ئەو کارەم دەوێ، یەکسەر منیان دامەزراند. تەنانەت پێویستیشی نەکرد بەنوسراوی ڕەسمی داوای ئیشەکە بکەم، چونکە ناوبانگێکی باشم هەبوو، بێگومان هەمووان "پیتەر"یان دەناسی. من کەسێکی پایەبەرزبووم و لەژێرەوە ژیانی ئەدەبیم بەڕێوەدەبرد.

بەهیچ شێوەیەک مایەی سەرسوڕمان نەبوو کە من داوای ئیشێکم لە دەزگایەکی چاپەمەنیدا کرد. بەپێچەوانەوە، ئەوە سەیربوو کە زۆر لەوەوپێش داوام نەکردبوو. ئەو ڕاستیەش کە من جگە لە شەهادەی شەشی ئامادەیی هیچی ترم نەبوو هانای بۆ بەرم، هیچ شتێکی لە پلەوپایەم کەمنەکردەوە و گرنگیان پێنەدا. من خۆم خۆمم فێر کردبوو و شەرمیشم لەوە نەدەکرد کە شەهادەیەکی دانیشگام نەبوو _من ئەو قۆناغەم پەڕاندبوو. خەڵکی وا هەیە کە زۆرترێک لە خودی خۆیانەوە فێردەبن وەک لە خەڵکانی ترەوە.

ئەو دەزگای چاپەمەنییەش بەختەوەربوو کە دەرگای بۆ یەکێکی وەک من کردەوە. ئیشێکی باشم بۆ دەکردن، هیچ گومانێک لەوەدا نەبوو، بەڵام تەنها خۆم دەمزانی کە من لەڕێگەی ئەو ئیشەوە دەتوانم چەندەها پەیوەندی بەنرخ لەگەڵ دەرەوەی وڵاتدا دابمەزرێنم، دەتوانم چەند ناسیاوێک بدۆزمەوە کە کاریگەریەکی مەزنی هەبێت بۆ بڵاوبوونەوەی "یاریدەدەری نوسەر".





بۆ ماوەی چوار ساڵی ڕەبەق لەو دەزگایەدا کارمکرد، بەڵام هەر لە ساڵی یەکەمەوە کەسایەتیە گرنگەکانی ناو چاپەمەنیە هەرە گەورەکانی دەرەوەی وڵات دەیانزانی چ کەسێک بەتەواوەتی ئاگای لە ژیانی ئەدەبی وڵاتەکانی ئەسکەندەنافیایە. ئەرکی سەرشانی من ئەوەبوو کە ئەو کتێبە بیانیانە بدۆزمەوە کە شایانی ئەوە بوون وەربگێڕدرێنە سەر زمانی نەرویجی. ئەو کارە هەر زۆر ئاسانبوو. نوێنەرەکان دەیانزانی پەیوەندی بە چ کەسێکەوە بکەن. لە نێوان هۆڵەکانی پێشانگای کتێبی فرانکفۆرتدا وروژمیان بۆ دەهێنام و بەڕاکردن بەرەوڕوم دەهاتن. زۆر خۆشبوو، چێژم لەو حاڵەتە دەبینی. ئەملاولایان ماچدەکردم و کارتی ناونیشانی خۆیان پێدەبەخشیم. هەموویان ئەو ڕاستیەیان زۆر باش دەزانی کە ئەگەر من کتێبێک بەباش نەزانم ئەوا شەنسێکی هێندە زۆری نابێت کە لە وڵاتانی ئەسکەندەنافیدا بڵاوبکرێتەوە، بەو شێوەیەش بوومە سەنگی مەحەکیان. جارجارێک بەرلەوەی دەزگایەکی چاپەمەنی ئەڵمانی یان ئیتاڵی کتێبێک بخاتە بەردەست بازاڕی یابانی یان ئەمریکیەوە، دەهاتن و داوای ڕای منیان دەکرد، منیش یەکسەر بیروڕای خۆمم پێڕادەگەیانن و پێم دەوتن چ کتێبێک بەپێی من شەنسی بڵاوبوونەوەی لەو وڵاتانەدا هەیە. جاری واش هەبوو ناوی نوسەرێکی دیاریکراوم دەدانێ، یان یەک دوو وشەی باشم دەربارەی کتێبێکی دیاریکراو دەوت. بەدەرلەوەش زۆر جار شێوە ڕێکەوتننامەیەکی باشیشم بۆ دەخەملاندن. بەو شێوەیەش هەمیشە ڕویان تێدەکردم و داوای ئامۆژگاریان دەکرد، تەنانەت دەربارەی ئەو شتانەش کە لەبەرپرسیاری منەوە دوربوون. هەر لەو کاتەوەی کە من سەرنوسەری ئەدەبیاتی وەرگێڕدراوبووم، ڕۆڵێکی گرنگم هەبوو لە بڵاوکردنەوەی





ئەدەبیاتی ئەسکەندەنافیدا بۆ دەرەوەی وڵات. هەرگیزیش هیچ شتێکم نەدەوت ئەگەر بەتەواوەتی دڵنیا نەبوومایە لێی. کاتێک کە بە دەزگایەکی ئەڵمانیم دەوت کە ڕۆمانێکی دانیمارکی یان سویدی سەرکەوتنێکی نایاب لە بازاڕی ئەڵمانیدا بەدەست دێنێت، ئەو کاتە دەزگاکە سور دەیزانی کە من قسەکەم بەباشی هەڵسەنگاندووە. گرنگە لەو کاتانەدا کە مامەڵە لەگەڵ خەڵکانی تردا دەکەین، شتەکان بەباشی هەڵبسەنگێنین. متمانە کردن شتێکە کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا دروستدەبێت.

بێگومان ئەو پاشنیوەڕۆیەی لەدەرگای بەڕێوەبەری گشتی چاپەمەنیەکەمدا و وتم دەمەوێت دەست لە کار هەڵبگرم، پەشێوی و نائارامیەکی زۆر کەوتە ناو چاپەمەنیەکەوە. بەڵام ئیدی دەبوایە لەسەر ژیانی خۆم بەردەوامبوومایە. من هەر لەسەرەتای هەشتاکانەوە وەک چاودێریکەرێک کارم بۆ چەندەها دەزگای چاپە گەورەکانی جیهان کرد. ئیشەکەی من لەوەدابوو کە ئاگام لە کتێبە نایاب و نوێکانی وڵاتانی ئەسکەندەنافیا و زمانی ئەڵمانی بێت و ئەگەریش ناونیشانێک سەرنجی ڕابکێشامایە و پێموابوایە گرنگیەکی تایبەتی هەیە، دەبوایە بەزوترین کات زانیاریم بدایە بەو دەزگایانەی کە نوێنەرایەتیم دەکردن. ئەو کارە بوارێکی یەکجار نوێی بۆ کردمەوە، چونکە هەر زوو بووم بە نوێنەری چەندەها دەزگای چاپی بەناوبانگی وڵاتانی دەرەوە و لەوەبەدواوە زوو زوو سەردانم دەکردن.

لەسەفەرەکاندا بەردەوام بیرۆکە و ئەندێشەی نوێی ڕۆمانم بۆ دەهات. ئەو کاتەی کە گەنجترێک بووم چێژم لەوە دەبینی لەکاتی

پیاسەکردنی سەرشاخەکاندا بیربکەمەوە، یان کاتێک کە بەقیتار بە "هاردەنگێرڤیدا" دەڕۆیشتم. لەو کاتەشدا کە بەهۆی کارەکەمەوە دەستم بەسەفەرکرد، ئەو حاڵەتە هەروەکو خۆی مایەوە کە لەبەرزایی 40 هەزار "پێ"وە بەرەو "نیۆرک" و "ساو پاولۆ" و "سیندنی" و "تۆکیۆ" دەفریم. زۆرجار تەنها یەک دوو دەقەیەکم پێویستبوو بۆ ئەوەی بیرۆکەی ڕۆمانێک دابڕێژم، ئێ خۆ دەشبوایە بیرم لە شتێک هەر بکردایەتەوە، مێشکی من بەو شێوەیە خولقابوو. من نەمدەتوانی هەروا دابنیشم تەماشای دالانی ناو فرۆکەکە بکەم، بیر لەوە بکەمەوە کە دەستەی خزمەتگوزارانی ناو فرۆکەکە چ کاتێک قاوەیەکی ترمان بۆ دەهێنن. من کارێکی تایبەتیم هەبوو کە ڕێک لەگەڵ ئەو سەفەرە دوروردرێژانەدا ڕێکدەکەوت، دڵم بەوەش خۆشبوو کە موسافیرێکی خاوەن ئیشی ئاسایی نەبووم، بەتایبەتیش دڵم بەوە خۆشبوو کە ڕۆمان نوسێکی ئاسایی نەبووم. دەفتەرێکی تێبینی نوسینەوە شوێنێکی زۆر بچکۆلەتر دەگرێت وەک لە ڕەشنوسی ڕۆمانێک، یان کۆمپیوتەرێک، جگەلەوەش هەرزۆر کەمتر دەبێتە مایەی سەرنجی خەڵکانی تر. "هیگڵ" لە جوانناسیەکەیدا دەڵێت "هەتا هونەرێک نایابتر و پڕئەندێشەی قوڵتربێت، کەمتر و کەمتر ئەندازەی فیزیاوی داگیردەکات".

لەوەبەدواوە هیچ کەسێک بەلایەوە سەیرنەبوو کە من لەهەموو فیستیڤاڵ و پێشانگای کتێبەکانی سەرانسەری جیهاندا دەردەکەوتم، چونکە من پارەم لەبەرامبەری ئەوەدا وەردەگرت کە چاوم کراوەبێت. من دەبوایە ئاگام لەو ڕۆمانە گرنگانە بوایە کە هێشتام بە زمانەکەی خۆیان چاپنەکرابوون. ئەو حاڵەش کە هیچ کەسێک نەیدەزانی ئەوەبوو کە من لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراودا بەڕاستی بەرلەوەی









ڕۆمانێک بنوسرێت، من ئاگام لێیبوو... تەنانەت بەرلەوەی نوسەرەکە خۆشی بزانێت کە ڕۆمانێکی دیاریکراو دەنوسێت، من دەمزانی. ئەوەش بۆ کەسێکی چاودێریکەری وەک من هەتا بڵێیت نرخێکی بەرزی هەبوو. من زۆر زیرەکبووم لە جیاکردنەوەی ناونیشانە گرنگەکاندا. دەڵێن کە من هەستی شەشەمم هەیە.

بەلای "یاریدەدەری نوسەر"ەوە مایەی سەربەستیەکی گەورەبوو کە چیتر تەنها بە نوسەرە ئەسکەندنافیەکانەوە نەبەسترێتەوە. هەندێک لە بیرۆکە گرنگەکانم وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی و ئیتالی. بێگومان ئیشێکی گەورەبوو، بەڵام شتێکیش نەبوو کە نەکرێت. من هەمیشە حەزم لەوەبووە کە ئەدەب بەزمانە ڕەسەنکەی خۆی بخوێنمەوە، لەڕاستیدا تاڕادەیەک ئەوە مەرجێکی خوێندنەوەم بوو. لەبەرئەوە هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە وەک ئارەزوویەک دەستمکرد بە فێربوونی چەند زمانێکی نوێ. ئیدی "یاریدەدەری نوسەر" کۆمەڵێک نوسەری زیاتری لەبەردەستدابوو و دەیتوانی بەئارەزوی خۆی یەکێکیان هەڵبژێرێت. نوسەرێکی ئەمریکی یان بەڕازیلی تاڕادەیەک هەستی بە مەترسی نەدەکرد کە بیرۆکەیەک لە کەسێکی نەرویجی بکڕێت. لەو کاتە بەدواوە ئیتر بەیەکجاری دەوڵەمەندبووم.

کاتێکی زۆری ڕۆژانەم بەوەوە دەڕۆیشت کە پەیوەندیەکی نزیک بە نوێنەران و نوسەران و چاپەمەنیەکانەوە بهێڵمەوە، پاش ماوەیەکی کەمیش بووم بە کەسێک کە خەڵکانێکی زۆر حەزیان بە مەعشەرم دەکرد و پێیانخۆشبوو لەسەر مێزەکەم دابنیشن. بەهیچ جۆرێکیش مایەی شەرم نەبوو لە پێشانگای کتێبەکانی فرانکفۆرت و لەندەن و بۆلۆگنا و پاریسدا لەگەڵمدا دانیشن و نانێکی نیوەڕۆ بخۆن،





بەپێچەوانەوە زۆرجار مایەی شانازیبوو لەتەنیشتمەوە ببینرێن. چەندەها ئافرەت دەورەیان دابووم، وە بەهیچ شێوەیەکیش لایەنێکی خراپنەبوو کە کەسایەتیەکی خۆشت هەبێت؛ من چەندەها شەوی خۆشم لەگەڵ چەندەها بەڕێوەبەری ئافرەتی دەزگاکاندا ڕابوارد. تەنها شتێک کە بەربەرەکانێی دەکردم، ئەو کەسانەی تربوون کە وەک من چاودێریکەربوون. نەمدەتوانی هەمان کتێبی نایاب بخەمە بەردەم "سیئویل" و "گالیمارد".

*

ئەو کاتەی کە لە بەهاری ئەمساڵدا پێم خستە ناو پێشانگای جیهانی کتێبی منداڵان و گەنجان لە "بۆلۆگنا"، خورپەیەکی سەیر بەدڵمدا هات و هەستمکرد ئەوە دواهەمین پێشانگای کتێبمە کە بیبینم. هەر لەیەکەمین پێشنیوەڕۆوە هەستمکرد کە شتەکان وەک جارانی پێشوو نین. من هەمیشە ئەو توانایەم هەبووە و دەمتوانی یەکسەر هەست بە جەوی خۆش و ناخۆش بکەم.

هەر یەکسەر لەپاش کردنەوەی هۆڵەکانی پێشانگاکە، لەگەڵ سەرنوسەرێکی فەرەنسیدا کەوتمە قسە کە ماوەیەک لەوەوپێش چیرۆکێکی چاپکراوی دەزگاکەی سەرکەوتنێکی نایابی بەدەستهێنابوو و ئەو چیرۆکەش لەسەر یەکێک لە بیرۆکەکانی من داڕێژرابوو. نوسەرەکەش کە چەند ساڵێک لەوەوبەر لە باڕێکی فیستیڤاڵە ئەدەبیەکەی "ئێدینبۆرگ" بینیبووم، مەرام و مەبەستەکانی منی باش بەکارهێنابوو، زمانی ڕۆمانەکەشی تابڵێیت نایاب بوو. کاتی خۆی لەبەرامبەردا پارەیەکی باشی دامێ، جگەلەوەش دەبوایە لەسەدا





پێنجی داهاتی داهاتووی کتێبە فەرەنسیەکە و وەرگێڕانەکانیشی بۆ من بوایە. کتێبەکەی چەندەها خەڵاتی بردبووەوە و هەتا ئەو کاتە بۆ حەوت هەشت زمانی تریش وەرگێڕدرابوو. منیش دەقێکی ڕاست و دروستی ڕێکەوتن نامەکەمانم لەسەر کاسێتێکی دیکتافۆنەکەم لابوو، بێ خەم لەگەڵ کۆپیەکی پارە ڕەوانەکردنەکەیدا لە سندوقی بانکێکدا دامنابوو. بەدەرلەوەش دەنگیم لەسەر کاسێتێکی تر هەبوو کە بەستبووم بە تەلەفونەکەی ماڵەوەم لە ئۆسلۆ. من هەمیشە ژمارەی تەلەفونی ماڵەوەم دەدا بە نوسەرەکان، ئەو ئامێرەش بێدەنگبوو کە لە تەلەفونەکەم بەستبوو و دەنگەکانم لەسەر کاسێتێکی بچکۆلە پێ تۆماردەکرد، هەر بۆئەوەی هیچ بوارێکی تێدا نەهێڵمەوە کە دواتر بەهەڵە لێی تێبگەن، لەدوای قسەکانمانەوە بە کورتی هەموو ئەو شتانەم دەوتەوە کە لەسەری ڕێککەوتبووین.

هەرزوو دڵنیابووم لەوەی کە ئەو سەرنوسەرە فەرەنسیە دەیزانی ئەو ڕۆمانەی کە ئەو هەموو خەڵاتەی وەرگرتبوو، بە چ شێوەیەک داڕێژراوە. لەدڵی خۆمدا دەموت "بڵێیت نوسەرەکە خۆی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێی وتبێت؟ ئەگەر وابووبێت، کەواتە بۆ پێی وتووە؟ بڵێیت کەسێک بێت کە بە هیچ شێوەیەک ڕێزی خۆی لەلا نەبێت؟"

هیچ شتێک بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ باسنەکرا، بەڵام بەو شێوەیەی کە سەرنوسەرەکە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد لەگەڵمدا، هێندە تێگەیشتم گومان لەوەشدەکات کە ئەو یارمەتیەی من کە پێشکەشی ئەو نوسەرە دیاریکراوەم کردبوو، تەنها جارم نەبووە. هەر ڕاستەوخۆ وتی "تۆ ئاگات لە هیچ حاڵەتێکی تری لەو بابەتە هەیە؟". دواتریش لەو کاتەدا کە وامنیشاندا کە چیتر تاقەتی ئەو گفتوگۆ قۆڕەم نیە ـ زۆر بەئاسانی قاوەی ناو کوپە کارتۆنیەکەم هەڵگرت و بێئەوەی گوێ بەو





بدەم بەرەو هۆڵی ئەڵمانی ڕۆیشتم _ قۆڵی گرتم و وتی؛ «ئاگات لە خۆت بێت پیتەر». بەجۆرێکی میهرەبانانە وتی، بەڵام من پێموانەبوو مەبەستێکی میهرەبانانەی هەبێت. من قسەکەیم وەک هەڕەشەیەک لێکدایەوە. ڕەنگە خەمی ناوبانگی نوسەرەکەی بووبێت و لەوێشەوە لە جێمتمانەی دەزگاکەی خۆی بترسێت.

بۆ ماوەیەک وەستام و قسەم لەگەڵ بەڕێوەبەری یەکێک لە دەزگا گەورەکانی چاپەمەنیەکی ئەڵمانیدا کرد. وتی ئەمساڵ چاپەمەنیەکەمان ناوی کۆمەڵێک کتێبی نایابی لە لیستەکەدایە. پەرداخێک شەرابی ئیتاڵیمان خواردەوە، ئەو پیاوەی کە قسەم لەگەڵدادەکرد ئاگای لەوە نەبوو کە ئامادەکردنی دوو کتێب لەوانەی کە باسمانکردن گەلێ گەلێ ساڵ لەوەوبەر لە ئۆسلۆدا ئەنجامدراون. بەڵام ئەوە هیچ ڕۆڵێکی وای نەبوو.

بەدرێژایی ئەو پێشنیوەڕۆیە بەناو هۆڵەکانی پێشانگاکەدا سوڕامەوە. من لەسەر ئیشبووم و هەمیشە حەزم لەو جۆرە پێشانگایانەبوو، مایەی خۆشحاڵیم بوو ئامادەیانبم. هۆڵەکان و ڕاڕەوەکانی پێشانگا گەورەکانی ئەوروپا وەک قەلایەکی ئیمپڕاتۆری تایبەت بە خۆم وابوون، من بەتایبەتی لەو وەرزی بەهارەدا پێمخۆشبوو لە "بۆلۆگنا"دا بم. لە "بۆلۆگنا"دا باشترێک نانم دەخوارد. ئافرەتێکی زۆر لەوێدا هەبوون.

چێژم لەوە دەبینی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری پێشانگاکە بڕۆم و سڵاو لە هاوکارانم بکەم کە لە هەموو سوچ و گۆشەیەکی جیهانەوە هاتبوون. هێندە نوسەری زۆر لە پێشانگاکەی "بۆلۆگنا"دا ئامادە نەبوون، بەڵام چەندەها کتێبی خۆمم بەرچاوکەوت. من بەدرێژایی ئەو چەند ساڵانەی پێشوو چەندەها کتێبی منداڵان و گەنجانم داهێنابوو،





بەڵام تەنها خۆم دەمزانی کە چەندە فرەڕەنگم. زۆرم پێ خۆشبوو لەگەڵ سەرنوسەرەکاندا باسی ئەو کتێبە سەرکەوتوانەی ساڵەکە بکەم کە من بەباشم زانیبوون، هەر زۆر ڕاستەوخۆش ڕای خۆمم دەردەبڕی. هەستمدەکرد دەبوایە بەو شێوەیە بومایە و زۆر بەبێ بەزەییانەش ڕەخنەم لەو ڕۆمانانەی خۆم دەگرت کە بەشێوەیەکی خراپ نوسرابوون. بۆ نمونە دەموت "ئەو نوسەرە ئافرەتە بیرۆکەی سەرەکی ڕۆمانەکەی خۆی بەخەسارداوە و دەیتوانی بەشێوەیەکی زۆر باشتر بەکاریبهێنێت". دواتریش بە وشەی خۆم کرۆکی ڕاستەقینەی ڕۆمانەکەم بەو شێوەیە دەگێڕایەوە کە من بۆی دەچووم. ئەوەم بەلاوە خۆشبوو. من وام لە زۆربەی سەرنوسەرەکان دەکرد کە زیاترێک بیربکەنەوە، چونکە هەموو سەرنوسەرەکان نەیاندەتوانی وەک من کتومت پیلان و گلۆڵەی شاراوەی ناو چیرۆکێک دیاریبکەن. لەڕادەبەدەر لەزەت و خۆشیم لەوە دەبینی. من نەمدەتوانی هەمیشە لەپێش پێشانگاکاندا سەرتاپای هەموو کتێبەکان لەسەرەتاوە تا کۆتایی بخوێندمەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمتوانی بەشێوەیەکی گشتی ناوەڕۆکی هەموو ئەو کتێبانە بخەمەڕوو کە لەوەوپێش خۆم دەستێکم لە نوسینیاندا هەبوو بوو. من زیاد لە ڕادە ئاگام لەو شتانەبوو. بێگومان دەبوایە هەر بەو شێوەش بوایە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەستمدەکرد شتێک لە پێشانگاکەی "بۆلۆگنا"دا گۆڕاوە و وەک پێشانگای کتێبەکەی فرانکفۆرت نیە کە شەش مانگێک لەوەوبەر سازکرا. وابزانم لەماوەی ئەو پێشنیوەڕۆیەدا سەلامم لە 100 کەسێکی ناسیاوکرد. ئەوە زۆرنەبوو بەلامەوە _لەماوەی یەک پێشنیوەڕۆی تەواودا سەلامکردن لە 100 کەس لەشوێنێکی وەک

پێشانگای کتێبێک بەهیچ جۆرێک زۆر نەبوو، بەلایەنی کەمەوە بۆ کەسێکی وەک من کەمبوو.

ئەو رۆژە هەتا دەهات زیاتر و زۆرتر قەناعەتم بەوە دەکرد کە چەند خەڵکێک خەریکی پلاندانانبوون. بێگومان ئەوە هەمووانی نەدەگرتەوە، ئەوەشم دەبینی، کۆکردنەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە من لەماوەی ئەو هەموو ساڵەدا کارم لەگەڵدا کردبوون، شتێک بوو کە رێی تێنەدەچوو، هەروەک ئەوەوابوو بتەوێت هەموو مێرولەی دارستانێک لەیەک شارە مێرولەدا کۆبکەیتەوە. بەڵام چەند کەسێک خەریکی پلاندانانبوون. لەوەدەچوو کاتی خۆی بێت، لەوانەبوو کاتی من تەواوبووبێت.

نوێنەرێکی ئیتاڵی قۆڵی گرتم و هەر لەخۆیەوە بەبێ بیرکردنەوە هاواریکرد و وتی؛ «ئێی، ئەمساڵیش هاتوویت بۆ پێشانگاکە؟» هەتا بڵێیت پرسیارێکی سەیربوو، چونکە لەلایەکەوە خۆی منی دەبینی کە لەوێدابووم، لەلایەکی تریشەوە بەلایەنی کەمەوە دە ساڵبوو لەسەر یەک دەچوومە ئەو پێشانگایەی "بۆلۆگنا". کەمێک دواتر "کریستینا"م بینی، دەمێکبوو ئەویشم دەناسی. ئەو ئیشی بۆ یەکێک لە دەزگا هەرە گەورەکانی چاپی ئیتاڵی دەکرد و جوانترین چاوی دونیای پێوەبوو و خاوەنی سێکسیترین دەنگی جیهانیش بوو _لەدوای "ماریا"وە. بەڵام لەوێدا کە بینیم یەک بەخۆی داچڵەکی، دەتوت خێویکی لە رۆژی روناکدا بینیوە، هاواریکرد و وتی «پیتەر! وتارەکەی ناو "کۆریرێ دیللا سیرا"ت خوێندۆتەوە؟» هەرئەوەندە فریاکەوت بڵێت و پورتوگالیەک پێوەی نوسا کە من کەمێک لەوەوبەر سەلامم لێکردبوو. کەسێکی نوێ بوو. ئەویش هەروەک من کاری چاودێری دەکرد. بەڵام ئیدی لەدوای قسەکەی کریستیناوە سەرم گێژی دەخوارد.







لەدڵی خۆمدا وتم "باشە، کەواتە وتارێک لە "کۆریرێ دیللا سیرا"دا نوسراوە و دەبێت من بیخوێنمەوە". قەت ئەوە من نەبووم کە ئاوها بێئاگابم، بەڵام بەڕاستی ماوەیەکی زۆربوو من نەچووبووم بۆ خواروی شاخەکانی ئەلپ. رقم لەو جەو گۆڕینە کتوپڕەی ناو ئیمپراتۆریەتەکەبوو، چەند کەسێک خەریکی پلاندانانبوون، لەوەدەچوو شۆڕش هەڵبگیرسێت، ئەو کاتەش کە شۆڕش بەڕاستی هەڵدەگیرسێت، چی لە ئیمپراتۆر دەکەن؟

ئەوە رۆژە ئەوەندەم بەسبوو، هەرچەندە وەک کار هیچ شتێکم ئەنجامنەدابوو. لە رێگامدا بەرەو دەرگای چوونە دەرەوەی پێشانگاکە چاوم بە نوسەرێکی دانیمارکی کەوت کە رۆمانێکی بۆ گەنجان نوسیبوو و تازەکی بە زمانی ئیتاڵی دەرچووبوو. بەبڕوای من نوسینەکەی هێندە جوان نەبوو، بەڵام برپرەی بیرۆکەی رۆمانەکەی سەرنجڕاکێش بوو. لەسەر تێبینیەکی من هەڵیچنیبوو کە کاتی خۆی لە فیستیڤاڵی ئەدەبی تۆرنتۆدا لێی کریبووم. پێموابوو هەر بەلایەنی کەمەوە هێندە بهێنم کە بەسەر سەلامێکی برادەرانەم لێبکات. راستە رێیتێدەچێت لەو پێشانگای کتێبانەدا یەکجار سەرت قاڵبێت، بەڵام ئەو نوسەرە دانیمارکیە رێک لەو کاتەدا کە بینیمی بەئاشکرا رووی وەرچەرخاند و سەیری لایەکی تری کرد. وا دەهاتە بەرچاوم کە سەرسامی ئەوەبێت کە هێشتام هەر لەژیاندام. رەنگە ئەو حاڵەتە هێندە سەیر نەبێت کە کەسێک گومان لەوە بکات کە سەیری ناوچاوی کەسێکی تربکات کە وابزانێت مردووە. جگەلەوەش شتێکی تریشم بۆ روونبووەوە؛ لەوەدەچێت گرفتێکی هەر زۆر گەورەبێت ئەگەر بەرلەوەی برادەرێکت بۆ هەتاهەتایە ونبێت، تۆ چەند سەعاتێک یان چەند رۆژێک لەوەوپێش بیبینیت. وە بەتایبەتیش ئەگەر خۆت دەستێکت لە





ونبوونەکەیدا هەبێت. من لەڕادەبەدەر فەنتاسیایەکی پڕلەژیانم هەبوو. مەزاجم خراپبوو و خەریکی نوسینەوەی بیرۆکەی ڕۆمانێک بووم کە دەربارەی مردنی خۆم بوو.

ئیتر یەکسەر بەرەو دەرگای دەرەوە هەنگاومنا و تەکسیەکم گرت بۆ ئوتێلەکەم. لەقاتی چوارەمی ئوتێلی "باگلیۆنی"دا دابەزیبووم. کە گەیشتمە ژورەکەم، بتڵێک ئاوم لە بارە بچکۆلەکەدا دەرهێنا و هەڵمیچری، دواتر خۆمدا بەسەر جێگای خەوە پانوپۆڕە دوو نەفەریکەدا و هەر بە بتڵەکەی دەستمەوە خەوم لێکەوت. پاشئەوەی لە خەوێکی قوڵ و دوورودرێژ خەبەرمبووەوە، بۆ ساتێک لەوە ترسام میزم بە جێگاکەمدا کردبێت.

*

پاش دوو سەعاتێک لە دوکانی پیتزەری "ماگیۆری"دا دانیشتبووم و بیرەم دەخواردەوە. بێئارام بووم. خەڵکانی دەزگای چاپەمەنیەکانی تر لە دەوروبەری هەموو قاوەخانەکانی ئەو ناوەدا بەرچاودەکەوتن، من کەم تازۆر هەموویانم دەناسی. هەندێکیان وەک برادەرێک بەسەر سەلامێکیان لێکردم، بەڵام هەندێکی تریان سەلامیان نەکرد. هەستمدەکرد بە چاوێکی پڕلەمەغزاوە نیگایان تێدەگرتم. هەستمدەکرد کەسێکی ڕەزاگرانم.

هەر لەم شوێنەدابوو کە جاران گەر بمویستایە کچێکم بۆ ئێوارەیەک دەدۆزیەوە؛ یان کچێکم دەدۆزیەوە کە لەوەوپێش دەمناسی، یان بەکچێکەوە دەنوسام کە لە ماوەی پێشودا پێیان ناساندبووم. هیچ دوو کەسێک لە پێشانگای کتێبدا دەستگیرانی یەکتری نەبوون، لە





پێشانگای "بۆلۆگنا"دا ڕێژەی پیاو و ئافرەت وەک یەکبوو، بەڵام تەنانەت یەک ژن و مێردیشی تیا نەبوو. من هەمیشە دوو ژورم لە ئوتێلی "باگلیۆنی"دا دەگرت. چەندەها سەرنوسەر و نوێنەری دەزگاکانی تر زۆر ساکارانەتر ئەو ماوەیەیان بەسەردەبرد.

لەسەر مێزێکی قاوەخانەکەی تەنیشتما چاوم بە"کریستینا" کەوت، لەگەڵ "لویجی"دا دانیشتبوو. "لویجی" هەر تەنها بەڕێوەبەرێکی بەتوانا و لێهاتووی دەزگایەکی چاپ نەبوو، بەڵکو کوری "ماریۆ"ی بەناوبانگیش بوو. کەرەتێکیان لە "میلانۆ" بووم و ڕێگەیان پێدام لە هۆڵی "لا سکالا"دا لە لۆچی تایبەتی "ماریۆ"دا دابنیشم، ئەو ئێوارەیە ئۆپێرای سروشبەخشی "تۆراندۆت"یان نمایشکرد.

ئەو کاتەی کە لە قاوەخانەکەی تەنیشتما چاوم بە "لویجی" کەوت، یەکسەر دایکمم بیرکەوتەوە. ئەگەر دایکم بمایە ئەوا بێگومان لەڕادەبەدەر چێژی لەوە دەبینی کە لە هۆڵی "لا سکالا"دا لە لۆچی تایبەتی "ماریۆ"دا دابنیشێت. ئەو کاتە وەک شاژنێک ڕەفتاری دەکرد. بەڵام من ئەو ئێوارەیە بەتەنها لە لۆچە تایبەتیەکەی "ماریۆ"دا دانیشتبووم. ئەگەر دایکم بژیایایە، ئەوا لەوانەیە "یاریدەدەری نوسەر" بە هیچ شێوەیەک بوونی نەبوایە، بەو شێوەیەش ڕەنگە هەرگیز کەسێکی وەک "ماریۆ"م نەناسیبایە. ئەگەر دایکم هەر کەمێکی تر بژیایایە، ئەوا هەموو شتێک جیاواز دەبوو و پێیدەچوو قەت کەسێکی وەک "ماریا"م نەناسیبایە.

دیسانەوە ڕۆمانی "نهێنی یاری شەترەنج"ەکەم بیرکەوتەوە. چەند ساڵێک بەسەر دەرچوونی ئەو کتێبەدا تێپەڕیبوو. ئەو کاتە یەکسەر ئەو بیرۆکەیەم لە مەلەفی ئەو بیرۆکانەدا دەرهێنا کە دامنابوون بۆ





فرۆشتن و تورمدا. ئاخۆ هەنگاوی دواتری ماریا چی بێت؟ هەستمدەکرد هیلاکبم.

لەسەر یەکێک لە مێزەکانی تەنیشتمدا چەند کەسێک بە زمانی "سلافی" قسەیان دەکرد، من لێیان تێنەدەگەیشتم، بەڵام خورپەیەک بەدڵمدا هات و هەستمدەکرد باسی من دەکەن. گوێم لە دەنگی خەڵکانی سەر مێزەکانی پشتیشمەوە بوو، دیسانەوە لەوێشدا هەستمدەکرد هەموو خەڵکانی قاوەخانەکە باسی "جاڵجاڵۆکەکە" دەکەن. چیرۆکەکەی "ە. سی. ئاندەرسن"م بیرکەوتەوە کە دەربارەی پەڕێکە و دواتر دەبێتە پێنج مریشک و کەڵەشێر. بابڕۆین! با بڕۆین! هەمیشە ورتەورت لە پێشانگای کتێبەکاندا هەبوو، بەڵام ئەو جارەیان دەربارەی من بوون. لەناکاودا ترسام، نەمدەزانی بۆ، بەڵام نائارامبووم. ڕەنگە "ە. سی. ئاندەرسن" و نیگا پڕلەمەغزاکانی خەڵکانی چواردەورم تەنها شتێک بووبێتن کە من هەر بەخەیاڵ مەزەندەم کردبێت. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی وەک پێشانگای کتێبێکدا بیت و بەردەوام مەزەندەی ئەوە بکەیت کە خەڵکانی تر دواتکەوتوون، ئەوا پێویست ناکات چیتر لەو ناوەدا بمێنیتەوە. بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ئوتێلەکە و حەبێکی خەو بخۆم، بەڵام لەپڕێکدا قسەکەی "کریستینا"م بیرکەوتەوە کە لە پێشانگاکەدا پێی وتم. پارەی بیرەکەم لەسەر مێزەکەم دانا و بەناو مێزەکانی قاوەخانەکەدا بەرەو ڕوی "کریستینا" و "لویجی" ڕۆیشتم. ئەوان منیان نەبینی. بەهێواشی دەستێکم بەسەر شانی "کریستینا"دا هێنا و وەک پرسیارێک وتم؛ «کۆریرێ دیللا سیرا؟»

هەردووکیان بەیەکەوە داچڵەکین. ڕەنگە ئەوانیش باسی منیان کردبێت. "کریستینا" بەپەلە تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و وتی



"بەداخەوە من دەبێت بڕۆم". من ئەوەم بەلاوە سەیربوو، بۆچی ڕێک لەو کاتەدا دەبوایە بڕۆیشتایە کە من گەیشتمە لایان؟ پێشنیوەڕۆ هەر زۆر بەپەلە لەگەڵ پورتوگالیەکدا کەوتە قسەوباس و لەوێشدا هەروا بەئاسانی جێی هێشتم و کورسیەکەی خۆی دامێ، بەدەستی خواحافیزبوونێکی کرد و بەرەوروی کلێسەکە هەنگاوینا. لەو کاتەشدا کە بەپەلە ویستی بۆی دەربچێت، بەچاو لەگەڵ "لویجی"دا قسەی کرد. وا دەهاتە بەرچاوم کە "لویجی" بەچاو پێی بڵێت «تۆ بڕۆ خەمت نەبێت، من خۆم مشوری "پیتەر" دەخۆم»

تەماشایەکی "لویجی"م کرد و لێمپرسی؛ «چ وتارێک لە "کۆریرێ دیللا سیرا"دا نوسراوە؟»

لەسەر کورسیەکەی پاڵی دایەوە و قوتوی سیگارە بچکۆلەکانی لە گیرفانی چاکەتەکەیدا دەرهێنا. ئیدی هێندە تێگەیشتم کەباسەکەی کاتێکی باش دەخایەنێت. پرسیارێکی لێکردم و وتی؛ «هیچ شتێکت دەربارەی "جاڵجاڵۆکە"کە بیستووە؟»

منیش لە وەڵامدا وتم؛ «بێگومان... من هەموو شتێک دەبیستم»

«باشە» هێندەی وت و قومێکی لە بیرەکەی دا. "لویجی" پیاوێکی کەمدوو بوو. لەڕادەبەدەریش ئارامبوو.

«هیچ شتێک لە "کۆریرێ دیللا سیرا"دا دەربارەی "جاڵجاڵۆکە"کە نوسراوە؟»

سەرێکی بۆ لەقاندم.

وابزانم هەستی بەوە نەکرد کە قسەکەی دایچڵەکاندم. منیش هەوڵمدا ئاسایی وەربیگرم و بێمەوە سەرخۆم، هەربۆیە وتم؛ «کەواتە لەوانەیە ئەوە یەکەمین جاربێت کە شتێکی لەسەر بنوسرێت و بڵاوبکرێتەوە، چ شتێکی لەسەر نوسراوە؟»

وتی؛ «من زۆر بەباشی نوسەری وتارەکە دەناسم. ئەو شت لە "ئێڵ ئێکسپرێسۆ"شدا دەنوسێت و وابزانم خەریکی لێکۆڵینەوەیەکی دورودرێژ و قوڵی بابەتەکەشە»

جارستبووم و دەستم بەملاولادا بادا و وتم؛ «ئێ باشە چی نوسیوە؟»

تەنها "لویجی" دەیتوانی بەو شێوەیە خەندە بخاتە سەر لێوەکانی، ئینجا وتی؛ «"ستیفانۆ" پێیوایە کە "جاڵجاڵۆکە"کە کەسێکی نەرویجی بێت»

«ناوی هیچ کەسێک دەبات؟»

سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم. من قسەکەم بەچرپەچرپ پێوت. هەستم دەکرد چەندەها کەس گوێ قوڵاخن و گوێیان بۆ شل کردووین.

هەر بەچرپەچرپ وتم؛ «کەواتە خوا دەزانێت چ کەسێکی نەرویجیە»، "لویجی" پش زۆر سەرنجی دەدایە ئەوەی کە من بەچرپەچرپ قسەم دەکرد. ئینجا وتم؛ «"جاڵجاڵۆکە"کە لە هەموو شوێنێکدایە، لە هەموو شوێنێکدایە و لە هیچ شوێنێکیشدا نیە. وابزانم ناتوانم لەم بارەیەوە یارمەتیت بەم "لویجی"»

پرسیارێکی کرد وتی؛ «تۆ خۆت ئەو نیت "پیتەر"؟»

پێکەنیم و لەوەڵامدا وتم؛ «سوپاست دەکەم کە هێندە متمانەم پێدەکەیت. بەڵام وەک وتم ناتوانم یارمەتیت بەم، دەشتوانیت ڕێک ئەو قسەیەم بەبرادەرەکەت بگەیەنیت»

چاوەکانی داچەقاند، کەمێک دواتر بەرپەرچی قسەکەی دامەوە و وتی؛ «وابزانم شتەکان سەرەونخون هەڵدەگێڕیتەوە. "ستیفانۆ"ی برادەرم دەڵێت "ڕەنگە تۆ پێویستیت بە یارمەتی بێت". ئەگەر تۆ "جاڵجاڵۆکە"کەیت، ئەوا من وەک ئامۆژگاریەک پێت دەڵێم هەتا زووە بۆی دەرچۆ»





دیسانەوە پێکەنیمەوە. ناچاربووم واینیشانبدەم کە مەزاجێکی خۆشم هەیە و بێتاقەت نیم. بەهەر نرخێک بوایە دەبوایە وامدەربخستایە کە باسەکەمان باسێکی خۆشە.

سەیرێکی ئەملاولای خۆمم کرد و بەچرپەچرپێک پێموت؛ «بەڵام بۆ؟ ئەو "جاڵجاڵۆکە"یە بە چ شتێک تاوانبارکراوە؟»

سیگارێکی بچکۆلەی داگیرساندبوو و ئەوجا بەدورودرێژی باسەکەی تاوتوێکرد. بەشێوەیەکی ئاسایی "لویجی" هیچ یەکێک لەو دوانەی نەدەکرد. دەستی بە قسەکرد و وتی؛ «مەزەندەی ئەوە بکە کە "کارگەیەکی فەنتاسیا" هەیە. تەنها یەک کەسیش ئەو کارە بەڕێوەدەبات، ئەوەندەش وێنابکە کە ئەو کەسە پیاوێکە و بەردەوام بەنهێنی یەک لەدوای یەک بیرۆکەی سەرەکی نایاب نایابی ڕۆمان و شانۆگەری و ئەو شتانە دەچنێت. وابیهێنەرە بەرچاوت کە ئەو پیاوە نەیەوێت خۆی هیچ کتێبێک بنوسێت. لەوانەیە ئەو حاڵەتە هەم تەسەورنەکرێت و هەم پرلەنهێنیش بێتە بەرچاو، بەڵام هەر زۆر ڕێیتێدەچێت. ڕەنگە بەلایەوە سەختبێت کە ناوی خۆی بخاتە سەر نوسینەکانی، تەنانەت ئەگەر شیعرێک یان کورتە ڕۆمانێکیش بێت، لەوانەشە خۆزگەیەکی بەدەگمەنی هەبێت و بیەوێت نەناسراوبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت واز لە چنین و دارشتنی بیرۆکەی سەرەکی و چیرۆک بهێنێت، ناتوانێت خودی ئەو ماتۆرە بوەستێنێت. وێنای ئەو حاڵەتەبکە کە لەماوەی چەندەها ساڵدا تۆرێکی پەیوەندی بەرفراوانی لەناو جیهانی کتێبدا دامەزراندووە، هەم لە وڵاتی خۆشی و هەم لەسەر ئاستی جیهانیشدا. بەسەدان نوسەر دەناسێت و زۆربەیان جارجارێک بەدەست ئەو شتەوە دەناڵێنن کە ئێمە پێی دەڵێین "گیربوونی نوسین". ئینجا هێندە بهێنەرە بەرچاوت





_ئالێرەدایە کە پێویستە ئەو خەڵکانە بدۆزینەوە کە ئامادەی ئەوەبن کە بەڕاشکاوی قسەبکەن و ڕای خۆیان بڵێن_ مەزەندەی ئەوە بکە کە ئەو کارگەری فەنتاسیایە هێدی هێدی ئەدەبیاتی نیوەتەواو بە نوسەرانی نائومێد دەفرۆشێت. لێم تێدەگەیت؟»

ڕێک تەماشای ناوچاوی دەکردم. لەکاتی قسەکانیدا بۆیەکەی بانگکرد و بتڵێک شەرابی سپی داواکرد. پێمناخۆشبوو کە "لویجی" لەو بڕوایەدابوو کە لە من زیاترێک زانیاری لابێت.

دواتر وتم؛ «بێگومان. وابزانم ڕاستدەکەیت کە شتێکی لەو بابەتە ڕوودەدات. منیش هەمان هەستم هەیە»

"لویجی" وەک پرسیارێک وتی؛ «ئاوها؟»

منیش لەسەر قسەکەم بەردەوامبووم؛ «بەڵام جا قەیچێکە؟ ڕاستە ئەو دیاردەیەی کە باسیدەکەیت سەیریشە و سەرنجڕاکێشەریشە، بەڵام لەو بڕوایەدا نیت کە نوسەرەکان دڵیان بەو یارمەتیە خۆشبێت کە لە ڕێگەی کارگەی فەنتاسیاوە پەیدای دەکەن؟ پێتوانیە خوێنەرانیش خۆشحاڵبن بەوە؟ ئەگەر هەر زۆرت سەرمابێت و نەتوانیت گڕ بەردەیتە ئاگرێک، ئەوا خۆ سوپاسی ئەو کەسە دەکەیت کە لەپڕێکدا بە دەبەیەک نەوتەوە دێتە بەردەمت»

پێکەنی و وتی؛ «وایە وایە، بەڵام وابزانم تۆ هێشتام ئەم وڵاتە بەباشی ناناسیت»

ئەو قسەیەی بەلامەوە بێمانابوو. ئێ خۆ من خۆم ئەوروپیبووم. لەوێدا لێمپرسی؛ «دەتوانیت ناوی چەند ناونیشانێک بڵێیت؟»

ناوی پێنج ڕۆمانی پێوتم کە لەماوەی دووساڵی ڕابوردودا لە ئیتاڵیادا دەرچووبوون. چواریان هی من بوو. پێنجەمیشیان کە ناونیشانەکەی ڕێک بەپێچەوانەی خۆیەوەبوو و ناوی "سیتا" یان "ئاوریشم" بوو،





ئەوەشم خوێندبۆوە و بەلای منەوە وەک دەنکە مرواریەکی ناو چیرۆکێکی هەڵبەستراوی ئیتاڵی وابوو، بەڵام بیرۆکەی ئەو یەکەیان هی من نەبوو.

«ئافەرم» ئەوەندە لە دەمم هاتە دەرەوە. نازانم بۆ واموت، بەڵام شتێکی بێئەقڵانەم وت.

وتی؛ «بێگومان ئەو "کارگەی فەنتاسیا"یە دەتوانێت بۆ ماوەی چەندەها ساڵ چالاکبێت، بەڵام هێندەش بهێنەرە بەرچاوت کە نوسەرەکان نەختە نەختە دەپەشۆکێن. تازە ئەوانیش وەک وەرزشەوانێک کە مادەی چالاککەرەوە دەخوات، ئالودەی ئەوەبوون کە لەدەرەوە مادەیان بۆ بێت، بەڵام ئێستاکە لەوە دەترسن کە کۆنترۆڵ بیانگرێت. دەترسن ڕۆژێک لەڕۆژان هێندە دەرکەوێت کە ناتەواون. چیتر متمانە بە "جاڵجاڵۆکە"کە ناکەن. لەوانەیە لە داهاتوودا هەموو ئەو ڕێز و بەناوبانگیەیان لێبسەنێتەوە کە بەهۆی کتێبەکانیانەوە پێی گەیشتوون. وێنای ئەوەبکە کە ڕۆژێک هێندە دەپەشۆکێن، کە خۆیان لەگەڵ یەکتردا کۆدەبنەوە و باسی ئەو حاڵەتە دەکەن»

دیسانەوە تەماشایەکی ئەملاولام کردەوە، هەر بۆ ئەوەی بزانم کەس گوێی بۆ هەڵخستووین یان نا. بێئەقڵی بوو کە من ئاوها بەو شێوەیە سەیری ئەملاولام دەکرد. بەچرپەچرپ پێموت؛ «بەڵام بڵێیت ئەوە "جاڵجاڵۆکە"کە نیگەران بکات؟ ئێ خۆ ئەو هیچ شتێکی نایاسایی نەکردووە، من خۆم پێموانیە هیچ هەڵەیەکیشی کردبێت. بێگومان ڕێکەوتننامەیەکی ڕون و ڕەوانی لەگەڵ هەموو ئەو نوسەرانەدا بەستووە کە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون»

دیسانەوە وتیەوە «تۆ ئیتاڵی نیت. ڕەنگە هەر زۆر ساویلکەش بیت. بەڵام ئەوەش لێکبدەرەوە کە ئێستاکە نوسەرەکان پارەی





"جاڵجاڵۆکە"کەیان لەلایە، پارەیەکی زۆری ئەویان لایە، هەر زۆر زۆر»

ڕقم لەوەبوو کە یەکێک وەک کەسێکی ساویلکە تەماشام بکات. لەژیانمدا قۆڕترین شت بەلامەوە ئەو کاتانەبوو کە لەگەڵ یەکێکدا دەبووم و پێیوابوو کە لە من زیرەکترێکە. من لەوە نەدەترسام کە وەک "جاڵجاڵۆکە"کە ئامارژەم بۆ بکەن، بەڵام قێزم لەوە دەهاتەوە کە کەسێک پێی وابێت کە بەتەواوەتی لە من دەگات.

هەر زۆر بەئاسانی وتم؛ «ئەوە هەر کێشە نیە. ڕاستە نەیتوانیوە هەموو ئەو پارانە وەربگرێتەوە کە نوسەرەکان قەرزارین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەزعی باشە و هیچ گرفتێکی نیە. بەدەرلەوانەش بەلامەوە ئەوە شتێک نیە کە من و تۆ نیگەرانی ببین _تەنانەت خوێنەرەکانیش پێویست ناکات نیگەرانی ببن»

ڕقم لەوەبوو کە نەمدەتوانی شتێکی باشتر بدۆزمەوە و بیڵێم. دەتوت دەممیان پڕکردووە لە لم.

"لویجی" تاماشای ناوچاوی کردم و وتی؛ «پیتەر، بەبڕوای تۆ نیازی چیان هەیە؟ هەروەک بیرۆکەیەکی سەرەکی ڕۆمانێک بیری لێبکەرەوە. فەنتاسیات بەکاربهێنە»

منیش وتم؛ «بێگومان نیازیان وایە بیکوژن»

سەرێکی بۆ لەقاندم و وتی؛ «کەسێک بەکرێ دەگرن بۆ ئەوەی بیکوژێت. ئەوەش لەم وڵاتەدا شتێکی هێندە سەخت نیە»

دەمێکبوو بتڵی شەرابە سپیەکەیان لەسەر مێزەکە دانابوو و هەر تائەو کاتە من لە نیوەی زیاترێکم خواردبووەوە. ئەوجا وتم؛ «پێت وانیە "جاڵجاڵۆکە"کە ئەو شتانەشی لێکدابێتەوە؟»





"لویجی" وتی؛ «بێگومان. من زۆر دڵنیام لەوە. هەر بیر لە هەموو ئەو بیرۆکە نایابانە بکەرەوە کە ئەو دایڕشتوون. بۆ نمونە ڕێیتێدەچێت کامێرا و میکرۆفۆنی شاراوەی بەکارهێنابێت، ئەگەریش بمرێت ئەوا هەموو جیهان ڕاستیەکەیان بۆ دەردەکەوێت و کتومت دەزانن چ ڕۆمانێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو. هەموو تاکە ڕستەیەک کە ئەو نوسیویەتی دەخرێتە بەرچاوی خەڵکی و بڵاودەکرێتەوە، لەوانەیە بخرێتە سەر ئینتەرنێتیش، ئەوساکەش چەندەها نوسەر لەشەرما دەبنە دڵۆپێک ئاو و بەناخی عەردا دەچن. لەوەدەچێت هەر بەهۆی ئەوەوەبووبێت کە توانیویەتی ئەو هەموو ساڵە بەردەوامبێت، چونکە بنچینەی چالاکیەکانی لەسەر ڕێزی نوسەرەکان هەڵچنیوە. بەڕاست... لەو لایەنەوە ئەنجامی باشی بەدەست هێناوە، نابێت ئەوەمان لەبیربچێت. بەڕاستی ئەگەر جاڵجاڵۆکە"کە بڕوات بیری دەکەین، بەتایبەتیش ئێمەی بەڕێوەبەر و سەرنوسەر»

لەوێدا بەڕاستی پێکەنیم و وتم؛ «ئەرێ ئەوە ئێمە باسی چی دەکەین؟ بەڕاستی تۆ لەو بڕوایەدایت خەڵکانێک هەبن کە ئامادەبن کەسێک بکوژن _ئینجا دوایش "لەشەرما بەناخی زەویدا بچن"؟»

«نەء، پیتەر! نائومێدت کردم. بێگومان پێویست ناکات "جاڵجاڵۆکە"کە لەوانە بترسێت کە شەرم لە خۆیان دەکەن، ئەو هێشتام ئەوانەی لەدەستدایە»

یەکسەر تێگەیشتم. پێمناخۆشبوو کەسێکی تر وەک شتێکی نائومێد بمبینێت. ڕێک لەوێدا ویستم هەڵەکەم ڕاستبکەمەوە و وتم؛

«تۆ ڕاست دەکەیت. بێگومان "جاڵجاڵۆکە"کە دەبێت ئاگای لە بێشەرمەکان بێت. بەناوبانگبوونی شەرمیش بازاڕی خۆی هەیە و بازاڕێکیشە کە تابێت گەورەتر و گەورەتر دەبێت. لەکاتی گەنجیمدا





به هیچ شێوەیەک بوونی نەبوو، بەڵام هەر سەردەمە و شتی خۆی هەیە. تەنانەت یابانیەکانیش دەستیان لە "هاراکیری"[38] هەڵگرتووە. بەلای منەوە ئەوە مایەی شەرمەزاریە. شتێکی سوکە کە تابێت خەڵکانێکی زیاتر و زۆرتر چێژ لە شەرم دەبینن. بێشەرمی ستونێکی دیاریکراوی رۆژنامەکانیان پێدەبەخشێ و هێندەی تر بەناوبانگیان دەگات. تۆ ڕاست دەکەیت "لویجی"، باشی بۆ چوویت»

بەسەرنجەوە سەری بۆ لەقاندم و وتی؛ «هەتاهەتایە نوسەراکان قەرزارباری ئەون و ڕەنگە لەسەدا دە یان بیستی داهاتیان بۆ ئەو بڕوات. لەڕاستیدا ئەوانیش هیچ شتێکی نایاساییان نەکردووە، ئەوەش شتێکە کە دەبێت لەیادت بێت. زیندانی ناکرێن لەبەرئەوەی کە بیرۆکەی ڕۆمانیان وەرگرتووە، بەڵام لەگەڵ پیربوونیاندا پیسکەتر و بەرچاوتەنگتر دەبن، بەوشێوەیەش "جاڵجاڵۆکە"کە ناتوانێت ئەو پارانە وەربگرێتەوە کە کەوتۆتە لای نوسەرەکان. یان پێتوایە بۆ هەتاهەتایە بیەوێت میراتی وەربگرێت، پیتەر؟ بەبڕوای تۆ ئەو بیری لەو لایەنە کردۆتەوە؟»

«نەء». هەڵەیەکی گەورەم کرد، شەرمم دەکرد. لەیادم چوو کاریگەری "بێشەرمەکان" پێشوەخت بەباشی هەڵبسەنگێنم.

ئیدی وتم؛ «بەڵام هێشتام هەر بوارێکی تری لەبەردەستدایە. دەتوانێت پەیامێکیان بۆ بنێرێت و پێیان ڕابگەیەنێت کە دەستبەرداری ئەو پارانە دەبێت کە نوسەرەکان قەرزارینی. بەو

[38] خۆ کوشتنێکی باوبوو لە یاباندا و بەو مەبەستەش دەیانکرد کە شەرەف بەدەست بهێننەوە.





شێوەیەش مەترسیەکەیان دەڕەوێتەوە، هیچ مەترسیەک نامێنێت نوسەرەکان هیچ هۆیەکی وایان نابێت کە بیکوژن»

شانێکی بۆ هەڵتەکاندم. نازانم خەندەیەک کەوتە سەر لێوانی یان نا؟ ئینجا وتی؛ «لەوە دەترسم تازە درەنگ بێت بۆ ئەوە، چونکە بەپێی ورتەورتەکان هەر لەئێستاوە پلانێکیان داناوە کە لولی بکەن»

لولی بکەن، لولی بکەن! یەکسەر سەردەمی منداڵیم بیرکەوتەوە و ئەو هەموو جارانەم هاتەوە بەرچاو کە بەمنداڵی یەخەیان دەگرتم، هەموو ئەو جارانەم بیرکەوتەوە کە لێیاندەدام، ئەوجارەم هاتەوەیاد کە "ڕاگنار" سەری هەڵتەقاندم و دواتر بەدوانزە تەقەڵ لەبەشی فریاگوزاریدا بۆیان دوریمەوە.

تەماشایەکی پانتایی بەردەم کڵێسە دێرینەکەم کرد و یەکسەر پیاوە یەک مەتریەکەم بینی، کڵاوە لبادەکەی لەسەردابوو و گۆچانەکەشی بەدەستەوەبوو. ئەو "هۆمۆنکولوس"ە[39] بچکۆلەیە لەمسەرەوە بۆ ئەو سەری دوکانی پیتزەریەکە هاتوچۆی دەکرد و گۆچانە حەیزەرانەکەی دەکێشا بەو کەسانەدا کە دەڕۆیشتنە دەرەوە، هەروەک ئەوەی شمشێرێکی تیژی پێبێت، بەڵام کەس هەستی پێنەدەکرد. لەدڵی خۆمدا وتم "بەڕاستی هەقە تۆزێک بە خۆیدا بێتەوە. خەریکبوو خۆی لەبەرچاوی خۆیدا دەبووە گاڵتەجاڕ".

لەوەدەچوو "لویجی" بیەوێت بابەتەکە بگۆڕێت، چونکە لەپڕێکدا پرسی؛ «هیچ شتێک دەربارەی ڕۆمانێک دەزانیت کە ناوی "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە" یە؟»

[39] 'Homunculus' مرۆڤێکی دەستکردە کە کیمیاگەرە دێرینەکانی سەدەی ناوەڕاست لەو بڕوایەدابوون بیخوڵقێنن،و





قسەکەی دایچڵەکاندم. ئەویش زۆر بە ئاشکرا هەستیپێکردم. ئەوە ڕۆمانە پۆلیسیەکەی "ڕۆبێرت"بوو. کتێبەکەی ئەو دوو ساڵێک لەمەوبەر لە ئۆسلۆدا دەرچوو.
وتم؛ «ڕۆمانێکی نەرویجی بەو ناونیشانەوەوە هەیە. بەڵام پێموانیە هێندە بهێنێت کە لێرەدا باسوخواسی لەسەربکەین، "لویجی"»
تاڕادەیەک بەبێزاریەوە پێکەنینێک هاتە سەر لێوانی و وتی؛ «من ئاگام لەو کتێبە نەرویجیە هەیە، ئەوەش هۆیەکە لەو هۆیانەی کە پاڵمپێوەدەنێت قسەت لەگەڵدا بکەم. بەڵام من مەبەستم لە ڕۆمانێکی ئەڵمانیە کە لەم دواییەدا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئیتاڵی. بەڕێوەبەری دەزگای چاپە ئیتاڵیەکە وتی هەر زۆر سەرمسوڕما کە یەک دوو ڕۆژ لەمەوبەر بیستم کە ڕێک هەمان چیرۆک بڕبڕەی ڕۆمانێکی نەرویجیە و لە هەمان ئەو ساڵەدا دەرچووە کە ڕۆمانە ئەڵمانیەکە بڵاوکراوەتەوە. بەپێی قسەکان هەردوو چیرۆکەکە هێندە لەیەک نزیکن کە هیچ بوارێکی ڕێکەوت لەئارادا نیە»
هەستمکرد هەردوو ڕومەتم گەرمداهاتن. دیسانەوە ماریا دەرکەوتەوە. هەوڵمدا دەستە لەرزۆکەکانم لە "لویجی" بشارمەوە.
زۆر بەباشی لەیادمە کە من و ماریا زۆر کەڕەت لەو کاتەدا کە نیازمانبوو منداڵ دروستبکەین، لە ژوری خانەی قوتابیانەکەی ئەودا پێکەوەبووین. لە چێشتخانە هاوبەشەکەی ڕاڕەوەکەدا هێلکە و توێژاڵە گۆشتی بەرازمان سوردەکردەوە و دواتریش دیسانەوە بەرەو ژورەکەی ئەو خلدەبووینەوە و لەسەر قەنەفەی خەوەکەی پاڵدەکەوتینەوە. ئا لەوێدابوو کە چیرۆکی "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە"م بۆ ماریا گێڕایەوە. ڕێک لەوێدا چیرۆکەکەم داهێنا، ڕێک لەو کاتەدابوو کە چیرۆکەکەم بۆهات، ئەو کاتەش کە گەڕامەوە





ماڵەوە چەند خاڵێکی سەرەکی چیرۆکەکەم نوسیەوە و ئیدی چیتر بیرم لێنەکردەوە هەتاوەکو ئەو کاتەی پاش چەندەها ساڵ "ڕۆبێرت"م بینی و خستمەبەردەمی، هەڵبەتە جەوێکی "فلامیش"یم بە چیرۆکەکە بەخشی، چونکە دایکی ڕۆبێرت خەڵکی ئەوێ بوو.
پرسیارێکم لێکرد و وتم؛ «ئەی باشە نوسەرە ئەڵمانیەکە ناوی چیە؟»
"لویجی" لەوەڵامدا وتی؛ «ناوی "ویتمان"ە، "ویلیامین ویتمان"»
ئەوکاتە سیگارە بچکۆلەکەی کوژاندبۆوە، تەماشایەکی ئەملاولای پیتزەریەکەی "ماگیۆری" کرد و وتی؛ «لەوەدەچێت "جاڵجاڵۆکە"کە لەم دواییەی پیربوونیدا کەمێک یادوەری لاوازبووبێت»
ئەو نەیدەزانی ئەو قسەیەی چەندە ئازاریدام. من هەمیشە زیاد لەڕادە وریابووم کە هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان دوو چیرۆکی وەک یەک دەرنەکەون. تەنها کەسێک کە بەشێوەیەکی تایبەتی مایەی متمانەم بوو "ماریا"بوو، بەڵام ئەوە نزیکەی سی ساڵ لەمەوبەربوو، زۆر پێش ئەو کاتەبوو کە "یاریدەدەری نوسەر" بوونی هەبێت. 26 ساڵبوو هیچ هەواڵێکی یەکتریمان نەبیستوو، بەڵام وا لەناکاودا دەنگێکی هات. بێگومان ناچاربووم یەکسەر پەیوەندی پێوەبگرم. تازە شتەکان ڕویاندابوو و هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو. بەڵام لەپڕێکدا شتێکم بەخەیاڵدا هات کە هەرگیز لەوەوپێش بیرم لێنەکردبۆوە؛ من کاتی خۆی قەت لە ماریام نەپرسی "باوکت ناوی چیە؟". لەوانەیە وەک شتێکی سەیروسەمەرە بێتە بەرگوێ، بەڵام ئێ خۆ ئێمە تەنها چەند مانگێک یەکتریمان ناسی، وە لە حەفتاکانیشدا شتێکی ئاسایی نەبوو کە باسی ناوی باوک بێتە پێشەوە. لەسەر دەرگای ژورەکەی لە خانەی قوتابیانی "کرینگشۆ"دا پارچە کاشیەکی چینی هەڵواسیبوو و بەپیتی سوری گەورە ناوی "ماریا"ی لەسەر نوسیبوو و تەواو. هەر ئەو کاتەش





کە باسی منداڵبوون هاتە ئاراوە، ئیتر بەئانقەست نەیدەویست ناونیشانی خۆی و ناوی باوکی بزانم. لەلایەکی تریشەوە من هەر تەنها قسەکانی ماریام لەبەردەستدابوو کە وتی کارێکم لە مۆزەخانەیەکی سویددا دۆزیوەتەوە. لەدڵی خۆمدا وتم بێگومان هەروەک دەڵێن جیهان بچوکە، بەڵام تەنانەت کایەنێکیش گەورەیە ئەگەر بتەوێت لەناویدا بەدوای دەرزیەکی ژەنگاویدا بگەڕێیت.

دواتر وتم؛ «ئێ باشە، کەواتە کاتێکی خۆش چاوەڕوانمانە، بابزانین چی ڕوودەدات. من "جاڵجاڵۆکە"کە نیم. بەڵام بێگومان چاومدەکەمەوە و لەمەودوا بەئاگادەبم. هەر ئەوەندەی شتێکم بیست، یەکسەر...»

قسەکەی پێبڕیم و وتی؛ «وایە، وایە، پیتەر... زۆر باشە»

وەک کەسێکی بێئەقڵ خۆمم دەبینی. هیلاک و ماندوو بووم. من لەو کاتەوەی کە دایکم مرد بەردەوام هیلاکبووم.

تەماشایەکم کرد و وتم؛ «"لویجی" من چی بکەم؟»

لەوەڵامدا وتی؛ «دورکەوەرەوە لە "بۆلۆگنا"، باشتریشە هەتا زووە بۆی دەربچیت»

بەخەندەیەکەوە ئەو قسانەی کرد، بەڵام خەندەکەی دوو لایەنەبوو.

پێکەنیم و وتم؛ «وابزانم ڕۆمانی پۆلیسی زۆرت خوێندۆتەوە»

زیاترێک خەندە کەوتە سەرلێوەکانی. "لویجی" هەمیشە کەسێکی قۆشمەباز و پرلەنوکتەبوو. لەدڵی خۆمدا وتم "بڵێیت باسی کوشتنم فرت و فێڵ نەبێت".

ڕەنگە هەموو بابەتەکە تەنها ئەوەندە بێت کە "کریستینا" و "لویجی" مەزەنەیان کردبێت کە من "جاڵجاڵۆکە"کە بم، ئێستاکەش "لویجی" بەرامبەرم دانیشتووە و هەروا بۆ خۆشی پێمرادەبوێرێت. لەوەیە ناوی کتێبی "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە"ی لە بەرێوەبەری



دەزگایەکی چاپی نەرویجیەوە بیستبێت، ئەو هەمیشە مافی کرینەوەی کتێبی دەکرێ، ئیدی لەوێدا سەری لەوە سوڕماوە کە هەمان چیرۆک لەلایەن دوو نوسەری جیاوازەوە دوو کەڕەت نوسراوەتەوە. بەدڵنیایشەوە نەمدەزانی کە وتارێک لە "کۆریرێ دیللا سیرا"دا نوسراوە.

لویجی وتی؛ «لەوانەیە پێویستت بە پارێزگاریکردنیش هەبێت»

لەدڵی خۆمدا وتم "پارێزگاری". ئەو بیرکردنەوەیە بەلامەوە شتێکی نوێبوو، وەک شتێکی ناخۆشیش دەمبینی.

لەوێدا زیاترێک هەستمکرد کە بێئەقڵم. ئەوە یەکەمین کەڕەتبوو کە فەنتاسیام لێ ببڕێت. فشارەکەی دەرەوەم قورساییەکی سەختی خستبووە سەر ئەو فشارەی کە لەناوەمەوە دەهات. بەڕاستی هیچ وشەیەکم بۆ نەدەدۆزرایەوە کە بیڵێم. زیرەکترین شت کە بەخەیاڵمدا هات ئەوەبوو کە پێبکەنم. هەرزۆر خراپبوو. بەلایەنی کەمەوە شتێکی وانەبوو کە شانازی پێوەبکەم.

"لویجی" وتی؛ «ئەوە شتێکی وانیە کە پێی پێبکەنیت»

زۆر تورەبووم. تورەبووم چونکە نەمدەزانی بەڕاستیەتی یان هەڵمدەخڵەتێنێت. بەپەلە هەستامە سەرپێ، پارەی شەرابە سپیەکەم لەسەر مێزەکە دانا.

پرسیارێکی کرد و وتی؛ «لە ئوتێلی "باگلیۆنی" دابەزیویت؟»

وەڵامم نەدایەوە.

«ئەی بۆ کوێ ئەڕۆیت؟»

دیسانەوە وەڵامم نەدایەوە و ئیدی پەنجەی دۆشاومژەی بەرزکردەوە و وتی؛ «کەمێک ئاگات لە ئافرەت بێت»

«مەبەستت چیە؟»





«دەڵێن کەمێک بەرامبەر ئافرەت شلیت. وابزانم ئەوە تەنها خاڵی لاوازیتە، وانیە»

هەستم نەکرد کە زۆر بەڕاستی چاوەڕوانی وەڵامم بێت، لەبەرئەوە وەڵامم نەدایەوە. ئەویش بەلایەوە ئاسایی بوو. "لویجی" پیاوێکی بێئەقڵ نەبوو. هەر ئەوە ماوە دوو پیاوی وەک من و ئەو لە قاوەخانەیەکدا دانیشین و باسی ئەوە بکەین لەگەڵ ئافرەتاندا چۆنی دەگوزەرێنین؟ هەر بەڕاستی شتێکی وانەبوو کە بێتە ناو ناوانەوە، بەڵکو باسێکبوو کە تەنها سەرودڵی دەگرتین و هیچی تر.

ئیدی وتی؛ «ڕەنگە کەسێکت بۆ بنێرن کە فریوت بدات. بۆ نمونە برادەرێکی ئافرەتی کۆنت»

مرخەمرخێکم بۆ کرد و وتم؛ «وابزانم ڕۆمانی سیخوڕی زۆر دەخوێنیتەوە»، ویستم دیسانەوە پێبکەنمەوە. خۆزگە بمزانییایە بە چ شێوەیەک بیگرم!

کارتەکەی خۆی دامێ و وتی؛ «ئەمە ژمارەی تەلەفونکەی منە»

کارتەکەم لێوەرگرت و خوێندمەوە. من هەمیشە دەمتوانی ژمارەیەک یەک بەدوای یەکدا لەبەربکەم. ئینجا کارتەکەم لەتوپەتکرد و فرێمدایە ناو تەپڵەکی جگەرەکەوە. تەماشای ناو چاویم کرد، چونکە دەمزانی ئیدی ڕەنگە هەتاهەتایە نەیبینمەوە.

وتم «سوپاس» و ئیتر ڕۆیشتم. هەر زوو ڕوم وەرچەرخاند، چونکە هەستمکرد فرمێسکێک خەریکە لەپێڵوی چاومەوە دەخزێتە خوارەوە. ئەو هەڕەشە و گوڕەشانە نەیهەژاندم کە نیازیانە پێکەوە بەنهێنی شتێکم لێبکەن، چونکە لەناوەوەمدا لەو بڕوایەدابووم کە "لویجی" تفەنگ بەتاریکیەوە بنێت. بێگومان هێشتام چاوەڕوانی ئەوەیە





پاشنیوەڕۆی سبەینێ پێکەوە لە پێشانگای کتێبەکەدا پەرداخێک شەراب پێکەوە بخۆینەوە. بەڵام من دەمزانی کە "یاریدەدرەی نوسەر" شتێکە کە کاتی بەسەرچووە. من ئەو حاڵەتەم وەک سەربەستبوونێک نەدەبینی، بەڵکو وەک شتێک دەهاتە بەرچاوم کە بەزۆر بیسەپێنن بەسەرما.

بەرەوڕوی ئوتێلەکە هەنگاومنا و هەستمدەکرد چیتر لەسەر ئەم دونیایەدا ناژیم. لەوانەیە هەڵەکە لەوەدا بوویێت کە من هەرگیز لەسەر ئەم دونیایە نەبووبوم. من لە بێهودەیدا ژیابووم، هەموو ژیانم لە بێهودەییدا بەسەربردبوو. من مێشکێک بووم کە لەدەرەوەی هەموو شتێکدا چالاکبووم. هەمیشە تەنها دوو شت بوونی هەبوو؛ جیهان و مێشکم، مێشکم و جیهان.

من برێکی فەنتاسیای زیاترم هەبوو وەک لەوەی جیهان پێویستی بوو. من قەت ژیانێکی ڕاستەقینە نەژیابووم، من باجمدەدا بۆئەوەی ژیانێکی ڕاستەقینە بژیم. نەمدەزانی کێ سزامدەدات، دایکم بوو، یان ماریا، یان خۆم.

*

تەنها چەند کاتژمێرێکی کەم خەوتم و سەر لەبەیانییەکی زوی ڕۆژی دواتر خۆم گەیاندە هۆڵی گەورەی ئوتێلەکە. لەدەرەوە "ڤیا ئیندیپێندێنزا" ئارام دەهاتە بەرچاو، بەڵام لەو کاتەدا کە پارەی ئوتێلەکەم دا، هەستمکرد پیاوێکی گەنج چاودێریم دەکات. لەسەر کورسیەک دانیشتبوو و کەم تازۆر خۆی لەپشت ڕۆژنامەیەکەوە شاردبۆوە. سەختبوو بزانم کە تازە لە خەو هەستاوە یان هێشتام



نەچۆتە جێگاوە. ئەو کاتەش کە ڕۆیشتمە دەرەوە و سواری تەکسیەک بووم، هەر بەدوامەوە بوو. فریا نەکەوتم بزانم ئەویش سواری ماشێنێک دەبێت یان نا، بەڵام پێموایە دواتر سیمای هەمان پیاوم لە فرۆکەخانەکە بینیەوە. مایکرۆفۆنی تەلەفونێکی مۆبایلی لە گوێچکەدابوو و داشی نەپۆشیبوو. وابزانم من لەپێش ئەودا بۆردین کارتێکم پەیداکرد.

ئەو کاتەی کە گەیشتمە ناو هۆڵی بەردەم فرۆکەکە، خەڵکی وردە وردە چووبوونە ناو فرۆکەکەوە و پاش چەند خولەکێکی کەم هەمووان لەناو فرۆکەکەدابووین و بەرزبووەوە. من لەسەر کورسی ژمارە "A1" دانیشتبووم، وە بەتایبەتی داوای ئەو شوێنەم کردبوو. زۆرم پێخۆشبوو بەلای ڕاستمدا تەماشای دەرەوەبکەم. من بەرەو "ناپۆلی" دەرۆیشتم، ئەو بەیانیە یەکەمین فرۆکە لە "بۆلۆگنا"وە بەرەو ئەوێ دەرۆیشت. بیست خولەک لەدوای ئەو فرۆکەیەکی تر بەرەو "فرانکفۆرت" هەڵدەسا و دواتریش بەرەو ئۆسلۆ دەرۆیشت.

هەرئەوەندەی کە فرۆکەکە گەیشتە ئاستی بەرزی خۆی، کورسیەکەم بۆ دواوە لارکردەوە و وەک چاوەڕوانبووم هێمنیەک باڵی بەسەرما کێشا. پاش نەختێک چیرۆکێکی سەردەمی منداڵیم بیرکەوتەوە. یادوەریەکی ڕاستەقینە بوو، بەڵام لەسەردەمی منداڵیمەوە بیرم لێنەکردبۆوە. کات چەندە خێرا ڕۆیشت، من ئەو کاتە ڕێک تەمەنم بەقەد تەمەنی ئەو کاتەی دایکم بوو کە مرد. چیرۆکەکە بەم شێوەیە بوو؛

من هەر لەتەمەنی چوار ساڵیەوە فێری خوێندنەوە و نوسین بووم. دایکم فێری نەکردم، چونکە پێیوابوو دەبێت چاوەڕوانبم هەتاوەکو دەچمە قوتابخانە. من خۆم خۆمم فێری خوێندنەوەکرد، وابزانم لەسەر







ڕەفەی کتێبەکاندا خۆم کتێبێکی "ئەلف و بێ"م دۆزیەوە. هیچ بەلاشمەوە سەخت نەبوو کە 29 پیت بناسمەوە.

کەرەتێکیان بەتەنها لەماڵەوە بووم، قەڵەمێکی سورم بەدەستمەوە گرت و خۆمگەیاندە ژوری نوستنەکەی دایکم. دوو پەنجەرەی گەورە بەدیوارێکی ژورەکەوە بوو و لەوێوە دیمەنێکی جوانی شار دیاربوو، پەردەی مۆریشان پێوەبوو. بەدرێژایی دیوارێکی تریش کەنتۆری سپی جلی لێدانرابوو و دوو دیوارەکەی تریش تەنها کاغەزی سپی پێوەبوو. وەک شتێکی وشک و ناخۆش دەهاتە بەرچاوم. وابزانم دڵم بەدایکم دەسوتا. من خۆم لەژورەکەمدا وێنەیەکی "ئاندەرسی مراوی"م بەدیوارەکەدا هەڵواسیبوو.

چیرۆکێکی "خۆش"م لە مێشکمدا هۆنیبووەوە، چیرۆکێک کە چەندەها ڕۆژبوو خەریکی بووم و هیچیشم لەلای دایکم نەدرکاندبوو. من دەمویست بۆی بکەمە شتێکی چاوەڕوان نەکراوی خۆش. بەقەڵەمە سورەکەم لەسەر دیوارە سپیەکە دەستمکرد بە نوسین. لەپێشدا ناچاربووم لەسەر کورسیەک بوەستم، چونکە پێویستم بە هەموو دیوارەکە بوو، پێویستم بە هەردوو دیوارەکەبوو. پاش دوو سەعات لێبوومەوە و لەسەر جێگای خەوەکەی دایکم پاڵکەوتم، هەموو چیرۆکە دورودرێژەکەی سەر دیوارەکەم خوێندەوە. شانازیم بە خۆمەوە دەکرد، چونکە بەبڕوای من لەوەبەدواوە هەموو شەوێک بەرلەوەی دایکم بخەوێت، دەیتوانی ئەو چیرۆکە خۆشەی من بخوێنێتەوە. من دەمزانی کە حەزی لەو حەکایەتە دەبێت، لەبەرئەوەی چیرۆکێکی جوانبوو، لەدڵی خۆمدا دەموت لەوانەیە زیاترێکیش حەزی لێبێت، چونکە بەتایبەتی بۆ ئەوم نوسیبوو. ئەگەر حەکایەتێکم بۆ خۆم بهۆنیبایەتەوە، ئەوا شتێکی تەواو جیاواز دەردەچوو، خۆ ئەگەر





چیرۆکێکم بۆ باوکیشم ئامادەبکردایە، ئەوا ئەوکاتەش شتێکی جیاواز دەردەچوو. بەڵام ئەو کاتە باوکم چیتر لەگەڵماندا نەدەژیا، من تەمەنم سێ ساڵبوو کە ماڵەکەمانی جێهێشت.
بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر جێگاکەی دایکم پاڵکەوتم و چاوەڕوانی دایکم بووم. زۆرم پێخۆشبوو بێتەوە ماڵەوە و پڕبووم لە چاوەڕوانی. من زوو زوو شتی بچکۆلەی چاوەڕوان نەکراوم پێشکەشدەکرد، بەڵام ئەو یەکەیان شتێکی گەورەبوو.
لەسەر کورسی ناو فرۆکەکەدا کە بەرەو "ناپۆلی" دەڕۆیشتم، لەپڕێکدا دەنگی دایکمم بیرکەوتەوە کە ئەو پاشنیوەڕۆ تایبەتیە دەرگاکەی کردەوە و هاتە ناو دالانەکەوە. هاوارم کرد و وتم؛ «لێرەدام! من لێرەدام»
توڕەبوو. زۆر زۆر توڕەبوو. هەر بەرلەوەی ئەو شتانە بخوێنێتەوە کە من لەسەر دیوارەکە نوسیبووم، ئاگری دەکردەوە. لەسەر جێگای خەوەکەی بەرزیکردمەوە و فڕێیدامە سەر عەرزەکە، زۆر بەقایمی زللەی لەهەردوو ڕومەتم دا، دوای ئەوەش بەڕاڕەوەکەدا ڕایکێشام، خزاندمیە ناو گەرماوەکەوە و دەرگاکەی بەکلیل لەسەر داخستم. نەگریام. هیچ وشەیەکیش لە دەمم نەهاتە دەرەوە. گوێم لێبوو دایکم تەلەفونی بۆ باوکم کرد، گوێملێبوو لێی توڕەبوو و وتی هەر ئەبێت بێیت و کاغەزی نوێ لەدیوارەکە بدەیت. پاش چەند ڕۆژێک هات و قسەکەی دایکمی بەجێهێنا. بۆنی سیکۆتین بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک لە ئەپارتمانەکەدا نەدەڕۆیشت. مایەی شەرمبوو.
پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا دایکم دەرگای گەرماوەکەی لێکردمەوە. نانی ئێوارەی خوارد، قاوەشی خواردەوە و گوێی بۆ بەشی یەکەم و دوهەمی ئۆپێرای "لا بۆهێمە"ش شلکرد، ئەوجا دەرگاکەی لێکردمەوە و





وتی "بڕۆ بخەوە". ڕێک بەقسەمکرد، بەڵام هیچ وشەیەکم نەوت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک قسەم لەگەڵ دایکمدا نەکرد، بەڵام هەموو ئەو شتانەم دەکرد کە پێی دەوتم. تا لەدواجاردا لێمپاڕایەوە و داوای لێکردم دیسانەوە بکەومەوە قسە. منیش وتم "ئیتر قەت هیچ شتێک لەسەر دیوار نانوسم"، زۆر بەجدیش وتم "ئیتر قەت لەسەر کاغەزیش شت نانوسم، تەنانەت لەسەر کاغەزی تەوالێتیش. من کەسێکی خۆگربووم و قسەی خۆمم دەبردەسەر، تاڕادەیەکیش ئەو پەیمانەم نەدەشکاند کە بەدایکمم دا. لەپاش ئەو ڕوداوەوە ڕێگەم بەدایکم نەدا هیچ شتێک لەو شتانە ببینێت کە دەمنوسین، نەمدەهێشت تەنانەت یەک پیتیش ببینێت. تەنانەت ئەرکی ماڵەوەی قوتابخانەشم پیشان نەدەدا. جارجارێک لەگەڵ مامۆستاکانمدا باسی ئەوەی دەکرد و ئەوانیش هیچ لاریەکیان لێ نەبوو. من زۆر بەڕێک وپێکی هەموو دەرسەکانم لەیادبوو و هیچ پێویستی نەدەکرد دایکم سەیری دەفتەری ماڵەوەم بکات. بێگومان دەبوایە هەرواش بوایە.
من نامەوێت بڵێم بەهۆی ئەو ڕوداوەوە نەبوومە نوسەر، بەڵام بەلایەنی کەمەوە بووە هۆی ئەوەی دەست لە وێنەکێشان هەڵگرم. من کەسێکم نەبوو وێنەکانمی نیشان بدەم، لەبەرئەوە هیچ خۆشیەکم لە وێنەکێشان نەدەبینی. تاڕادەیەک هێندەم دێتەوە یاد کە کەڕەتێکیان لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەر ڕۆژێک لەڕۆژان کتێبێکی وا بنوسم کە بەهەزاران دانەی لێ چاپبکرێت، ئەوا ئەوکاتەش دڵنیانابم لەوەی دایکم نوسینەکانم دەخوێنێتەوە یان نا. بەڵام من نەمدەویست بەو شێوەیە خۆم دەربخەم. من خۆم لە ژوری نوستنەکەی دایکمدا لەڕێگەی نوسینەکانی سەر دیوارەکەوە دەرخست و تەواو. نەمدەویست ئەو

بوارە بدەم بەدایکم کە هەروا بەئاسانی خۆی بکات بە کتێبخانەیەکدا و کتێبێک بکڕێت کە ناوی منی بەسەرەوە بێت.

نەمویست نانی بەیانی ناو فڕۆکەکە بخۆم، لەبری ئەوە هەوڵمدا کەمێک بخەوم، بەڵام هەرپاش یەک دوو خولەک داچڵەکیم و خەبەرمبووەوە. لەپەنجەرەکەوە تەماشایەکی زەویە تەختانیەکەی خوارەوەم کرد. من تەمەنم 48 ساڵ بوو، نیوەی ژیانم بەسەربردبوو، لەسەدا 75ی ژیانم بەسەربردبوو، ڕەنگە زیاتریک، لەوانەیە لەسەدا 99ی ژیانم ڕۆیشتبێت. ژیان لەڕادەبەدەر کورتە و کورتی ژیان بە وشە گوزارشتی لێناکرێت. ڕەنگە هەر لەبەرئەوە بووبێت کە نەمدەویست ناوم بخەمە سەر بەرگی کتێبێک. نرخ و گرنگی ئەو ڕوکەشکاریە تەنکەی کەلتور و شەرەف و ڕواڵەت پەرستی مرۆییە، لەچاو ئەو چیرۆکە مەزنەدا هەر هیچ نەبوو کە من بەپەلە پێیایدا دەڕۆیشتم. من ئەوەندە فێربووبووم کە ڕوم لە شتە ناگرنگەکان وەرچەرخێنم. هەر لەو کاتەوەی کە منداڵبووم ئاشنای مێژوویەکی تربووم و جیاوازبوو لەمێژووی گۆڤارە حەفتەییەکان و مێژووی کتێبە وەرزیەکان. کە منداڵ بووم لەگەڵ باوکمدا تۆپەڵێک زەرەکم بینی کە تەمەنی چەندەها ملیۆن ساڵبوو، لەناو ئەو تۆپەڵەدا جاڵجاڵۆکەیەکی تیابوو کە ڕێک هاوتەمەنی زەرەکەکە بوو. من پێش چوار ملیارد ساڵ لەمەوبەر لەسەر زەوییووم، ئەو کاتە هێشتام ژیان لەسەر زەویدا سەریهەڵنەدابوو، زۆر بەباشیش دەمزانی کە پاش ماوەیەکە کەم خۆر دەبێتە شتێکی سوری یەکجار گەورە، بەڵام پێش ئەوە زەوی وشک دەبێتەوە و دەبێتە ئەستێرەیەکی بێگیان. گەر کەسێکی ئاوهابیت، ناچیت خولێکی وێنەکێشان ببینیت بۆ ئەوەی فێری نەخشاندنی وێنەی گوڵ ببیت. ئەوکاتە خاوەنی مێشکێکی ئارام نابیت بۆ ئەو کارە.





نەدەشچیت "خولێکی فێربوونی نوسین" بخوێنیت. بەسەر قاوەخانەکاندا ناخولێیتەوە و بەخەڵکی بڵێیت "خەریکی نوسینی شتێکم". ڕەنگە خەڵکی شت بنوسن، ئەوەش هیچ شتێکی هەڵەی تێدا نیە، بەڵام "نوسین" شتێک نیە کە بەتۆپزی ئەنجامبدرێت. ڕەنگە خەڵکی لەبەرئەوە شت بنوسن چونکە هەستدەکەن شتێکی گرنگیان پێیە، چونکە چەند وشەیەکی ئارامبەخشیان پێیە و دەخوازن بیگەیەننە خەڵکانی دی، بەڵام کەس لە گەلەهەسارەیەکی شێوە لولەکی وەک ڕێی کاکێشاندا لەسەر مێزێک دانانیشێت تەنها بۆئەوەی شتێک "ب"ن"و"س"ێ"ت" یان بۆ "ن"و"س"ی"ن" دانانیشێت. بەڵام شاعیرەکان بەلارولەنجە هەروەکو نیشاندانی جلی مۆدە دێنە سەر سەکۆی خۆنیشاندان؛ "خوشک و برایانی ئازیز وەرنە پێشەوە! بەخێربێت بۆ سەرجەمی کارەکانی ساڵانەی "کاپیناوەر" و "ویتچ". لێرەدا شتێکی هونەریمان هەیە و ڕێک بەلای ئێوەوە گرنگی خۆی هەیە. ئائەمە ڕۆمانێکی نایابی "ئەرمانی"یە و لەوبوارەدا بێوێنەیە. لێرەشدا نمونەی شیعرەکانی "سورکامپس" دەبینین ـبێگومان لەسەر چەند ئاستێکی شیعری جیاواز ڕیزکراون. فەرموون ناو و کاتەکانیش نوسراون".

ماندوو بووم. بەڵام ئیدی "یاریدەدەری نوسەر" کۆتایی پێهات، قۆناغێکی ئەدەبی بەسەرچوو. ئیتر لەمەودوا هەرگیز سەردانی ئەو پێشانگا گەورانەی کتێب ناکەم. بڕیارمدا کە هەوڵی ڕزگارکردنی ژیانم بدەم. کاتێک لە "ناپۆلی" نیشتینەوە، من یەکەمین کەسبووم کە لە فڕۆکەکەوە هاتمە دەرەوە. بەناو هۆڵی پێشوازی فڕۆکەخانەکەدا ڕامکرد، خۆم فڕێدایە ناو تەکسیەکە و داواملێکرد تا "ئامالفی"م





بەرێت. گومانم نەبوو کە کەم بۆی ڕێدەکەوێت نەفەرێک بۆ شوێنێکی ئاوها دور ببات.

من هەرگیز لەوەوپێش سەر قەراغ ئاوی "ئامالفی"م نەبینیبوو، بەڵام چەندەها جار بەدرێژایی ئەو ساڵانە خەڵکی پێیان دەوتم کە شوێنێکی خۆشە و ئەوە دەهێنێت چەند ڕۆژێک لەو شارە دڵفرێنەی سەر نیوەدورگەی "سۆرینتۆ"دا بەسەربەریت. مارییاش باسی "ئامالفی" بۆ کردم. ئەو کەرەتێکیان لەگەڵ کچێکی برادەریدا پشویەکی لەوێ بەسەربردبوو. "رۆبێرت"یش زوو زوو باسی سەفەرەکانی خواروی ئیتالیای بۆدەکردم _بەرلەوەی "وێنشە" بەجێی بهێڵێت.

بەلای "پۆمپای"دا ڕۆیشتین و دەمویست چەند ساتێکی کەمی بەرلە تەقینەوەی بورکانی ناوچەکە بهێنمە بەرچاوم، دەمویست وێنەی ئەو کاتەی خەڵکی شارەکە بهێنمە بەرچاوم. هەرکە وێنەیەکی ڕونیش دەهاتە بەرچاوم، هەوڵمدەدا سەرلەنوێ لەناوەوەمدا بیسڕمەوە. ئەو شتەی کە من بینیم، دەکرێت لە تەنها یەک وشەدا کۆبکرێتەوە؛ بێمانایی. ئەوجا گرمەیەک دێت. ئیدی تورەیی بورکانی "ڤیسوڤس" بەسەر هەموو بێمانایییەکاندا دادەبارێت.

بەسەر شاخەکاندا سەرکەوتین و دواتریش بەناو ڕەزی لیمۆکاندا بەرەو قەراغی دەریاکە چووینە خوارەوە، لەوێدا داوام لە شۆفێرەکە کرد کە بمگەیەنێتە ئوتێلی "لونا کۆنڤێنتۆ"، ئوتێلێک بوو کە من لەوەوپێش ناوبانگیم بیستبوو. نەمدەزانی ژوری بەتاڵیان هەیە یان نا، بەڵام هێشتام یەک حەفتەی تەواوی مابوو بۆ جەژنی پاک.

چەندەها ژوری بەتاڵیان هەبوو. داوای ژوری ژمارە 15م کرد و بەتاڵیش بوو. وتم حەفتەیەک دەمێنمەوە و پاش کەمێک لەپەنجەرەی ژورەکەوە تەماشای دەریام دەکرد. دوو پەنجەرەی گەورە لە ژورەکەدا





هەبوون، پیاوە یەک مەتریەکە لەسەر نوکی پەنجە لەبەردەم پەنجەرەکەی تردا وەستابوو و ئەویش تەماشای شەپۆلەکانی دەکرد. خۆر هێشتام لەخواروی ئاسماندا دەبینرا، کاتژمێر هێشتام نۆ و چارەک بوو.

لەسەر کورسیەک بۆی دانیشتم و خۆم بەسەر مێزێکی نوسینی کۆندا چەماندەوە. من دەمزانی کاتی خۆی "هێنریک ئیبسن" لەسەر ئەو مێزە دانیشتووە و شتی نوسیوە. ئەوەندەم بیستبوو کە ئەو ئوتێلە کاتی خۆی خانەی لانەوازان بووە و "ئیبسن" لە ژوری ژمارە 15 ژیاوە، لەبنەڕەتیشدا لەسەدەی 1300دا دێر بووە. "ئیبسن" ئالەم ژورەدا نوسینی کتێبی "خانویەکی بوکەشوشە"ی تەواوکرد و وێنەیەکی خۆشی بە ژورەکەدا هەڵواسرابوو.

خورپەیەک بەدڵما هات و هەستمەکرد منیش لە جۆرە خانویەکی بوکەشوشەدا گەورەبووم. دیسانەوە بیرم لەو شتە کردەوە کە هەمیشە دەمویست لەبیریبکەم، ئەو چیرۆکەش نەبوو کە لەسەر دیوارەکە بۆ دایکمم نوسی، بەڵام مۆتەکەیەک بوو کە شوێنێکی قوڵتری ناوەوەمی داگیرکردبوو. هەستمدەکرد ئەو تاریکاییە قوڵ و ساردەی ژێر ئەو توێژاڵە تەنکی بەفرە هەڕەشەم لێدەکات کە من لەسەریەوە سەمام دەکرد.

لەدڵی خۆمدا دەموت "ئالەم ژورەدا ئیبسن "نۆرا"ی فێری سەمای جاڵجاڵۆکە کرد، ئەو سەمایەی کە لەڕاستیدا سەمای مەرگبوو. ئەو کەسەی کە جاڵجاڵۆکەیەکی گەورە گازی لێدەگرت، دەیتوانی بۆ خۆی سەمای مردنی خۆی بکات. بێگومان لەچیرۆکەکەدا جاڵجاڵۆکەکە "کرۆستاد"ی پاریزەربوو، من هەرگیز لەوەوپێش بیرم لەوە نەکردبووەوە، بەڵام لەوێدا بەخەیاڵمدا هات. خۆم پێنەگیرا و



زەردەخەنەیەک کەوتە سەرلێوانم. من بە ڕێکەوت خۆم لە "ناپۆلی"دا بینیەوە. ئەگەر چارەنوس بوونی هەبێت، ئەوا شتێکی ئایرۆنیە.

تەماشایەکی شەپۆلەکانی خوارەوەم کرد و دیسانەوە سەیرێکی ئەملاولای ژورەکەم کردەوە. پیاوە یەک مەتریەکە بێئارامبوو و لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری خشتی کاشیەکانی سەر عەرزەکەدا هات و چۆی دەکرد. تەنها یەک کەرەت وەستا و وەک کەسێکی بەدەسەلات تەماشایکردم و وتی؛ «ئێ، ڕەنگە ئێستاکە کاتی ئەوەبێت کە دان بە گوناحەکانماندا بهێنین، وایە؟»

کۆمپیوتەرەکەم دەرهێنا، لەسەر مێزەکە دانیشتم و دەستمکرد بە نوسینەوەی چیرۆکی ژیانم.

## بییتا

دوو بتڵی بەتاڵی ویسکی لەبەردەم ئاگردانی سوچەکەدا دانراوە. نازانم بۆ خزمەتگوزاری ئوتێلەکە لای نەبردوون، بەڵام سبەینێ بەرلەوەی بڕۆمە خوارەوە و نانی بەیانی بخۆم، فڕێیان دەدەمە ناو تەنەکەی خۆڵی ژورەکەوە.

وا دە ڕۆژە ئێرە بۆتە ماڵی من و سێ ڕۆژە هیچ شتێکم نەنوسیوە. هیچی تر نەمابووەوە کە بینوسم. بەڵام ئێستاکە شتی ترم هەیە و دەمەوێت ئەوانیش بنوسم.







لەو کاتەوەی کە ماریا بەجێیهێشتم، بۆ یەکەمین جار ئافرەتێکم بینی کە دڵم بۆی لێبات و تەبابم لەگەڵیدا. کچێکی برادەرم پەیداکردووە و پێکەوە پیاسەی دوورودرێژ بەو ناوچە بەرزونزمانەی قەراغ دەریای "ئامالفی"دا دەکەین. جلوبەرگی گەنجانە دەپۆشی، ماکیسەکی هاوینەی زەرد لەبەردەکات و جوتێ سەرپایی سپی لەپێدەکات، پۆشاکێ دەپۆشێ کە زۆر بەڕاشکاوی و دڵخۆشیەوە بەو ناوچە بەرزەلاَنیانەدا هاتوچۆی پێوەدەکات. پڕە لە مەزاجی خۆش و سڵناکاتەوە لەوەی خۆی فڕێبداتە ناو دەریایەکی سارددەوە. ئەمڕۆ هەورەتریشقە و لێزمەی بارانێکی توند لەناکاودا سەرسامی کردین.

زۆر بیرم لە ئامۆژگاریەکەی "لویجی" کردەوە، بەڵام لەوبڕوایەدا نیم "بییتا" فریوم بدات. ئێمە هەر لەئێستاوە زۆر نزیک بووینەتەوە لەیەکتری. ئەگەر وەک کەسێکیش ناردبێتیان بۆ "ئامالفی" کە فریوم بدات، ئەوا دەبێت لەڕێگادا پەشیمان بووبێتەوە و ڕای خۆی گۆڕیبێت.

تائێستاکە هیچ پیاوێکم لەو ناوەدا نەبینیوە کە مایکرۆفۆنی لە گوێچکەدابێت، وە دوو کەرەتیش لەسەر "ڤالا دای مولینی" بووین و تەنانەت یەک کەسیشمان بەدی نەکرد.

گومانم نیە کە "بییتا"ش نهێنیەکی لەناوەوەدا حەشارداوە. ئەم ئێوارەیە کاتێک لە دێی "پۆگیرۆلا"وە هاتینە خوارەوە، زۆر سەیر دەهاتە بەرچاوم. لەناکاودا ترسی لێنیشت و بەدەم کوڵپی گریانەوە وتی "با ئیتر یەکتری نەبینینەوە".

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وامانداناوە سەرلەبەیانی زوو بچینە سەر شاخی "ڕاڤیلۆ". هیچ پیاوێکی تر لە ژیانی "بییتا"دا نیە، لەبەرئەوە دەمەوێت پرسیاری لێبکەم و بزانم لەگەڵما دێت بۆ شوێنێکی ئۆقیانوسی ئارام یان نا. ناچاردەبم باسی "یاریدەدەری نوسەر"ی بۆ



بکەم و هەر لە ئێستاشەوە دوو چیرۆکم بۆ گێڕاوەتەوە. ئێستاکە چیتر پێویست ناکات دەست بەسەر خۆمدا رابگرم، هەموو بیرۆکەکانم سەربەستکردوون و پاشگەست بوومەتەوە لەوەی کە هی منن.

پاش ماوەیەکی کەم هەموو ئەو نوسینانەم پیشانی "بییتا" دەدەم کەلە ماوەی ئەو چەند رۆژەی پێشوودا نوسیومن. پێموانیە چیرۆکی ئافرەتەکانی ژیانم سەری بسوڕمێنێت، رەنگە پڕبەدڵ پێی پێبکەنێت. من پێخۆشحاڵ دەبم گەر لەدوای ئەو هەموو فرمێسکانەی ئێوارە هەڵیڕشتن پێبکەنێت. بێگومان ئەویش بەشی خۆی ژیانی دیووە، من تائێستاکە پرسیاری رابوردوویم لێ نەکردووە، بەڵام ئەوە هیچ گرنگیەکی نیە، بەلایەنی کەمەوە بەلای ئێمەوە هیچ رۆڵێک نابینێت. ئەو نازانێت کە من زۆر دەوڵەمەندم، دەمەوێت بەرلەوەی پێی بڵێم پارەیەکی زۆرم لەبەردەستدایە و لەو بوارەوە پەیوەستی هیچ لایەنێک نیم، پرسیاری لێبکەم و بزانم پێی خۆشە لەگەڵمدا لەشوێنێکی ناو ئوقیانوسی ئارامدا بژی یان نا. هەر لەئێستاوە سۆراخی چەند شوێنێکم کردووە کە بەفرۆکە بتوانم سەفەری بۆ بکەم. چوارشەممە فرۆکەیەک لە "میونشن"ەوە بەرەو "سینگاپور" هەڵدەسێت، من هەروا بۆ دڵنیایی دوو بلیتم راسپاردووە، شوێنی "D1" و "G1"ی پلەی یەکەمم داواکردووە.

بابزانین چۆن دەبێت.

دەتوانین بۆ ماوەیەک لە دورگەیەکەوە بۆ دورگەیەکی تر بچین و دواتر بەدڵی خۆمان لەشوێنێکدا جێگیربین. دەشتوانین خانویەک بکرین. رەنگە ڤێلایەکی نایاب بدۆزینەوە کە بەسەر دەریادا بروانێت. هێندەش گەنج نیم کە بڵێم کاتی خانەنشینیم نەهاتووە، "بییتا"ش وێنەی ئاوی دەکێشێت.







دیسانەوە لە فەنتاسیادا دەژیم. بەڵام ئێستاکە کەمێک پێدادەگرم.

*

هەر پاش ئەوەی شێوە بیرۆکەیەکی چیرۆکی ژیانی خۆمم دارشت _هەتا ئەو کاتەی کە بەپەلە لە "بۆلۆگنا"وە بۆی دەرچووم _ بۆ ماوەی چەندەها کاتژمێر لەبەردەم پەنجەرەکەدا دانیشتم و تەماشای شەپۆلی دەریامدەکرد کە دەیدا لە "تۆرە ساراسینا". رۆژی هەینی پێش جەژنی پاک بوو، رۆژێک پێشئەوەی "بییتا" ببینم. تەنانەت تاقەتی ئەوەشم نەبوو برۆمە ناوشار و سەیری رێپێوانی گەورەی یادکردنەوەی ئازارەکانی مەسیح بکەم.

بڕیارمدا داوای یارمەتی لە ئوتێلەکە بکەم هەتا ئەو شتانەی کە نوسیبوومن بە "ئی مەیڵ" بینێرم بۆ "لویجی". بەلامەوە شتێکی سودبەخشبوو کە کۆپیەکی نوسراوەکەم لە شوێنێکی تریشدا هەبێت و تەنها لەو شوێنەدا نەبێت کە خۆمی لێبووم. هەر بۆ نمونەش "لویجی" دەیتوانی هەموو چیرۆکەکە بگەیەنێتە دەستی برادەرە رۆژنامەنوسەکەی کە لە "کۆریرێ دیللا سیرا"دا وتاری دەنوسی و پێی بوتایە بەئارەزووی خۆت مادەکە بەکاربهێنە. لە قازانجی مندابوو کە چیرۆکەکە بەزوترین کات بڵاوبکرێتەوە، یان بەلایەنی کەمەوە ئاماژە بۆ بابەتەکە بکرێت. ئیدی دەبوایە منیش بەزوترین کات وڵاتەکەم بەجێبهێشتایە _کەسێکی نائارام نابێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە یەک شوێندا بمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک کە بۆ بەیانی خەبەرم بووەوە، بڕیارمدا بەرلەوەی خۆم ونبکەم، رۆژێکی تریش "ئامالفی"دا بمێنمەوە.





ئاووهەوا هەر زۆر خۆشبوو و هێشتام سەردانی مۆزەخانەی کاغەزەکەشم نەکردبوو. لەدوای نانخواردنی بەیانیەوە رۆیشتمە ناوشار و رۆژنامەیەکی "کۆریرێ دیللا سیرا"م کڕی، من هەموو رۆژێک دانەیەکم لێدەکڕی. دوو رۆژ لەمەوبەر وتارێکی کورتیان دەربارەی پێشانگای کتێبەکەی "بۆلۆگنا" نوسیبوو، تیایدا هاتبوو کە ئەم ساڵ کتێبێکی سەرکەوتووی تایبەت لەپێشانگاکەدا دەرنەکەوتووە، ناونیشانێکی وا نەبووە کە هەموو بەڕێوەبەرانی دەزگاکان هەوڵی کڕینی بدەن، هیچ کتێبێکی نوێی "هاری پۆتە"یش بەڕێوە نەبووە. هەروەها نوسرابوو کە ورتەورتی سەرەکی ئەم ساڵ دەربارەی شتێکی تەواو جیاوازە، کتومت دەربارەی "جاڵجاڵۆکە"کەیە، لەپشت ئەو ناوە پڕلەنهێنیەیەشدا وەک دەڵێن "کارگەیەکی فەنتاسیای" مۆدێرن خۆی حەشارداوە (هەر بەڕاستی وانوسرابوو!) کە بیرۆکەی ئەدەبی و رۆمانی نیوەتەواوی بەنوسەرانی سەرانسەری جیهان فرۆشتووە. نوسەری وتارەکە ناوی "ستیفانۆ فۆرتیسیاری" بوو و ئاماژەی بۆ ئەوەکردبوو کە لە سەردەمی هەرە کۆندا هێندە روویداوە کە خەڵکی دونیایەک کتێبیان گەڕاندۆتەوە بۆ نوسەرێکی دەستڕۆیشتوو و بەناوبانگ، بەڵام لە راستیدا کتێبەکان چەند نوسەرێکی جیاواز نوسیبوونی. بەڵام لەوە دەچێت حاڵەتی "کارگەی فەنتاسیا" شتێکی کتومت پێچەوانەی ئەو حاڵەتە بێت. چەندەها رۆمان، رەنگە دوو سەد دانەیەک، لەڕاستیدا لەسەر بیرۆکە و ئەندێشەی سەرەکی تەنها یەک کەسەوە دارێژرابن. لەکاتی خوێندەوەی ئەو وتارەدا خۆم پێنەگیرا و خەندەیەک کەوتە سەر لێوانم. من جێپێی خۆمم جێهێشتبوو.

نوسەری وتارەکە خاڵێکی گرنگ دەوروژێنێت و ئەو دیاردەیەی کە وەسفیدەکات هێندە رەسەن نیە وەک ئەوەی کە دێتە بەرچاو. پیاوانی





کڵێسە هەمیشە شتێکی لەو بابەتەیان دەربارەی کتێبەکانی ئینجیل وتووە. بێگومان ئینجیل لەلایەن چەند نوسەرێکی جیاوازەوە نوسراوەتەوە، بەڵام تیۆلۆجەکان پێیانوابووە کە تەنها یەک نوسەری گەورە کۆیکردونەتەوە و ئەو لەپشتی سەرتاپای هەموو کتێبەکانەوە بووە. بێگومان لەو بڕوایەدانەبوون کە خودا سروشی زمانەوانی بە یەک بەیەکی ڕستەکانی ئینجیل بەخشیبێت، چونکە خودا بەو شێوەیە کارناکات. بەڵام کلیلی کردنەوەی نهێنیەکی بە هەریەکێک لەو نوسەرانە بەخشیوە. شتێکی داونەتێ کە بیری لێبکەنەوە.

هەستمدەکرد هاوکاری خودام و زۆر بەباشی لە شێوەی مامەڵەکردنی ئەو لەگەڵ مرۆڤدا تێدەگەیشتم. ئەویش لەبری یارمەتیەکانی داوای هەندێک شتی دەکرد. ئەو لەپێشەوە داوای شتیدەکرد، هەر لە پیاداهەڵدانیەوە هەتا سزادانی خۆیی لە کاتی گوناحکردندا. بەڵام ئەو لەمن زیاترێک رۆیشت؛ هەڕەشەی لە سرینەوەی هەموو ئەوانە دەکرد کە باوەڕیان پێنەدەکرد، مرۆڤی مۆدێرنیش ڕازی نەبوون لەژێر ئەو هەلومەرجانەدا بژین. ئێستاکەش خودا مردووە و هەر دەسیسەی نهێنی خەڵکە نائومێدەکانیش کوشتی.

کەواتە "ستیفانۆ" بووە. بەو شێوەیە بۆمدەرکەوت کە "لویجی" راستی دەکرد و پێی رانەدەبواردم، بەڵام هێشتام وەک نیشانەیەک دەمبینی و گومانم هەر هەبوو. هیچ شتێک لە وتارەکەدا نەهاتبوو کە وایدەرخات رۆژنامە نوسەکە لەوەوپێش شتێکی لەسەر "کارگەی فەنتاسیا"کە نوسیبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە وتاری رۆژەکە لەوەدەچوو کە پێشبینیکردنێکی ئەو گفتوگۆ دووردرێژەبێت کە لەگەڵ "لویجی"دا لە "بۆلۆگنا"دا کردم. جگەلەوەش لەوتارەکەدا بەهیچ جۆرێک ناوی





ڕۆمانی "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە" نەهاتبوو، نە ڕۆمانە نەرویجیەکەی و نە ئیتاڵیەکەشی.
نەمدەتوانی بەدڵنیاییەوە بزانم کە بەڕاستی پلانیان بۆ کوشتنم داناوە یان نا، بەڵام نەمویست بەختی خۆم تاقیبکەمەوە و گومانکردنەکەم سودی خۆی هەبوو.

بەشەقامە قەرەباڵخەکەی سەر قەراغ دەریادا پەڕیمەوە ئەوبەر و لە دوکانێکی پیتزەری سەر قەراغ دەریا دانیشتم، لەوێدا زەڵاتەی تەماتە و پیتزایەک و بیرەیەکم داواکرد.
ناچاربووم بەردەوام ئاگام لە خۆمبێت و بەچاوێکی کراوەوە تەماشای چواردەورەکەم بکەم. چیتر پێموانەبوو کەسێک لە "بۆلۆگنا"وە دوامکەوتبێت، بەڵام بەدوریشم نەدەزانی بەرپێوەبەری دەزگایەکی چاپی بەریتانی یان ئەسکەندەنافی پشوی جەژنی پاکی لەگەڵ پێشانگای کتێبەکەدا دانابێت و بیەوێت لە خواروی ئیتاڵیادا بەسەریبەرێت. پێشانگای کتێبی "بۆلۆگنا" هەمیشە یان ڕێک لەپێش جەژنی پاکەوە بوو یاخود ڕێک دەکەوتە دوای ئەو جەژنەوە.
لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی خواردنەکەم بووم، ڕۆژنامەم دەخوێندەوە، بەڵام سەرنجم چووە سەر کچێکی دڵفرێن کە ماکسیەکی هاوینەی زەردی لەبەردابوو و جوتێ سەرپایی سپی لەپێدابوو. لەوەدەچوو تەمەنی لە نزیکەی 30 ساڵیدا بێت و لەسەر یەکێک لەمێزەکانی تەنیشتمەوە بەتەنیا دانیشتبوو. چەرخێکی پەمەیی بەدەستەوەبوو و بێهودە دەیویست جگەرەیەک دابگیرسێنێت. لەناکاودا لەشوێنی خۆی بەرزبووە و چەند هەنگاوێکی کەم بەرەورووم هات و وتی "شقارتەت پێیە؟". بە زمانی ئیتاڵی قسەی کرد، بەڵام بەئاشکرا دیاربوو کە





ئیتاڵی نیە. منیش وتم "جگەرەکێش نیم"، بەڵام هاوکات لەسەر یەکێک لەمێزەکانی تەنیشتمەوە چاوم بە چەرخێک کەوت. بەبێ ئەوەی داوای یارمەتی لەو تۆریستە ئەڵمانیەی تەنیشتم بکەم، دەستمدایە چەرخەکەی و جگەرەکەم بۆ داگیرساند، پاشان چەرخەکەم لەسەر مێزەکەی دانایەوە و وەک سوپاسێک سەرێکم بۆ لەقاند. دواتر نانم خوارد و پارەم دا، لەکاتی ڕۆیشتنمدا بەدەست خواحافیزبوونم لە کچی جگەرە بەدەستەکە کرد. دانیشتبوو و لەسەر دەفتەرێکی سکێچ هێڵکاری شتێکی دەکێشا، خەندەیەکی پڕلەنهێنی کەوتە سەر لێوانی و ئەویش بەدەستی خواحافیزبوونی لێکردم. من دڵنیابووم کە هەرگیز لەوەوپێش نەمبینیبوو، چونکە ئەگەر لەوەوپێش بمبینیبایە، ئەوا بێگومان ئەو دەموچاوە تایبەتیەی سەرنجی ڕادەکێشام.
بەناو شاردا بەڕێکەوتم و پیاسەیەکم بەناو "موسیۆ دیڵلا کارتا"دا کرد، لەوێدا ئاشێکی دێرینی بەرهەمهانی کاغەزی لێبوو. کاتی خۆی "ئامالفی" لەبەرهەمهێنانی کاغەزدا یەکێک بووە لەو شارە پێشەوایانەی ئەوروپا. پیاوێکی پیر لە مۆزەخانەکەدا شێوەی فلیقانەوەی دارەکانی نیشاندا و دواتریش شێوەی کەبسکردن و وشککردنەوەی کاغەزەکانی خستەڕو. وتی "من تا ئێستاکەش بەو شێوە کۆنە کاغەز بەرهەمدەهێنم، ئەوەش نەریتێکە کە دەگەڕێتەوە بۆ عەرەبەکانی سەدەی 11". نمونەی ئەو کاغەزی نامە تایبەتی و بێوێنەیەی نیشاندام کە دروستی کردبوو و شێوازی سەرهەڵدانی نیشانەی تایبەتی ناو کاغەزیشی[40] بۆ ڕونکردمەوە.

[40] بۆ نمونە وەک ئەو نیشانانەی کە لەناو دراودا هەن.





دونیا گەرمبوو، بەڵام لەگەڵئەوەشدا بەرلەوەی "ئامالفی" جێبهێڵم بڕیارمدا بۆ دواجار پیاسەیەک لە "ڤالا دای مولینی"دا بکەم. من لەوەوپێش یەک کەڕەت سەردانی ئەو سەرەم کردبوو، بەڵام دیسانەوە ئەم جارەش سەختبوو بەلامەوە بەناو ئەو کۆڵانە تەسک و باریکانەی شاردا ڕێگەی دەرەوەی شار بدۆزمەوە. بەهەرحاڵ هێندەی پێنەچوو شارم بەجێهێشت و لە هەموو شارستانیەک دورکەوتمەوە.

کەپر ئەم بەر و ئەوبەری ڕێگا باریکەکەی گرتبوو و لە ژێریاندا پڕبوون لەداری لیمۆ، دارەکانیشیان بە تۆڕی نایلۆنی سەوز و ڕەش داپۆشیبوو، بۆ ئەوەی لیمۆکان لە ڕەشەبا و تەرزە بپارێزن. منداڵێکی بچوکم بینی سۆندەیەکی بازنەیی بەناوقەدیەوە کردبوو و دەیخولاندەوە، بەڵام ئەو ئافرەتە ڕەشپۆشەم نەبینی کە حەفتەیەک لەوەوپێش بەسەر پەنجەرەکەدا خۆی چەماندەوە و فەرموی پەرداخێک مەشروبی لیمۆی لێکردم. خۆری ڕۆژی جەژنی پاک سەدەها مارمێلکەی بچوکی هێنابووە دەرەوە. سرک بوون، وابزانم هێندە زوو زوو خەڵکی بەو شوێنەدا نەدەرۆیشتن.

لە دواهەمین خانوی شار تێپەڕیم و بەسەر پردێکی دێرینی سەر گۆلاوێکیشیدا پەڕیمەوە. بەسەر تولەڕێگایەکی بەچەو داپۆشراودا ڕۆیشتم کە پێیان دەوت "ڤیا پارادیسۆ"، ئەو ناوەیان زۆر بەباشی هەڵبژاردبوو. کاتی خۆی هەر زوو تولەڕێگای "ڤیا پارادیسۆ" بووەبە تولەڕێگایەکی هێمن و خۆش بۆ گاوگۆلی ناوچەکە و بنی دۆڵە بەپیتەکەی لە ڕوبارەکەی تەنیشتی جوادەکردەوە.

کەڕەتی پێشوو کە بەویادا ڕۆیشتم هیچ کەسێکم نەبینی، بەڵام ئەم جارەیان لەپڕێکدا لەپشتمەوە گوێم لە خشەخشی لق و گەڵای درەختەکان بوو. کەمێک دواتر ئافرەتێک لەناو دەرەختەکانەوە هاتە





دەرەوە و لەتەنیشتمەوە وەستا. هەمان ئەو کچەبوو کە ماکسیە زەردەکەی لەبەردابوو.

هەر بەزمانی ئیتاڵی وتی؛ «ئەم کاتەت باش؟»، خەندەیەکی گەورەی خستە سەر لێوەکانی و لەوەدەچوو چاوەڕوانی ئەوەبووبێت کە لەوێدا بمبینێت. دوو چاوی قوڵی قاوەیی پێوەبوو و قژێکی زەردی تۆخی بەشێوەیەکی سروشتی بەردابۆوە.

لەوەڵامیدا وەتم؛ «ئەم کاتەت باش!». زۆر بەوریاییەوە تەماشایەکی لای پشتەوەی تولەڕێگاکەم کرد، بەڵام کەسم نەبینی و هەر خۆی بەتەنهابوو.

ئەوجا وتی؛ «ئەم سەربەرزاییە شوێنێکی زۆر خۆشە، تۆ قەت لەوەوپێش هاتوویت بۆ ئێرە؟»

وەڵامم دایەوە و وتم؛ «تەنها یەک کەڕەت»

لەوەدەچوو نەزانێت کە منیش کەسێکی بیانیم. لەدوری پەنجا مەترێک لەپێشەوەماندا تاڤگەیەکی لێبوو، ئاماژەی بۆکرد و وتی؛ «بڕۆینە ناو ئاوەکەوە؟»

هەر ئەو قسەیەی بەسبوو بۆئەوەی قەناعەت بکەم کە لەوێدا چاوم بە خۆشەویستی ژیانم کەوتووە. هەرگیز لەوەوپێش یەکتریمان نەبینیبوو، جوتێ سەرپایی سپی لەپێدابوو و جگە لە ماکسیەکی تەنکی هاوینە زیاتر، هیچ شتێکی تری لەبەردانەبوو. دونیا زۆر گەرم بوو، ڕاستە هیچ یەکێکمان وەک کەسێکی ڕەسمی نەدەهاتینە بەرچاو، بەڵام پێشنیارەکەی هەر زۆر نارەسمیبوو کە وتی "بڕۆینە ناو ئاوەکەوە؟".

"بڕۆینە ناو ئاوەکەوە؟"، ئەو سێ وشەیە پڕبوون لە مانای ناڕاستەوخۆ. مەبەستی بوو پێکەوە خۆمان بخەینە ژێر ئاوی تاڤگەکە و لەهەمان کاتیشدا مەبەستی نەبوو. لەڕاستیدا دەیویست بڵێت

"گەرمای ئاووهەوا هەروەک گەرمای فرنێکی سەمون وایە. ئاماژەی بۆ تاڤگەکە کرد و دەیخواست بڵێت تاڤگەیەکی جوانە و نەشئە دەبەخشێ، شتێکی سەرنجڕاکێشە و دڵ دەفرێنێ. ئەو پرسیارە کورتەی هەر بۆئەوە لێکردم کە بزانێت من بە چ شێوەیەک بەرپەرچی دەدەمەوە. گەرەکیبوو بڵێت حەزم لێتە و دەیویست بزانێت من بە چ شێوەیەک وەڵامی دەدەمەوە. دەیویست بزانێت من بە چ جۆرێک سەمادەکەم. تۆنی خۆی خستەڕو و ئەو سێ وشەیەش وەک "زرنگە چنگاڵ"ێک[41] وابوو. ئافرەتە ماکسی زەردەکە دەیویست بڵێت دەمەوێت لەگەڵتا بێم، بەڵام هاوکاتیش نەیدەویست بەشێوەیەکی دەستکرد گفتوگۆیەکم لەگەڵدا دابمەزرێنێت. پێی وانەبوو شتێک هەبێت کە شەرمی لێبکەین.

بیرم لە ئامۆژگاریەکەی "لویجی" کردەوە و وتم؛ «ڕەنگە واباشترێک بێت بەیانی ئەوە بکەین»

کەمێک سەری لار کردەوە. ئەو منی تاقیکردەوە و منیش باشترین وەڵامم دایەوە. وەڵامێکی زیرەکانە و پڕبەپێستی خۆیم دایەوە. ئەگەر یەکسەر کراسەکەم دابکەنایە و قایشی پانتۆڵەکەم شلبکردایەتەوە، ئەوا ئەوکاتە دەبوومە مایەی پێکەنین. ئەو مەبەستی نەبوو بەمانای وشە پێشنیارەکەی بهێنینە دی. قسەکەی مەتەڵێکی پڕلەوێنەبوو. ئەگەریش لەوەڵامدا بموتایە "بێگومان نامەوێت لەگەڵ ئافرەتێکی نەناسیاودا بچمە ژێر ئاوی تاڤگەیەکەوە، ئەوا ئەو کاتەش لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرنەدەچووم کە خستبوویە بەر دەمم. ئەگەر خۆمم

[41] ئامێرێکە لە شێوەی چنگاڵی دوو داندایە، بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێت کە تۆنی مۆسیقی لەسەر ڕێک بخرێت.و





لەشتێکی هێندە گشتی و ئاسایی بدزیایەتەوە، ئەوا ئەو کاتە وەک کەسێکی زۆر ڕەسمی دەهاتمە بەرچاو، وەک ئەوە دەبوو کە ڕەفزی بکەم.

دەستێکی بۆ درێژکردم و وتی؛ «باشە، بەیانی دەچین»، پاشان بەدەم پێکەنینەوە وتی «بابڕۆین!» ئیدی کەوتینە ڕۆیشتن. ئەو لەسەر تولەڕێگە یەک دوو هەنگاوێک لەپێشمەوە دەڕۆیشت.

ناوی "بییتا" بوو و خەڵکی "میونشن" بوو. ئەویش حەفتەیەک لەوەوپێش هاتبووە "ئامالفی"، بەڵام نیازیبوو هەموو هاوینەکە لەوێدا بەسەربەرێت. وێنەی ئاویی دەکێشا و ژورێکی لەلای بێوەژنێکی میهرەبان بەکرێ گرتبوو، وایدانابوو لە کۆتایی مانگی "نۆ"دا پێشانگایەکی گەورە لە شاری "میونشن"دا بۆ وێنەکانی بکاتەوە. داوای لێکردم کە ئامادەی پێشانگاکەی "میونشن"ی بم. پەیمانم پێدا کە بڕۆم، چونکە چارەی ترم نەبوو. پار پێشانگایەکی بچکۆلەی کردبووە و دەربارەی ئەو شتانەبوون کە لە شاری "پراخ"دا بینیبوونی، ئەو ماوەی دوو مانگێک لە پایتەختی "چیک"دا مابووەوە.

دەمێکبوو بە زمانی ئەڵمانی قسەمان پێکەوە دەکرد. بۆ من ئاسانترێک بوو کە بەئەڵمانی قسە بکەم وەک لەوەی ئەو بە ئیتاڵی قسەبکات. بە لەهجەی زمانەکەیدا دەمزانی کە لە "بایرن"دا لەدایک نەبووە و لەدڵی خۆمدا دەموت ڕەنگە ئەوە یەکێک بێت لەو هۆیانەی کە وایلێدەکات شوێنی لەدایکبوونیم پێنەڵێت. نازانم بۆ هەستمدەکرد کە دایک و باوکی لەو ئەڵمانیانەبوون کە کاتی خۆی لە چیکۆسلۆفاکیادا دەژیان و لەدوای شەڕی جیهانی دوهەمەوە زۆربەیان ڕایانکرد و لە "بایرن"دا نیشتەجێبوون، بەڵام وابزانم هەر بەهۆی ئەوەوە ئەو هەستەم لادروستبوو چونکە وتی چەند مانگێک لە پراخدا ژیاوم.





من ناوی ڕاستەقینەی خۆمم پێ نەوت، بەڵام نازناوێکی گونجاوم بۆ خۆم دۆزیەوە. لەو کاتەشدا کە پێم وت، ڕێک تەماشای ناو چاویم کرد. ناچاربووم تاقیبکەمەوە، بەڵام نازناوەکەمی بەلاوە ئاسایی بوو.
من کەسێکی بێ ئەقڵ نەبووم. ڕەنگە هەر لەوکاتەوە عاشقی بووبم، بەڵام کەسێک بووم کە هەستم بەبەرپرسیاری دەکرد. نەمدەتوانی هەروا بەئاسانی ئاگادارکردنەوەکەی "لویجی" لە مێشکمدا دەربهێنم. ناوی باوکی لێ نەپرسیم، بەڵام من وتم خەڵکی دانیمارکم و لە کۆبنهاگندا دەژیم. ئەوەشی بەلاوە ئاسایی بوو. وتم من لە دەزگایەکی چاپدا بەڕێوەبەری دەستەی نوسەرانم، ئەوەش هەر زۆر زۆر شیاوبوو. ئیدی بۆم ڕونکردەوە و وتم؛ «کۆمپیوتەرێکی جانتایی و هەندێ کارم لەگەڵ خۆمدا هێناوە بۆ "ئامالفی"، پێویستیم بەوەبوو کەمێک دوربکەومەوە». خۆم پێموابوو باوەڕ بە قسەکەم بکات، بەڵام وابزانم بەتەواوەتی ئەوم هەڵنەسەنگاندبوو.
«کار؟»
لەوەڵامدا وتم؛ «مەبەستم لە هەندێک کاری بەڕێوەبردنە».
«باوەڕت پێناکەم. هیچ کەسێک لە دانیمارکەوە نایەتە "ئامالفی" تەنها بۆ ئەوەی هەندێک "کاری بەڕێوەبردن" ئەنجامبدات. من وای بۆدەچم خەریکی نوسینی ڕۆمانێک بیت»
نەمتوانی درۆی لەگەڵدا بکەم. زۆر زیرەک بوو. لەبەرئەوە وتم؛ «باشە، ڕۆمانێک دەنوسم» کەمێک دوای ئەوە درێژەم بەقسەکەمدا و وتم؛ «پێم خۆشە کە لێمتێدەگەیت»
شانێکی هەڵتەکاند و وتی؛ «ڕۆمانەکەت دەربارەی چیە؟»
سەرم بۆ ڕاوەشاند و هێندەم پێوت کە من هەتا ڕۆمانەکەم تەواونەکەم نامەوێت بەهیچ جۆرێک باسی نوسینەکەم بکەم.





وەڵامەکەمی بەدڵبوو، بەڵام هێشتام دڵنیانەبووم لەوەی کە باوەڕم پێدەکات یان نا. لەدڵی خۆمدا دەموت "بڵێیت بزانێت من کێم؟". ئەگەر قسەکەی "لویجی" دەربارەی پلانە نهێنیەکە تەنها قسەیەکی بەتاڵ بێت، ئەوا هەرگیز لێی نابورم.
بەلای پاشماوەی بەقەوزە داپۆشراوەکانی ئاشە کۆنەکەی کاغەزەکەدا ڕۆیشتین. "بییتا" ئامازەی بۆ گوڵ و درەختەکان دەکرد و ناوەکانیانی پێدەوتم. باسی "ڕۆمانسیەکانی جینا"مان کرد کە کاتی خۆی تاسەی گەڕانەوەیان دەکرد بۆ پاشماوەکان و دیمەنە کەلتوریەکان. باسی "گۆتە" و "نۆڤالیس" و "نیتشە" و "ڕیلکا"مان هێنایە پێشەوە. باسی هەموو شتێکمان دەکرد. "بییتا" حەکایەتێکی خەیاڵی بوو بۆ خۆی، کۆی کۆمەڵێک حەکایەتی خەیاڵی بوو. کەسێکی وانەبوو کە تەنها یەک ئاراستەی هەبێت، بەڵکو کەسایەتیەکی هەمەڕەنگی هەبوو. هەستم دەکرد لە خۆم دەچێت.
هێندە زوو زوو ڕونادات کە ئافرەتێک لە خشتەم بەرێت، بەڵام ئەو کاتە دەگمەنانەی کە ئافرەتێکم بەڕاستی خۆشدەوێت، ئیدی پێویستیم بەکاتێکی هێندە زۆر نیە تا بیناسم. تەنها ناسینی ئەو کەسانەی کە حەزمان لێیان نیە، کاتێکی زۆریان دەوێت.
دوای ئەوەی پاشماوە کۆنەکانی ئاشی کاغەزەکەمان بەجێهێشت کە پێیان دەوت "کارتیرا میلانۆ"، ڕێگاکە بەلای ڕاستدا تولە ڕێگایەکی تری لێدەبووەوە. "بییتا" وتی "تۆ قەت چوویت بۆ "پۆنتۆنا"؟". دەمزانی ئەوە ناوی شارۆچکەیەکی بچوکە و دەکەوێتە سەر یەکێک لەبەرزاییەکانی سەرو "ئامالفی"یەوە، بەڵام من خۆم نەچووبوومە ئەو سەرەوە. «وەرە!» هێندەی وت و بەدەستی ئامازەی بۆکردم کە بچمە لایەوە. نەخشەیەکی پێبوو و وتی ئەو ڕێگایەی کە بۆ "پۆنتۆنا"

دەچێت ناوی "ڤیا پیسترۆفا"یە. من ئەوەم پێناخۆشبوو کە نەمدەتوانی وشەیەکی شیاو وەک ڕەسەنی ئەو وشەیە بدۆزمەوە.
دۆڵەکەمان لەپاش خۆمانەوە بەجێهێشت و چووینە سەر ڕێگایەک کە بەخشت داپۆشرابوو، ئەملاولای ڕێگاکەش تا ئاستێکی بەرز بەبەرد هەڵچنرابوو. چەند جارێک بۆی وەستاین و تەماشای خوارەوەمان کرد. لەوێشەوە هێشتام گوێمان لە هاژەیەکی قوڵی تاڤگەکە بوو، ئەو تاڤگەیەی کە دامان نابوو بۆ بەیانی خۆمان بخەینە بەر ئاوەکەی. بەڵام هێندەی نەبرد و ئیدی دەنگی تاڤگەکە و خوڕەی لاوازی ڕووبارەکە جودانەدەکرایەوە کە لە خواری خوارەوەی "ڤالا دای مولینی"یەوە دەگەیشتە لامان.

پاش سەعاتێک ئینجا گەیشتینە "پۆنتۆنا"، بەڵام ئیدی هەردوکمان شەکەت بووبووین. بەدرێژایی ئەو ماوەیە بەردەوام پێکەوە قسەمان دەکرد و هەر لەوێدا هێندە لەیەک نزیکبووبووینەوە کە هەردوکمان دەمانزانی ئەویتر نهێنیەکی گەورەی لەناوەوەدایە. من لەوە دەترسام "بییتا" ئەو شتە بزانێت کە من هەوڵمدەدا بیشارمەوە، ئەویش نائارام دەهاتە بەرچاوم و دیاربوو لەوە دەترسا هەوڵی دۆزینەوەی نهێنیەکەی بدەم.
"بییتا" باسی دایکی کرد و وتی هێندە نابێت مردووە، ئەوەشی وت کە بەدرێژایی ژیانی زۆر پەیوەستی یەکتربیوون. دایکی زۆر لە ناکاودا کۆچی دوایی کردبوو، سەرباری ئەوەش ڕێک لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا مردبوو. لەگەڵ چەند برادەرێکیدا لە "بایرشهار هۆف"دا ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی گێڕاوە. "بییتا" وتی ئەو ڕۆژە دایکم تا بڵێیت دڵی خۆشبوو، بەڵام لەو کاتەدا کە ویستبووی بەخۆی و پەرداخێک







شەمپانیای دەستیەوە بچێت لەسەر مێزی نانخواردنەکە دابنیشێت، کەوتووە و هەڵنەساوەتەوە. پزیشکێک لەناو ئامادەبواندا بووە، بەڵام نەیتوانیوە ڕزگارییکات. ئینجا وتی دایکم بەنەخۆشی دڵ نەمرد، هیچ هۆیەکی تری ئاشکراشمان بۆ ڕون نەبووەوە کە پێی مردبێت. ئەو هەر زۆر بەئاسانی ئەم جیهانەی بەجێهێشت. لەوێدا پرسیارێکم لێکرد و وتم؛ «ئەی باوکت؟» لەوەڵامدا زۆر بەتوندوتیژی وتی «پێمخۆش نیە باسی ئەوت بۆ بکەم». لەپڕێکدا بەخۆیدا هاتەوە و بەشێوەیەکی نەرمتر وتی؛ «باشترە ئەو باسە بۆ سبەینێ هەڵبگرین» تەماشایەکی کردم و پێکەنی. وابزانم بیری لە تاڤگەکە دەکردەوە.
یەک دوو جار لە شوێنی نارەحەت و چاڵوچۆڵی ڕێگاکەدا دەستی گرتم، چونکە سەرپایی لەپێدابوو، بەڵام کاتێک کە گەیشتینە بەردەم "پۆنتۆنا" دەستی خستە ناو دەستمەوە، بەو شێوەیەش وەک ژن و پیاوێک هەنگاومان نا و چووینە ناو "پیزێتا دی پۆنتۆنا"وە. هەر زۆر ئاسان بوو، یاریەکی خۆشبوو، لەوە دەچوو هەموو جیهان هەڵبخڵەتێنین. هەندێ خەڵکی لەپاش چەندەها ساڵ ئەوجا یەکتری دەناسن، بەڵام ئێمە سەربە جۆرە مرۆڤێکی تەواو جیاوازتر بووین. ئێمە هەر لەو کاتەوە چەندەها ڕێگای قەدبڕی جوانمان لەیەکتریدا دۆزیبووەوە و دەمانتوانی لەڕێیانەوە لەیەکتر نزیکبینەوە، لەبەرئەوە ڕێگامان بەیەکتردەدا کە یەک دوو نهێنی لەلای خۆمان بشارینەوە.
پاشئەوەی تەماشایەکی ئەو ناوەمان کرد، ڕۆیشتینە بارێکەوە و بەپێوە قاوەیەکمان خواردەوە. "بییتا" داوای پەرداخێک مەشروبی لیمۆی کرد و منیش پێکێک براندیم داواکرد. بەئاستەم قسەمان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد. "بییتا" جگەرەیەکی دەرهێنا و منیش شقارتەکەم





لەدەستی فڕاند و بۆم داگیرساند. بەسەر مێزە بەرزەکەی بارەکەدا خۆمان چەماندەوە و سەیری یەکتریمان دەکرد، وەک ئەوەی بەربەرەکانێی یەکتری بکەین. خەندەیەک کەوتە سەر لێوەکانی. لەوەدەچوو لەیەک کاتدا بەچەندەها شت بپێکەنێت. وتم "تۆ شێتیت". ئەویش لەوەڵامدا وتی «دەزانم». ئەوجا وتم من زۆر بەتەمەنترم لە تۆ، کەچی وەڵامی دامەوە و وتی «کەمێک بەتەمەنتریت». تا ئەو کاتە کەسمان تەمەنی خۆی بەوی تر نەوتبوو.

لە "پۆنتۆنا"وە بەرەو "ئامالفی" خلبووینەوە و ئەو ڕێگا تەسکە سەرەولێژە لە هەزار پێپلیکانەیەک زیاترێک بوو. لەشوێنێکی ڕێگاکەدا پیاوێک بەلاماندا هات کە هێستریێکی پێبوو، ناچاربووین خۆمان بە شاخەکەوە بنوسێنین. من و "بیبیتا" زۆر نزیکبووین لەیەکتریەوە. بۆنی هەڵوژە و گێلاسی لێدەهات. بۆنی زەویش.
لەسەر کورسیەکی تەختەی ڕەق و تەق دانیشتین بۆ ئەوەی پشو بە قاچمان بدەین. پاش یەک دوو چرکەیەک پیاوە یەک مەتریەکە بەلارولەنجە لێمان پەیدابوو و لە تەنیشتمانەوە لەقەراغی ڕێگاکەدا لەسەر بەردێک دانیشت. بەرلەوەی دانیشێت بە گۆچانەکەی دەستی ئاماژەی بۆکردم و وەک ئەوەی بپرسێت "بۆم هەیە لێرەدا دانیشم؟" منیش نەموێرا بەرەنگاری ببمەوە، چونکە زۆر باش دەمزانی ئەو لە هەموو بارێکدا ڕێک ئەو شتە دەکات کە بەدڵیەتی. کە منداڵ بووم هەمیشە وەک پەندێک دەیوت "پیاوە یەک مەتریەکە وەستایە وەستا!". بەدەرلەوەش نەمدەتوانی لەو کاتەدا ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا قسەبکەم، چونکە "بیبیتا"م لەگەڵدابوو. گەر بەقسە داوام لێبکردایە کە بڕوات یان بمترسانادایە، ئەوا لەوانەبوو "بیبیتا"م بترساندایە. گەر



نەشترسایە، ئەوا بەلایەنی کەمەوە گومانی لە ئەقڵم دەکرد. لەبری ئەوە بڕیارمدا چیرۆکێک بۆ "بیبیتا" بگێڕمەوە و لەڕێگەی چیرۆکەکەوە ناڕاستەوخۆ باسی پیاوە یەک مەتریەکە بکەم. خاڵە گرنگەکانی چیرۆکەکە بەم شێوەیە بوو؛

ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر کوڕێکی بچکۆلە بەناوی "جیری کوبلیک" لە "پراخ"ی پایتەختی "چیک"دا دەژیا. باوکی نەبوو، بەڵام لەگەڵ دایکیدا لە ئەپارتمانێکی بچکۆلەدا دەژیا، لەتەمەنی سێ ساڵییەوە زوو زوو خەوێکی بەتینی بە پیاوێکی بچکۆلەوە دەبینی، پیاوەکە کڵاوێکی لبادی سەوزی لەسەردەکرد و گۆچانێکی حەیزەرانی باریکی بەدەستەوە دەگرت. لە خەوەکانیدا باڵای ئەو پیاوە بچکۆلەیە کتومت بەقەد باڵای خۆی بوو، بەڵام بەشێوە و ڕوخسار وەک پیاوێکی ئاسایی وابوو. تەنها ئەوەندەبوو کە باڵای کورتبوو و لەچاو زۆربەی خەڵکانی ئاساییدا دەمدرێژتربوو و ڕاستەوخۆتر قسەیدەکرد.
ئەو پیاوە بچکۆلەیە لە ڕێگەی خەوەکانەوە دەیویست قەناعەت بە "جیری"بکات کە هەموو ئەو شتانەی ئەو کوڕە بچکۆلەیە دەیانکات، ئەو دیاریاندەکات، نەک تەنها لە کاتی خەوتنیدا، بەڵکو لەو کاتانەشدا کە بەخەبەرە. لەبەرئەوە ئەو وەختانەی کە "جیری" شتێکی لەو شتانە دەکرد کە دایکی لێی قەدەغەکردبوو، لەدڵی خۆیدا دەیوت "ئەمە، کەواتە ئەوە پیاوە بچکۆلەکە پێی کردم". جگەلەوەش زۆر جار "جیری" وشە و دەربڕینی گەورانەی بەکاردەهێنا و دایکی نەیدەزانی لە کوێوە فێریان بووە. لەسەرو ئەوەشەوە چیرۆکی کورت و درێژی زۆر ترسناک و سەیر و پڕلەنهێنی دەگێڕایەوە، ئەو چیرۆکانەی باسدەکرد کە پیاوە بچکۆلەکە لەخەویدا بۆی دەگێڕایەوە.





خەوەکانیشی بەو پیاوە بچکۆلەیەوە هەمیشە خۆش و پڕلەژیانبوون، لەبەرئەوە زۆربەی جارەکان "جیری" بەدەم خەندەیەکەوە خەبەری دەبووەوە، هەرگیزیش بەرەنگاری دایکی نەدەبووەوە کە پێی دەوت "ئیدی کاتی خەوە و دەبێت بخەویت". کێشەکان لەو کاتەوە سەریانهەڵدا کە بەیانیەکیان پیاوە بچکۆلەکە لەگەڵ تەواوبوونی خەوەکەدا ون نەبوو. ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی هاوینی خۆشبوو و کە "جیری" چاوی دەکاتەوە، زۆر بە ڕونی پیاوە بچکۆلەکە دەبینێ، بەخۆی و کڵاوە لبادە سەوزەکەیەوە لە ژورەکەیدا لەتەنیشت جێگاکەیەوە وەستاوە، پاش نەختێکیش گردە پیاوەکە لەدەرگا کراوەکەوە دەچێتە داڵانەکە و لەوێشەوە خۆی دەکات بە ژوری دانیشتنەکەیاندا. "جیری"یش بەپەلە لە جێگاکەیدا بەرزدەبێتەوە و ناچارانە بەرەو ژوری دانیشتنەکەیان دوایدەکەوێت. لەودێدا بەڕاستی پیاوە بچکۆلەکە دەبینێ گۆچانەکەی هەڵدەسوڕێنێت. پیاوێکی پڕلەژیان و چالاک دەبینێت.

پاش ماوەیەک پیاوە بچکۆلەکە لەسوچێکی ژورەکەدا لەلای کتێبخانەکەوە دەوەستێت و بە گۆچانەکەی دەستی ئاماژە بۆ کتێبێک دەکات، لەو کاتەدا دایکی دێتە ژورەوە و "جیری"ش زۆر بەپەرۆشەوە ئاماژە بۆ پیاوە بچکۆلەکە دەکات، بەڵام دایکی هیچ نابینێت، بەڕاستی ناتوانێت پیاوە چکۆلەکە ببینێت. "جیری" سەری لەوە دەسوڕمێت، چونکە ئەو پیاوە بەلایەوە شتێکی نادیار نیە، شتێکی سەرابی و ناڕونیش نیە لەبەرچاویدا. هەروەک گۆزە گەورەکەی سەر عەردەکە و پیانۆ کۆنەکەیان بەڕونی دەیبینێ، ئەو پیانۆیەی کە ماوەی پێشوو دایکی بە ڕەنگی سەوز بۆیاخیکردبوو، چونکە ڕەنگە سپیەکەی زەردباو بووبوو.





پیاوە بچکۆلەکە بەشێوەیەکی تەواو جیاواز هەڵسوکەوتی دەکرد و بە شێوەی باوی ناو خەوەکانی "جیری" ڕەفتاری نەدەکرد. هێشتام جارجارێک ئاوڕی لە "جیری" دەدایەوە و یەک دوو وشەی پێدەوت، بەڵام زۆر بەدەگمەن ئەوە ڕویدەدا. ئەوەش گەورەترین گۆڕانکاری بوو لە پەیوەندی نێوانیاندا، چونکە کاتی خۆی لە خەوەکانی "جیری"دا پیاوە پچکۆلەکە جگە لە یاریکردن بە وشە، تاڕادەیەک هیچ شتێکی تری نەدەکرد. لەوەدەچوو لەوە بەدواوە هەر لەبەرخاتری "جیری" بچکۆلانە وازی لە زۆربەی هەرە زۆری زمانەکەی هێنابێت. بەدەرلەوەش لە خەوەکاندا حەزی لە هەڵوەراندی هەڵوژە و گێلاس بوو و بەچێژەوە یەکسەر دەیخستە دەمیەوە و دەیخواردن، یان "جیری" دەبردە ژێر زەمینەکەوە و ئەمبارێکی نهێنی شەربەتی پیشاندەدا، لەوێدا یەک لەدوای یەک بتڵی شەربەتی شیرینی هەڵدەپچڕی و دەیخواردنەوە، بەبێ ئەوەی دڵۆپێک بدات بەو منداڵە بۆ ئەوەی تینویەتی پێ بشکێنێت. بەڵام لە جیهانی ڕاستەقینەدا جگە لە کڵاوەکەی و گۆچانەکەی کە تاڕادەیەک هەمیشە هەڵیدەسوڕاند و بەملاولادا ڕایدەیوەشاند، هەرگیز ڕوینەدا کە شتێک بەرزبکاتەوە. نە هیچیی دەخوارد و نە هیچیشی دەخواردەوە. لەجیهانی ڕاستەقینەدا خۆی خۆی نەبوو و شتێکی تربوو، هەڵبەتە بەبەراوردکردنی لەگەڵ ئەو کاتانەدا کە لە فەنتاسیای "جیری"دا پڕلەژیان و چالاکی بوو. ڕەنگە ئەوەش ئەو نرخەبێت کەلەبری ئەوە دابێتی کە لە جیهانی خەونەوە هاتبووە ناو جیهانی ڕاستەقینەوە، بەڵام لەڕاستیشدا ئەوەش خۆی لە خۆیدا گۆڕانگاریەکی مەزن بوو.

"جیری" گەورەترێک بوو و ئەو پیاوە بچکۆلەیەش کەم تازۆر لە هەموو شوێنێکدا هەر لەگەڵیدا بوو، بەڵام تەنانەت یەک ملیمەتریش گەورەتر







نەبوو. ئەو کاتەی کە "جیری" تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵان، بەباڵا بستێک لە پیاوە بچکۆلەکە گەورەتربوو، لەو کاتەشەوە پێی دەوت "پیاوە یەک مەتریەکە"، چونکە باڵای تەنها یەک مەتر دەبوو.

لەو ڕۆژەوەی کە پیاوە یەک مەتریەکە سەری هێنایە ناو هەقیقەتەوە و بۆ یەکەمین جار لە ئەپارتمانەکەی "جیری"دا خۆی نیشاندا، لەو ڕۆژەوە ئیدی "جیری" چیتر خەونی پێوە نەبینی. لەبەرئەوە "جیری" هیچ گومانێکی نەبوو کە پیاوە یەک مەتریەکە یان خۆی بەئارەزوی خۆی لە جیهانی خەوندا هاتۆتە دەرەوە، یاخود بەزۆر لە وڵاتی حەکایەتدا دورخراوەتەوە و ئێستاکەش ڕێگای گەڕانەوەی بۆ نادۆزرێتەوە. "جیری" پێیوابوو کە پیاوی ناو خەونەکانی بەهۆی ئەوەوە ونبوویێت، لەبەرئەوە هەمیشە ئومێدەواربوو کە ڕۆژێک لەڕۆژان بگەڕێتەوە بۆ ئەو جیهانەی کە لێوەی هاتبوو. لەڕاستیدا ئەو سەر بەو جیهانەبوو، هەموو کەسێک دەبێت هێندە وریابێت کە زۆر لەو جیهانە دورنەکەوێتەوە کە بەڕاستی خۆی تێیدا دەبینێتەوە. نەختە نەختە "جیری" گەورەبوو و پیاوە یەک مەتریەکەش بەردەوام لە چواردەوری بوو، جارجارێک ئەو حاڵەتە "جیری" بێزار و نیگەران دەکرد.

بەدرێژایی هەموو ژیانی پیاوە یەک مەتریەکە وەک سێبەرێک دوای "جیری" کەوتبوو. لەوەدەچوو کە بەهێواشی لەدوای "جیری"وە بڕوات، بەڵام پیاوە بچکۆلە هەمیشە لەو بڕوایەدابوو کە ئەو حاڵەتە بەپێچەوانەوەبێت، ئەو دەیوت "من پاڵی پێوەدەنێم بۆ پێشەوە و من دەسەڵاتم بەسەر هەموو ژیانی ئەو کوڕەدا هەیە". لەسەرێکەوە قسەکەی کەمێک ڕاستی تێدابوو، چونکە "جیری" خۆی دەسەڵاتی بەسەرئەوەدا نەبوو لە چ کات و شوێنێکدا پیاوە یەک مەتریەکە



ببینێت. هەمیشە پیاوە بچکۆلەکە خۆی دایدەنا لە چ کاتێکدا خۆی پیشانی "جیری" بدات. هەندێ جار لە ناوەخترین ساتی ژیانی "جیری"دا خۆی دەردەخست.

جگە لە "جیری" هیچ کەسێکی تر نەیدەتوانی پیاوە یەک مەتریەکە ببینێت، نە لەو خانوەدا کە تێییدا دەژیا و نەلەسەر شەقام و کۆڵانەکانی "پراخ"یشدا. "جیری" بەردەوام سەری لەوە دەسوڕما.

ڕۆژێک لەڕۆژان کاتێک کە "جیری" بووبە پیاوێکی گەورە، لەگەڵ کچێکدا دەکەوێتە عەشقەوە. کچەکە ناوی "جارکا"بوو. "جیری" دەیەوێت ژیان و ڕۆحی لەگەڵ کچەکەدا دابەشبکات، هەرلەبەرئەوە یەک دوو جار کە پیاوە یەک مەتریەکە دەچووە ژورەکەیانەوە، ئاماژەی بۆ دەکرد و دەیویست دەستگیرانەکەشی سیمای ئەو پیاوە بێوێنەیە ببینێت، هەرچەندە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت. بەڵام "جارکا" پێیوابوو کە "جیری" هێدی هێدی بەرەو شێتبوون بچێت، لەبەرئەوە کەمێک خۆی لێدەکێشێتە دواوە، ڕۆژێک لەڕۆژانیش بەیەکجاری جێی دەهێڵێت و دوای پیاوێکی گەنجی ئەندازیار دەکەوێت، چونکە بەپێی ئەو "جیری" زیاترێک لەناو فەنتاسیای خۆیدا دەژی و کەمترێک لەناو جیهانی ڕاستەقینەدا لەگەڵ خەڵکی تردا دەژی.

دواتر "جیری" پیردەبێت، تەنها و دابڕاو ژیان بەسەردەبات و لەگەڵ مردنیدا گۆڕانکاریەکی یەکجار سەرنجڕاکێش ڕوودەدات. لەو ڕۆژەوەی کە "جیری" دەستبەرداری کات دەبێت، مەبەستم لەوە کە ئەم جیهانەی ئێمە بەجێدەهێڵێت، ورتەورتێکی زۆر بەپراخدا بڵاودەبێتەوە و دەڵێن دەمەوئێوارن کەسێکی "هۆمۆنکولوس"یان بینیوە کە بەتەنیا لەقەراغ ڕوباری "ڤلتاڤا"دا پیاسەی کردووە. تاک و تەرای



خەڵکیش دەڵێن ئەو گردەپیاوەمان لە گۆڕەپانی کۆنی شاردا بینیوە و بەتورەییەوە گۆچانە حەیزەرانە بچکۆلەکەی بەملاولادا باداوە. بەتایبەتیش ئەو پیاوە بچکۆلەیەیان لەچەند کاتێکی جیاوازدا لە قەبرسانەکەدا بینیبوو، بینیبویان لەسەر کێلی قەبرێک دانیشتبوو. هەمیشەش دەچوو لەسەر کێلی هەمان قەبر دادەنیشت، لەسەر کێلی ئەو قەبرە نوسرابوو "جیری کوبلیک".

پیرێژنێک لەسەر کورسیەکی قەبرسانەکە دادەنیشت و ئەو جارە بەدەگمەنانەش کە پیاوە بچکۆلەکەی لەسەر قەبرەکەی "جیری" دەبینی، زۆر بە میهرەبانیەوە دەستی بۆ ڕادەوەشاند. ئەو پیرێژنە "جارکا"بوو، ئەو کەسەی کە گەلێ ساڵ لەوەوبەر لە کاتی گەنجیدا "جیری" ڕەتکردەوە، چونکە پێی وابوو شێت بووە.

خەڵکی ناوی ئەو ژنە بەتەمەنەیان نابوو بێوەژنەکەی "کوبلیک"، بەڵام وابزانم تەنها لەبەرئەوەبوو کە هەمیشە لەسەر کورسیەکەی قەبرسانەکە دادەنیشت و چاوی دەبریە قەبرەکەی "جیری".

نزیکەی سەعاتێک باسی "جیری" و "جارکا"م کرد و کە تەواویش بووم، پیاوە بچکۆلەکە چیتر لەسەربەردەکە دانەنیشتبوو و سەیرمان بکات. وابزانم ترساندم.

لەپاش تەواوبوونی چیرۆکەکە "بییتا" هەندێک ئەندێشەی لەلا دروستبوو و پرسی؛ «ئەوە حەکایەتێکی "چیکی"بوو؟»

سەرێکم بۆ لەقاند، چونکە هەستمنەکرد هێندە پێویستبکات کە پێی بڵێم خۆم ئەو چیرۆکەم هۆنیوەتەوە.

دیسانەوە پرسیەوە؛ «چیرۆکێکی هونەریە؟»





دیسانەوە بە بەڵێ وەڵامم دایەوە، هەرچەندە دڵنیانەبووم لەوەی باوەڕم پێدەکات یان نا. نەمدەزانی تا چ ڕادەیەک ئاگای لە ئەدەبیاتی "چیکی"یە.

بۆ کاتژمێری پێنج ئینجا گەیشتینەوە ناو شار. داوام لە "بییتا" کرد لەگەڵمدا بێتەوە بۆ ئوتێلەکە و پێکەوە نانی ئێوارە بخوێین. وتم نانێکی خۆش لێدەنێن و دیمەنی دەرەوەی ئوتێلەکەش زۆر جوانە، ئەوجا وتم شەرابی نایابی "پایمۆنتێ"شیان هەیە. بەڵام داواکەمی ڕەتکردەوە و وتی کاری ترم هەیە.

وەک پێشنیارێک وتی؛ «بەیانی بەپیاسە دەچین بۆ "پۆگیرۆلا"»

سەرێکم بۆ لەقاند و وتم؛ «دەچینە ژێر تاقگەکەشەوە»

بەتوندی قۆڵی گوشیم و پێکەنی.

وارێک کەوتین کاتژمێری دە و نیوی بەیانی لەبەردەم کڵێسەکەدا یەکتری ببینین. بەیانی یەکەم ڕۆژی جەژنی پاک بوو.

*

ئەو شەوە تادرەنگانێک دانیشتبووم بیرم لە "بییتا" دەکردەوە. پێک گەیشتنێکی سەرسوڕهێنەر بوو، لەو جۆرانەبوو کە لەماوەی ژیانێکدا کەرەتێک یان دوو کەڕەت بێت هەڵدەکەوێت.

ڕەنگە تەمەنی هەر هێندەی تەمەنی ئەو کاتەی "ماریا" بوو بێت. کاتی خۆی "ماریا" دە ساڵ لە من گەورەتربوو، بەڵام لەچاو "بییتا"دا من بەتەمەنتربووم. پێیدەچوو 15 ساڵ یان 20 ساڵێک لە "بییتا" بەتەمەنترێک بم، بەڵام گەنج دەهاتمە بەرچاو. من ئەو کاتە تەمەنم 48 ساڵبوو، ترسم لێدەنیشت کە بیرم لەوە دەکردەوە، بەڵام هیچ





کەسێک ئەو هەشت ساڵەی دوای "چل"ەکەی نەدەدی. ئەو خۆشی وتی "کەمێک بەتەمەنتریت". من کاتی خۆی هەر زۆر بەلامەوە ئاسایی بوو کە "ماریا" دە ساڵ لە من بەتەمەنتر بوو، ئەویش هەرگیز گلەیی لەوە نەدەکرد کە من دە ساڵ لەو منداڵتربووم.

من پێم وانەبوو پیاوکوژێک "بیبیتا"ی بەکرێ گرتبێت بۆ ئەوەی فریوم بدات و بمخاتە تەڵەیەکەوە، پێشم وانەبوو خۆی پیاوکوژێکی بەکرێگیراو بێت. بەڵام ئەگەر وابووایە، ئەوا ئەمڕۆش ڕێک وەک ئەو پاشنیوەڕۆیە ڕەفتاری دەکرد کە کردی. لەلایەکی تریشەوە ئەویش هەر وەک من حەفتەیەک بوو هاتبووە "ئامالفی". پێیدەچوو من پارویەکی ئاسانبم بۆی. بەیانیش پێکەوە دەڕۆینە ناو دۆڵەکە و لەوێشەوە دەچینە سەر شاخی "پۆگیرۆلا". ئەو خۆی شوێنی پیاسەکەمانی دیاریکردبوو و لەوەوپێشیش بەناو دۆڵی "ئاشەکاندا" ڕۆیشتبوو بۆ "پۆگیرۆلا". نەیویست نانی ئێوارەم لەگەڵدا بخوات، چونکە وتی "کاری ترم هەیە". لەدڵی خۆمدا دەموت "ڕەنگە کارەکەی تەلەفون کردن بووبێت، پێیدەچێت بۆ پێشنیوەڕۆی بەیانی لەلای "ڤالا دای مولینی" جمەی بێت لە پیاو و هەموشیان شتیان لە گوێچکەدا بێت. هەموویانم لەبەرچاودابوو، دەمبینین لەناو پاشماوەکانی ئاشی کاغەزەکەدا هەر یەکەیان چووبوە شوێنی خۆیەوە و خۆیان ماتکردبوو. گوێم لە قاقای پێکەنینی "بیبیتا" بوو و هەر لەوێدا وێنەی ئەو سەفتە پارەیەم دەدی کە دەبوایە پێیان ببەخشیبایە. من فەنتاسیایەکی پڕلەژیانم هەبوو. تەماشایەکی وێنەکەی "ئیبسن"م کرد کە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو. خۆم بە خۆمم دەوت "بەڵام خۆ ڕێشی تێدەچێت من و "بیبیتا" وەک دوو کەس بین کە لەدوای کەشتی تێکشانێک هەوڵی بەیەک گەیشتن بدەین؟ بۆ نا؟" بیرم لە "لیندا"ی خانم و "کرۆستاد"ی پارێزەر





دەکردەوە _شتێک بوو لەوێنەی دیوارەکەوە هات بەخەیاڵمدا بەتەواوەتی لەو بڕوایەدابووم کە "بیبیتا"ش بارێکی قورسی بەشانەوەیە. لەدڵی خۆمدا دەموت "بەڕاست کێ دەڵێت ئێمە داهاتویەکمان پێکەوە نیە؟". ژورێکی لە ناوشار بەکرێ گرتبوو و وێنەکێشیش بوو. ئەو نەیدەزانی کە من هەر زۆر زۆر دەوڵەمەندم، ئەوەش شتێک بوو لەو شتانەی کە دامنابوو لە دواجاردا پێی بڵێم.

کاتژمێری دە و نیوی بەیانی لەسەر پلیکانەکانی بەردەم کڵێسەکەدا دانیشتبوو. دیسانەوە ماکسیە زەردەکەی لەبەردابوو، لە خەیاڵی خۆمدا وتم "لەوەدەچێت ئەویش لەبارەی شتی ڕۆژانەی وەک جل و بەرگ لەمن بچێت". من ئەو کاتانەی سەفەرم دەکرد تا جلەکانم زۆر زۆر پیس نەبوونایە، دامنەدەنان بۆ شۆرین. بەڵام خۆ دەشگونجێت کە زۆر دڵی بەو ماکسیە زەردە خۆشبێت. منیش بەدڵم بوو. بەدەر لەوەش ڕۆژی جەژنی پاک بوو، ئێ لەوانەیە دوێنێ ئێوارە ماکسیەکەی شۆریبێت، ڕەنگە ئەوە یەکێک لەو کارانەبووبێت کە وتی دەبێت بیانکەم. بەڵام لەبری سەرپاییە سپیەکانی جوتێ کالەی لەپێکردبوو. بەنیازی پیاسەکردن بووین.

لەسەر پلیکانەکان هەستا و بەرەوڕوم هات. لەپێشدا بەسەر هەموو پلیکانەکاندا سەرکەوتین و لەبەردەمی کڵێسەکەدا وەستاین، گوێمان بۆ گۆرانی جەژنی پاک شلکرد. "بیبیتا" بەڕێزەوە گوێی گرتبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا مەکراویش دەهاتە بەرچاوم.

ئەو کۆڵانە باریکانەمان دۆزیەوە کە بەرەو دەرەوەی شار دەڕۆیشتن، لەو کاتەشدا کە بەسەر گردە چاڵوچۆڵەکانی ناو دار لیمۆکاندا دەڕۆیشتین دەستیکرد بەقسە و وتی "هەرگیز هیچ پیاوێکم نەناسیوە



که هێنده لێی نزیکبم و لێی تێبگەم". منیش وەڵامی دڵسۆزیە
خێراکەیم دایەوە و وتم "ڕاستە من کۆمەڵێک پەیوەندی کورت کورتم
هەبووە، بەڵام وابزانم لەکاتی گەنجیمەوە هەرگیز بەڕاستی
نەکەوتوومەتە عەشقەوە. زۆر بەدڵخۆشیەوە وتم "چاوەڕوانت بووم".
قسەکانی ئەو ڕۆژەشمان بەتەواوەتی بێ ئایرۆنی و زیادەڕۆیی نەبوو،
بەڵام شتێکی زۆر جدی لەژێر قسەکانماندا خۆی حەشاردابوو. من
بەتەواوەتی دڵنیابووم لەوەی کە "بییتا" بەڕاستی حەزی لێکردووم،
بەڵام ئەوەشم پێوت کە نیازمە ڕۆژی چوارشەممە سەفەربکەم و
"ئامالفی" بەجێبهێڵم.

لێمپرسی و وتم "باشە تۆ دوێنێ هەروا بەڕێکەوت لەناو ئەو هەموو
کەسەدا هاتیت و داوای شقارتەت لە من کرد؟". خەندەیەکی مەکراوی
خستە سەر لێوانی و وەک کەسێکی بەستەزمان سەرێکی بۆ لەقاندم.
دواتریش وتم "ئەی باشە دواتر دوامنەکەوتیت بۆ دۆڵی "ڤالا دای
مولینی؟"، سەری ڕاوەشاند و وتی "مەزەندەمکرد کە تۆ دەتەوێت
پیاسەیەک بکەیت، ئێ هونەرێکی زۆر گەورەش نیە کە بزانم بۆ کوێ
دەڕۆیت، چونکە لەم ناوەدا تەنها یەک دۆڵی لێیە کە خەڵکی پیاسەی
تێدا بکات". منیش بە کورتی وتمەوە "کەواتە بەڕێکەوت داوای
شقارتەت لێکردم، بەڵام ڕێکەوت نەبوو کە دواتر بە هەمان ئەو
ڕێگایەدا هاتیت کە منی پێدا ڕۆیشتبووم؟"، لە وەڵامدا بە دەنگێکی
پڕلەنهێنیەوە وتی "لەوانەیە ئەوەیان هەروا ڕێکەوت نەبووبێت". من
دەمویست بچمە بنج و بناوانی ئەو بابەتەوە، لەوێشدا تەنها بیرم لە
قسەکانی "لویجی" نەدەکردەوە. ئەوجا وردترێک وتم "ئاخر ئێمە
تەنانەت قسەشمان پێکەوە نەکرد، تەنها یەک دوو جار سەیری
یەکتریمان کرد و تەواو". لەپێشدا پێکەنی، ئەوجا دواتر بەشێوەیەکی







زۆر جیاواز کەوتە باسکردن و وتی؛ «ڕەنگە کەسێکی وریا بیت، بەڵام
من لەو بڕوایەدام کە هێندە باش خۆت نەناسیت. ئەو کاتەی کە
هاتیتە ناو پیتزەریەکەوە، ڕۆژنامەیەکی "کۆریرێ دیلا سیرا"ت لەژێر
باڵدابوو، واتە بەخەیاڵی من زۆر ڕێیتێدەچوو کە ئیتاڵی بیت، واشی
بۆچووم کە کەسێکی ڕۆشنبیری بەدەگمەنی ئەم ناوچەیە بیت. ئەوجا
دانیشتیت و نیگایەکت تێگرتم، نیگایەک کە هێندە زۆری پێنەوتم،
بەڵام بەلایەنی کەمەوە هێندە تێگەیشتم کە نێرباز نیت. داوای
پیتزایەک و بیرەیەکت کرد، کەواتە لەگەڵ ئەوەشدا ڕێی تێدەچوو کە
گەشتیارێک بیت، بەڵام دیاربوو بە زمانێکی ئیتاڵی ڕەوان قسەت
دەکرد. دواتر دیسانەوە تەماشایەکت کردمەوە، وابزانم ئەو جارەیان
تەنها سەیری قاچمت کرد و سەرنجت چووە سەر سەرپاییە سپیەکانی
پێم. بەبڕوای من ئەوە وردەکاریەکی گرنگ بوو، چونکە هەموو پیاوێک
تەماشای قاچ و قولی ئافرەت ناکات، بەڵام تۆ کردت. بۆ ماوەیەک هەر
تەماشای قاچمت دەکرد، لەسەرپاییەکانم وردەبوویتەوە، واتە
بەشێوەیەکی تر بڵێین تۆ کەسێکیت کە چێژە هەستیەکانت بەلاوە
مەبەستە. ئەوجا ڕۆژنامەکەت کردەوە و یەکسەر چویتە سەر بەشی
کەلتوری، واتە هێندەشم بۆ دەرکەوت کە لەوانەیە کەسێک بیت کە
کەلتورت بەلاوە گرنگ بێت. دیسانەوە نیگایەکت تێگرتمەوە، تەنها
یەک نیگا، بەڵام زۆر دڵنیا و بەگوڕ سەیرت کردم. لەوانەیە لەیادت
نەبێت کە من لەوێدا وەڵامی ئەو نیگایەم دایتەوە. هەرچەندە
یەکەمین نزیکبوونەوەمان، یەکەمین جار من و تۆ ماوەیەکی زۆر کورت
سەیری چاوی یەکتریمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەیرکردنی
چاوی یەکتری بەبێئەوەی چاوتی لەسەر لابەریت _هەروەک زۆر جار
لەو کاتانەدا ڕوودەدات کە بەڕێکەوت دوو نیگا پێک دەگەن_ پێیدەچێت





که زۆر دڵسۆزانە و پڕلەخۆشەویستی بێت. نیگاکەمان دوولایەنەبوو. ئەو کەڕەتە بۆ ئەوەچووم کە هەوڵی ئەوەبدەیت تەمەنم بخەملێنیت، بەڵام ڕەنگە لەو خاڵەدا هەڵەبم. من "لەزانیا"کەی خۆمم خواردبوو و دەمویست جگەرەیەک بەچەرخێک دابگیرسێنم کە غازی تێدا نەمابوو. تۆ سەرنجت چووە سەر ئەوە، بەڵام وابزانم سەرنجت نەچووە سەر ئەوەی کە من سەرنجم چووبووە سەر ئەوەی کە تۆ سەرنجت چووبووە سەر ئەوە. وابزانم هەموو ئەو حاڵەتە تەنها پێنج چرکەیەکی خایاند، ڕێک هێندەی پێدەچوو کە تۆ لەسەر کورسیەکەت هەستیت و بێیت بۆلای من و جگەرەکەم بۆ دابگیرسێنیت، هەڵبەتە ئەگەر چەرخت پێبوایە، بەلایەنی کەمەوە ئەگەر کەسێکی بەو شێوەیە بویتایە کە من مەزەندەم دەکرد. لەبری ئەوە ناچاربووم خۆم هەستم، چەند هەنگاوێک بنێم و بێمە سەر مێزەکەت و داوای ئاگرت لێبکەم، تۆ لە زمانە ئیتاڵیەکەی من گەیشتیت، بەڵام بەلەهجەکەمدا دڵنیابوویت کە من کەسێکی بیانیم. تۆ وتت "من جگەرەکێش نیم، بەڵام لەماوەی یەک دوو چرکەی داهاتوودا چەرخێکت لەسەر یەکێک لە مێزەکانی ترەوە هەڵگرت و جگەرەکەت بۆ داگیرساندم. تۆ یەکێک نەبوویت لەو کەسانەی کە هەروا بەئاسانی ڕەوانەی مێزێکی ترم بکەیت، بەڵکو بەرپرسیاریەکەت خستە ئەستۆی خۆت، یان ڕاستتریێک بیڵێین؛ بەلاتەوە ئاساییبوو کە جگەرەکەم دابگیرسێنیت. پێتخۆشبوو کە من هانام بۆ تۆ هێنابوو. لەو کاتەشدا کە جگەرەکەت بۆ داگیرساندم، ئەو نهێنیەشت دەرخست کە ئەوە یەکەمین جارت نیە کە جگەرەیەک بۆ ئافرەتێک دابگیرسێنیت. من سوپاسم کردیت و ڕێک لەو کاتەدا تاریکیەک کەوتە سەر دەموچاوت، کە پێی وتم تۆ کەسێکیت و لە تەنگانەیەکدایت، کەسێکیت کە تاڕادەیەک بەدوای دۆزینەوەی





مرۆڤێکی تایبەتدا دەگەڕێیت و ڕێشێ تێدەچوو ئەو کەسە من بم، بۆ نا. ڕوم وەرچەرخاند و گەڕامەوە سەر مێزەکەی خۆم، ئەوەش چرکە و نیوێکی خایاند، لەپشتی ملمەوە هەستم دەکرد کە سەیرم دەکەیت، بەڵام بێگومان پێیدەچێت هەر بە خەیاڵ مەزەندەی ئەوەم کردبێت. لەو کاتەشدا کە پارەکەت خستە سەرمێزەکە و ویستت بڕۆیت، تاڕادەیەک بە دڵتەنگیەوە سەیرێکت کردم و بەدەست خواحافیزبوونیت لێکردم، بە شێوەی دەست ڕاوەشاندنەکەتدا دەمبینی کە تۆ لە خەیاڵی خۆتدا دڵنیایت کە هەرگیز یەکتری نابینینەوە. من دانیشتبووم لەسەر دەفتەری سکێچەکەم هێڵکاری دەموچاوی تۆم دەکێشا، چونکە سیمای تۆم بەدڵبوو، بەڵام تۆ هێندە بێ سەرنج بوویت کە نەتزانی من دانیشتووم و هێڵکاری دەموچاوی تۆ دەکێشم. بەو پەڕی کراوەییەوە خەندەیەکم بۆ کردیت، چونکە دەمویست بە چاوم پێت بڵێم کە ژیان سەرباری هەموو شتێک شتێکی سەیرو سەمەرەیە. تۆ ڕۆیشتیت، بەڵام هەستمدەکرد کە شتێکت لەگەڵ خۆتدا بردبێت، شتێک کە لەناو چاوی مندا بەدیت کردبوو. بەو شێوەیەدا کە پیتزەریەکەت جێهێشت، زانیم کە دەتەوێت بڕۆیت بۆ "ڤالا دای مولینی". بێگومان ڕێیتێدەچوو کە بەهەڵەدا چووبم، بەڵام بەهەڵەدا نەچووم. لەدڵی خۆمدا دەموت "تۆ کەسێکیت کە بەڕاستی پێم خۆش دەبێت کە بیناسم، هەڵبەتە ئەگەر بوارم هەبێت».

لەسەر تولە ڕێگا بچکۆلەکە وەستام و دوو جار چەپڵەم بۆلێدا، ئەوجا وتم "ئافەرم!". هەستمدەکرد زۆر بەباشی لێمتێگەیشتووە و هەستێکی خۆشبوو، پێم خۆشبوو یەکێک ئەوها بمبینێت و بمناسێتەوە، هەروەک ئەوەوابوو کە گەڕابێتمەوە ماڵەوە. زۆر زۆر دەمێک بوو کەسێکی وام نەبوو کە شایانی ئەوەبێت بگەڕێمەوە ماڵەوە بۆلای.





وتم؛ «یەکەمجار وتت "من بەرێکەوت داوای شقارتەم لێکردیت"، ئێستاکەش دەڵێیت "مەزەندەم دەکرد کە چەرخت پێنەبێت"»
پێکەنینی بە قسە کەمەکەم هات. ئەوە نیشانەیەک بوو بۆ ئەوەی کە من هەموو تاکە وشەیەکیم بە تەرازویەکی زێڕین هەڵسەنگاندووە.
وتی؛ «بەلایەنی کەمەوە ئەوەیان ڕێکەوتبوو کە چەرخەکەم غازی تێدا نەمابوو، بەڵام تۆ کەسێکی ڕێکەوت نەبوویت، تۆ وەک کتێبێکی کراوە وابوویت و من هەر لەویادا دەستمکردبوو بە خوێندنەوەی»
لەدڵی خۆمدا وتم "یان لەپێشەوە هەموو شتێکیان بەباشی تێگەیاندوویت"، بەڵام هەر خێرا ئەو خەیاڵەم لە مێشکمدا دەرهێنا.
من بەهۆی شتی ترەوە پرسیارێکم لێکرد و وتم؛ «چەرخی ترت پێیە؟»
لەمەبەستم تێنەگەیشت، لەبەرئەوە وتم؛ «هەمیشە چەرخێکی بەتاڵ و چەرخێکی پڕت لەگیرفاندایە؟»
تەماشایەکی کردم و بەهێواشی زلەیەکی لێدام. وابزانم هەقی خۆی بوو.
هێدی هێدی ڕێگەمان دەبڕی. هەتاوەکو دوو کەس قسەی زیاترێکیان هەبێت پێکەوە بیکەن، هێواشتر و هێواشتر بەڕێگادا دەڕۆن. زیاترێکی دەربارەی تابلۆ ئاویەکانی و پێشانگای داهاتووی بۆ باسکردم. هەروەها وتی وێنەی دوو حەکایەتی نایابی "گریم"م کێشاوە کە بۆ منداڵانە و لەو چەند ساڵەی دواتریشدا خۆشم خەریکی نوسین بووم.
سەرسام بووم. سەرم لەوەسوڕما کە تەنها لەو کاتەدا بۆمدەرکەوت کە نوسەرە، بەڵام هەستمکرد کە بەجۆرە شەرمێکەوە ئەو چەند وشەیەی دواتری وت، لەبەرئەوە نەمویست لەویادا هیچ شتێکی لەسەر باسبکەم. زۆرم لەو کەسانە دەناسی کە هەر ئەوەندەی دەیانوت خەریکی نوسینی شتێکم، یەکسەر کەمێک شەرم دایدەگرتن، بەڵام





ڕەنگە شەرمی لەوەکردبێت کە دوێنێ بەهیچ شێوەیەک باسی ئەوەی بۆ نەکردم.
هێندەم پێوت کە من بەرلەوەی بێم بۆ "ئامالفی"، لە پێشانگای کتێبەکەی "بۆلۆگنا" بووم. لەکاتی ئەو قسانەمدا زۆر بەوردی تەماشامکرد، بەڵام هیچ شتێکی نائاساییم تێدا بەدینەکرد. دەبوایە ئیتر چیتر بیرم لە "لویجی" نەکردایەتەوە. ئینجا وتی؛ «کەواتە تۆش کتێبی منداڵان دەنوسیت؟» سەرم بۆ لەقاند و دەستێکم بەقژیدا هێنا. زۆری بەلاوە ئاسایی بوو.

پاش نیو سەعاتێک گەیشتینە سەرەوەی "ڤیا پارادیسۆ"، لەوێدا چاومان بە کۆمەڵە هەورێکی هەر زۆر گەورە گەورە کەوت کە لە شاخەکانەوە بەرەو ئاسمانی دۆڵەکە دەهاتن. گوێمان لە دەنگی زەنگی گلێسەکانی "ئامالفی" بوو کە لە خوارەوە دەهاتن، یەک چرکە بەدوایدا زەنگەکانی "پۆنتۆنا" دەنگیان لێبەرزبووەوە، لە "پۆگیرۆلا"شەوە کە کەوتبووە سەر لوتکەی شاخەکانی ئەو پەڕی دۆڵەکەوە، دەنگی زەنگی کلێسەمان دەگەیشتێ. ڕۆژی جەژنی پاک بوو و کاتژمێر 12 بوو.
یەکەمین شریخەی هەورەگرمە هات و "بیبیتا" دەستی گرتم. داوام لێکرد بگەڕێینەوە، بەڵام ئەو سوربوو لەسەرئەوەی بەردەوامبین. خەیاڵم بۆ ئەوەچوو کە لەسەرەوەی دۆڵەکە پەیمانی لەگەڵ یەکێکدا هەبێت، دەشمزانی کە تەنها فەنتاسیای خۆمە و هیچی تر. لەو کاتەوەی "بۆلۆگنا"م جێهێشتبوو، بە بیست _ سی جۆری جیاواز شێوەی مردنی خۆمم داڕشتبوو. بەڵام "بیبیتا" لە هیچ یەکێک لەو پلانانەدا نەبوو. لە فرەلایەنەوە ئومێدەواربووم کە ئەو ڕزگارمکات لە



داهێنانەکانم. نەختە نەختە چاوەڕوانی ئەوەبووم کە بتوانێت بە شێوەیەک لە شێوەکان فێرمبکات وەک مرۆڤێک بژیم.
کاتێک کە لە پڕێکدا بەلێزمە دایکردە باران، هێندەمان نەمابوو بگەینە لای ئەو تاقگەیەی کە لەوەپێش بەلایدا تێپەڕین. "بییتا" ئامازەی بۆ پاشماوەکانی ئاشی کاغەز دروستکردنەکە کرد و بۆئەوەی تەڕنەبین بەپەلە ڕۆیشتینە ناویانەوە. هەتا توانیمان چووینە ناوەوە. هەروەک منداڵێکی بچکۆلە پێدەکەنی، زایەڵەی قاقاکانی بە توندی دەنگیدەدایەوە. لەژێر سەقفێکی سێ چوار مەتر دوجادابووین، بەڵام ئەو عەرزەی لەسەری دانیشتبووین وشکبوو.
پاش نەختێک خۆمان لەناو خراپترین شەستەباران و هەورەتریشقەدا بینیەوە کە لەژیانمدا وێنەیم نەدیبوو، یان دەتوانم بڵێم باشترین باران و هەورەتریشقەی ژیانم بوو، چونکە هەرزوو هەردوکمان وتمان کە حەزمان لە بارانی زۆر و هەورەتریشقەیە. زۆر بەلێزمە دەباری.
زیاد لە دوو کاتژمێر باران باری. بەبێ وەستان هەر دەباری، بەڵام ئێمە شوێنەکەمان وشکبوو و تەڕنەبووین. وتم لەوە دەچێت لە چاخە بەردینەکاندا بین و لە ئەشکەوتێکدا دانیشتبین. «لێرەدا نە ڕابوردوو و نە داهاتوش بوونی هەیە، هەموو شتێک تەنها ئێستە و ئێرەیە»، دەنگم هەروەک ئەوەی لە ئەشکەوتێکدا قسەبکەم، دەنگی دەدایەوە. لەناو دەستمدا دانیشتبوو و دیسانەوە وتی "ڕۆمانەکەت دەربارەی چیە؟". ئەوجا وتی "ئێ خۆ ئێستاکە کاتی ئەوەت هەیە کە بۆم باسبکەیت". ڕازیبووم و یەکێک لەو چیرۆکانەم هەڵبژارد کە دامنابوون بۆ فرۆشتن، هەڵبەتە پێش ئەوەی "یاریدەدەری نوسەر" هەرەس بهێنێت، چیرۆکێک بوو دەربارەی نەهامەتی ڕەچەڵەکێکی دیاریکراوبوو. من بیرۆکەی سەرەکی چیرۆکەکەم لەمێشکدابوو و لەوێدا







کردەمەوە و کەوتمە گێڕانەوەی، بەشێوەیەکی گشتی باسی چیرۆکەکە بەم شێوەیە بوو؛

هەر لەدوای شەڕی جیهانی دوهەمەوە خێزانێکی دەوڵەمەند بەناوی "کیاگۆ" لە خانویەکی دێرینی شاری "سیلکەبۆ"ی بەناوبانگی دانیمارکدا دەژیان. کارەکەرێکی نوێیان لەماڵەکەیاندا دامەزراندبوو و ناوی "لۆدە" بوو، بەڵام ناوی باوباپیری دیارنەبوو، چونکە کچێکی بێ دایک و باوک بوو. تەمەنی 17_16 ساڵان بوو و هێشتام بەڕەسمی لە کڵێسەدا نەبووبوو بە مەسیحی. کچەکە لە ڕادەبەدەر جوانبوو، لەبەرئەوە شتێکی سەیرنەبوو کە کوڕە تاقانەکەی "کیاگۆ" نەیدەتوانی چاوی لەسەر هەڵگرێت، بەردەوام ئیش و کاری بێکۆتایی ماڵەکەی هەڵدەسوڕاند و کوڕەکەش هەر چاوێکی لەسەربوو. وەک کلکێک لە ماڵەکەدا هەمیشە هەر بەدوای کچەکەوەبوو. تەمەنی کوڕەکە هێشتام هێندە زۆر نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ژوری جل شوشتنەکەیاندا فریویدەدا و لەو کاتەدا کە خەریکی جل کوڵاندن دەبێت زەفەری لێدێنێت. تەنها ئەو کەڕەتە شتێکی لەو بابەتە ڕوودەدات، بەڵام کچەکە دوو گیاندەبێت.
بۆ ماوەی چەند ساڵێکی دواتر بەدەیان چیرۆک دەربارەی ڕوداوی ئەو پاشنیوەڕۆ شومەی ناو ژوری جل شوشتنەکە دەماودەمی دەکرد. لە ژێرەوە دەیانوت کوڕەکە، کە ناوی "مۆرتن" بوو، لەو کاتەدا کە کچەکە خەریکی ئەمدیودیوکردنی جلەکانی ناو تەشتەکەبووە، دەستی درێژکردۆتە سەر کچەکە و زەفەری لێهێناوە. بەڵام خێزانی "کیاگۆ" سوربوون لەسەرئەوەی کە "لۆدە" بەرەڵابووە و دەیانوت ئەو کوڕەکەمانی فریوداوە. زۆریش بوون ئەوانەی کە دەیانوت لەماڵەکەدا



کچەکەمان بینیوە و هەمیشە لەو کاتانەدا کە کوڕەکە لەدەوروبەری بووە، کەوتۆتە حیلکەحیلک و پێکەنین، دەیانوت کچەکە هەر بەشێوەیەکی گشتی کچێکی سەنگین نەبووە.

خێزانەکە زۆر بەنهێنی هەموو شتێک ڕێکدەخەن و کچە کارەکەرەکە دەنێرنە لای خێزانێکی تر لە خواروی "یولاند". بەڵام "لۆدە" لەپاش چەند مانگێک کوڕێکی دەبێت و خێزانەکەش منداڵەکەی هەڵدەگرنەوە، چونکە دەڵێن لە هەموو بارێکدا منداڵەکە خوێنی باوباپیرانمانی هەڵگرتووە، ڕاستە وەک سامان و دەوڵەمەندی لە هیچ شتێکیان کەمنەبوو، بەڵام خێزانی "کیاگۆ" لە منداڵدا زۆر هەژاربوون، لەبەرئەوە نەیاندەویست تەنانەت دڵۆپێکی خوێنە گرانبەهاکەیان بە فیرۆ بدەن. "لۆدە" هەتا بۆی کرا بەرەنگاریان بووەوە و گریانەکەی جەرگی دەبڕی، چونکە تەنها پاش دوو حەفتە منداڵەکەیان لێسەند، بەڵام ئەوان دەیانوت منداڵی پێ بەخێو ناکرێت، هەم وەک لایەنی مەسرەف و هەم وەک لایەنی ڕۆحیش. جگەلەوەش کوڕەکەی باوکی نەبوو.

بێگومان "مۆرتن" نەیدەویست بە هیچ جۆرێک بەرپرسیاری منداڵە ساواکە هەڵبگرێت، بگرە هەر زۆر گەنجیشبوو بۆ ئەوەی باوکایەتی خۆی بسەلمێنێت. لەلایەکی تریشەوە دایک و باوکی لەتەمەندا بوون و نەیاندەتوانی منداڵەکە وەک منداڵی خۆیان بەخێوبکەن. بەڵام "مۆرتن" مامێکی هەبوو کە لەگەڵ ژنەکەیدا منداڵیان نەدەبوو، ئیدی مامی و ماموژنەکەی کوڕە بچکۆلەکەیان خستە ئەستۆی خۆیان و هەڵیانگرتەوە، ناویشیان نا "کاستن".

"کاستن" گەورەبوو و هەندێجار خورپەیەک بەدڵیدا دەهات و لەدڵی خۆیدا دەیوت "دەبێت ئەو کاتەی کە من لەدایک بووم، دایک و باوکم







لەتەمەنێکی زۆردابووبن". دەبێت ئەوکاتە دایکی نزیکەی 50 ساڵێک بووبێت، بەڵام قەت ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات کە "یاکوب" و "ستینا"ی مام و ماموژنی، دایک و باوکی ڕاستەقینەی خۆی نەبن. هەمیشەش لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا کارتێکی پیرۆزبایی لە "مۆرتنی کوڕە مامەوە" بۆ دەهات، هەتا ئەو کاتەش کە لە کڵێسەدا بوو بە مەسیحی لە هەموو جەژنێکی لەدایکبوونی مەسیحدا دیارییەکی بچکۆلەی بە پۆستدا بۆ دەنارد، بەڵام هەرگیز هێندەی بەخەیاڵدا نەهات کە ئەو کوڕە مامەی کە هەژدە ساڵ لە خۆی گەورەتربوو باوکی ڕاستەقینەیەتی. ئەو شتە نهێنیەکی خێزانەکەبوو، زۆر بەباشی دایانپۆشیبوو و لێیان شاردبووەوە.

"یاکوب" کەبتاینی کەشتیەکی شت و مەک هەڵگری گەورە بوو، "کاستن" لەسەردەمی منداڵیدا جارجارێک لەگەڵ باوکیدا بەکەشتی سەفەری بەملاولای جیهاندا دەکرد. کوڕەکە زۆر پەیوەستی دایک و باوکی بوو، لەڕاستیشدا تاقانەبوو و لە هەموو شتێکی تری دونیا زیاترێکیان خۆشدەویست. بەڵام کاتێک "کاستن" لەپۆلی شەشی ئامادەیی بوو، "ستینا" و "یاکوب" یەک بەدوای یەکدا بە نەخۆشی مردن، تەنها چەند مانگێکی کەمیان بەینبوو. بەو شێوەیە لەناکاوێکدا "کاستن" وەک کەسێکی بێ دایک و باوک مایەوە ـبێ خێزانیش، چونکە ئەو کاتە نەنک و باپیرەشی کۆچی دواییان کردبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کاتەی "یاکوب" لەسەرەمەرگدا دەبێت، هەموو شتێک بۆ کوڕەکەی دەگێڕێتەوە، چیرۆکی ناو ژوری جل شوشتنەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، باسی کارەکەرەکە و "مۆرتن"ی کوڕی مامی بۆ دەکات، کە لەڕاستیدا باوکی ڕاستەقینەی بوو.





لەو کاتەدا "کاستن" بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی لەگەڵ کوڕی مامەکەیدا نەبوو. چەند ساڵێکی زۆر بوو یەکتریان نەدیبوو. لە دانیشگای "ئۆغوس" دەیخوێند و یەک کەڕەت زۆر بێ پارە دەبێت. سەری لێدەشێوێ و ناچاردەبێت هانا بۆ "مۆرتن" بەرێت، بێگومان ئەو سور دەیزانی کە "کاستن" کوڕی ڕاستەقینەی خۆیەتی، زۆر دڵنیاشبوو کە تەنها خۆی ئەو ڕاستیە دەزانێت، چونکە "ستینا" و "یاکوب"یش کۆچی دواییان کردبوو.

"مۆرتن" ئەو کاتە لە خەستەخانەی "ئۆغوس"دا وەک سەرۆکی پزیشکەکان دامەزرابوو و لەناو خەڵکیدا جێگەیەکی تایبەتی هەبوو و ڕێزێکی زۆری لێدەگیرا. ژنێکی جوانی هێنابوو و ناوی "مالینا" بوو، کچی دادوەرێکی دادگای باڵای کۆبنهاگن بوو، دوو کچی نازداریان هەبوو و هەردووکیان لە کۆڕاڵی کلێسەدا گورانیان دەوت. "مۆرتن" نیازی نەبوو "کوڕی مامەکەی" بخاتە ناو ژیانی پڕلە پلەوپایەی بەرز و بێ خەوشیەوە، بەتایبەتیش هەموو پاشینە و بنەمای ناخۆشی خێزانی کوڕەکەی دەزانی.

"کاستن" بەبێ ئەوەی پێی بڵێ کە ئەویش هەقیقەت دەزانێت، داوای کۆمەکی قوتابیانی لە کوڕی مامەکەی دەکات، وتی "ئەگەر کۆمەکیشم ناکەیت ئەوا قەرزێکی پچکۆلەی 5هەزاری یان 10هەزاریم بدرەیێ"، ئەو دەیزانی کە کوڕی مامەکەی یەکجار دەوڵەمەندە. بەڵام "مۆرتن" یەکسەر بەبێ سێ و دوو داواکەی "کاستن" ڕەتدەکاتەوە. بەفیزەوە داوای ئەو گەنجە کەساسە ڕەتدەکاتەوە و لەو بارە ناهەموارەی ژیانیدا دەستی یارمەتی بۆ درێژناکات. پێکێک ویسکی نایابی بۆ تێدەکات و یەک دوو بەسەرهاتی پێکەنیناوی ڕابوردویانی بۆ دەگێڕێتەوە، دواتریش بەرلەوەی بەشێوەیەکی گشتی هیوای





سەرکەوتنی لە خوێندنەکەیدا بۆ بخوازێت و پاڵی پێوە بنێت، 500 کرۆنیەک دەخاتە دەستیەوە. بەڵام "کاستن" _کە هەر بەرلەوەی بێتە میوانی، تاڕادەیەک ڕقی لە باوکە ڕاستەقینەکەی بوو، چونکە بۆ ماوەی چەندەها ساڵ بەشێوەیەکی ناسروشتی خۆی نواندبوو_ ئاوڕێک لە کوڕی مامەکەی دەداتەوە، ڕێک تەماشای ناوچاوی دەکات و پێی دەڵێت؛ «شەرم لەوە ناکەیت کە قەرزێکی چەند هەزاری کەم بە کوڕەکەی خۆت نابەخشیت؟ ڕەنگە جاری داهاتوو بچم قسە لەگەڵ "مالینا"دا بکەم». "مۆرتن" واقیدەوڕمێت، بەڵام ئیدی "کاستن" ڕوی لێ وەردەچەرخێنێت و لەو کاتەدا کە بەجێی دەهێڵێت دەڵێت؛ «ئێستاکە ئیدی لەوەندە زیاتر لەسەر ئەو باسە ناڕۆین!»

پاش چەند ساڵێکی خوێندی ناهەموار، "کاستن" کچێک بەناوی "کریستینا"وە دەناسێت، لەو کاتەش بەدواوە نزیکەی هەموو سەرنجی دەبەخشێتە ئەو. لەماوەی ئەو چەند ساڵەی ڕابوردودا تەنها یەک کەڕەت تەلەفون بۆ "مۆرتن" دەکات و کەڕەتێکیش بۆ "مالینا"، بەڵام هەردوو جارەکە "مۆرتن" تەلەفونەکە هەڵدەگرێت. "کاستن" بەدڵنیاییەوە یەک شت دەزانێت؛ هەرگیزا و هەرگیز چیتر نایەوێت داوای پارە لە کوڕی مامەکەی بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەک دوو جارێک چەکێکی بە پۆستدا بۆ ڕەوانە دەکات. ئەو کاتەش کە "کاستن" "کریستینا"ی دەهێنێ، چەکێکی 5 هەزار کرۆنیان بۆ دێت، "مۆرتن"ی کوڕی مامی و "مالینا" و "مارین" و "ماتیلدە" بۆیان دەنێرن. بەڵام ئەو پارانە لە توڕەیی و پەستی "کاستن" بەرامبەر بە باوکە ڕاستەقینەکەی کەمناکاتەوە، هەر لەگەڵ ئیمزاکردنی ژنهێنانەکەیدا نازناوی خێزانی "کریستینا" لەبری نازناوی خێزانی خۆی





هەڵدەبژێرێت. خێزانی "کریستینا"ش لەدڵەوە پێشوازی لێدەکەن و قبوڵی دەکەن.

"کاستن" "کریستینا"ی ژنی خۆشدەوێت و هەرلەو رۆژەوەی کە ناسیبووی هەستیدەکرد پێویستی بە هیچ جۆرە پەیوەندیەکی تر نەبێت. بەڵام چارەنوس واز لەو کەسانە دەهێنێت کە خۆیان دەدەن بەدەستیەوە و ئەو کەسانەش لەگەڵ خۆیدا دەبات کە بەرەنگاری دەبنەوە؛ "کاستن" هەر لەگەڵ لەدایک بوونیەوە نیشانەیەکی زگماکی ناشیرین بە پشتی ملیەوە بوو، بەڵام لە ناکاودا هەر لە خۆیەوە خوێنی لێدێت، "کریستینا"ش داوای لێدەکات بچێت پیشانی پزیشکێکی بدات. پزیشکی ناوچەکە نیشانەکە لێدەکاتەوە و هەروەک رۆتینێکی ئاسایی بۆ شیکردنەوەی زیاتر رەوانەی خەستەخانەی "ئۆغوس"ی دەکات. بەڵام لە نەگبەتی ئەودا ئەنجامی شیکردنەوەی خانەکانی لە خەستەخانەوە نانێرنەوە بۆ دکتۆری ناوچەکە. چەند حەفتەیەک و چەند مانگێک تێدەپەڕێت و "کاستن" هیچ وەڵامێکی نە لە پزیشکەکەوە پێدەگات وە نە لە خەستەخانەشەوە. لەبەرئەوە "کاستن" و "کریستینا" چیتر بیر لەو نیشانە ناشیرینە ناکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە بەهاردا "کاستن" نەخۆشدەکەوێت، دەردەکەوێت کە نەخۆشی شێرپەنجەی هەیە و بەلەشیشیدا تەشەنەی کردووە، هەرخێرا نەخۆشیەکەی بەو شیکردنەوەی شانانەوە گرێدەدەنەوە کە چەند مانگێک لەوەوبەر رەوانەی خەستەخانەیان کردبوو.

پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا خەستەخانە دان بەوەدا دەنێت کە شیکردنەوەیەکی "کاستن"یان پێگەیشتووە و لە ئەنجامیشدا دەرکەوتووە کە وەرەمی ترسناکی "میلانۆم"ی تێدابووە، بەڵام لایەنەکەی تری وەک مەتەڵێک دەمێنێتەوە و کەس نازانێت بۆچی





پزیشکی ناوچەکە هیچ وەڵامێکی لە خەستاخانەوە پێنەگەیشتووە بەشێوەیەکی رەسمی "مۆرتن کیاگۆ"ی سەرۆکی پزیشکان بەرپرسیاری ئەو لایەنەدەبێت، بەڵام لەوەدەچێت هیچ پەیوەندیەکی بەو حاڵەتە دیاریکراوەوە نەبێت، زیاترێک وا رێی تێدەچێت کە یاریدەدەرێکی ئەزمونگەکە بەبێ مەبەست کەمتەرخەمی کردبێت. رۆژنامەی رۆژانەی "ئۆغوس" پەیامێکی بچکۆلەی بڵاودەکاتەوە و وەک ناونیشانێک دەنوسێت؛ "ئەو سەرۆکی پزیشکەی کە ئاگادار نەکرایەوە، لەبەرئەوە دەرفەتی رزگارکردنی کوڕی مامەکەی لەدەستدەدات"، بەڵام هەر زوو باسەکە لەیاددەکرێت.

"کاستن" لەدوای نەخۆشیەکەیەوە تەنها ماوەی چەند حەفتەیەکی کەم دەژی. لەماڵەوە لە جێگادا دەکەوێت و "کریستینا" و دایک و باوکی تا ئەو پەڕی توانایان خزمەتی دەکەن. جگەلەوانیش ستەرێک رۆژانە سەریان لێدەدا و یارمەتی و کۆمەکیان دەکات. ستەرەکە ناوی "لۆدە" دەبێت. ئەو کاتەش کە "لۆدە" بەتەواوەتی شوێنی نیشانەکەی دەبینێ، جارێکی تریش بۆ دڵنیایی تەماشای رۆژی لەدایک بوونی "کاستن" دەکاتەوە. ئەو کاتە تەنها چەند رۆژێکی کەمی لەژیاندا ماوە، بەڵام لەو چرکەیەوە شەو و رۆژ بەبەردەوامی لەلای جێگاکەیەوە دادەنیشت و دەستی دەگرێت، هەتا ئەو کاتەی کە گیانی دەردەچێت. "کاستن" بەرلەمردنی چاوی دەکاتەوە و تەماشای "لۆدە" و "کریستینا"ی دەکات و وەک دوا قسەی دەڵێت؛ «ئێستاکە ئیدی لەوەندە زیاتر لەسەر ئەو باسە ناڕۆین!».

دانیشتبووم و دەستمکردبووە ملی "بیبیتا"، زیاتر لە کاتژمێرێک بوو چیرۆکم بۆ دەگێڕایەوە. هیچ وشەیەکی لەدەم نەهاتە دەرەوە،





تاڕادەیەک گوێم لە هەناسەدانیشی نەبوو. بەڵام ئەو کاتەی کە لە چیرۆکی "کاستن" بوومەوە، سەیرێکی کردم و وتی؛ «چیرۆکێکی سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام لەهەمان کاتیشدا چیرۆکێکی ترسناک بوو. هاوکات سەرنجڕاکێش و ترسناکیش بوو». ئەو گوێگرێکی باشبوو و بەدڵ گوێی بۆ شلدەکردم. من هەرئەوەندەی بیرۆکەیەکی داڕێژراوم هەڵبرژشتایە، ئیدی کردنەوەی چیرۆکەکەم بەلاوە سەخت نەبوو، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتەدا بەلامەوە ئاسانبوو کە لەگەڵ "بیبیتا"دا دانیشتبووم، لەکوێشدا، لەناو پاشماوەیەکی دێرینی ئاشێکی کاغەز دروستکردندا و بەردەوامیش هێز و درامام لە شریخەی هەورەتریشقەی یەک لەدوای یەکەوە بۆ دەهات. دیسانەوە وتیەوە کە ڕۆمانێکی نایابی لێدەردەچێت و دڵنیابوو لەوەی کە وەریدەگێڕنە سەر ئەڵمانی. دواتریش وتی "زۆرم پێخۆشدەبێت بیخوێنمەوە".

هەورەبروسکە و هەورەتریشقە هەر بەردەوامبوو و بارانێکی بەلێزمەش هەرووەک پێشوو دەباری، بەڵام ئەو چیرۆکەی کە گێڕامەوە کۆمەڵێک ئەندێشەی زۆری هێنایە پێشەوە و هەستمکرد لە شوێنی خۆیدا نەبێت کە چیرۆکێکی تر بگێڕمەوە. جگەلەوەش خۆ من نەمدەتوانی لە یەک کاتدا لەسەر دوو ڕۆمان کاربکەم، ئەو کاتە ڕەنگبوو باوەڕم پێنەکات.

دانیشتبووین و باسی وردەکاری ناو چیرۆکەکەمان دەکرد. بەشێوەیەک خۆم پیشانی "بیبیتا"دا کە هەستبکات چەند ئامۆژگاریەکی بەسودم دەداتێ، وا هەستیدەکرد کە ئەگەر من ئەو ڕۆمانە بنوسم، ئەوا سودێکی زۆر لەو خاڵانە وەردەگرم کە ئەو ئاماژەی بۆ دەکردن. زیاترێک لێم نزیکبووەوە، دەستێکی خستە دەستمەوە و یەک دوو جارێک ماچی لاملی کردم. وابزانم من زیاترێک بەجۆش و خرۆشەوە





کەوتمە ماچکردنی، بەڵام هیچ لاریەکی لێنەبوو. «ئێستاکە کەمێک بێشەرمین؟» بەچرپەچرپ هێندەی پێوتم و جلەکانی داکەند. لەبەر ڕوناکی شینباوی ئەو ئاو و هەوایەدا هەرووەک کارێکی هونەری "ماگریتا" دەهاتە بەرچاو. بەهێواشی لەسەر خشتی عەرزەکە پاڵکەوتین.

هیچ چارەیەکمان نەبوو. نەمانتوانی بەرەنگاری ئەو هێزە سروشتیە هەڵچووە ببینەوە. ئەگەر لەژێر ئەو بارانە بەلێزمەیەدا، لە ژێر ئەو هەورەگرمانەدا لەگەڵ یەکدا نەخەوتینایە، ئەوا ڕەوشتێکی خراپمان نیشانددەدا. وەک ئەوە وادەبوو کە ڕێز لە دەنگی سروشت نەگرین. گەر پێکەوە نەخەوتینایە، ئەوا ڕێک وەک ئەوە وادەبوو کە نکۆڵی لە سروشت بکەین و نەهێڵین بەئاڕاستەی خۆیدا بڕوات.

هەتا ئەو کاتەی هەورەتریشقەکان خامۆش بوونەوە، لەتەنیشت یەکەوە پاڵکەوتبووین. بۆنی هەڵوژە و گێلاسی لێدەهات و پێویستی نەدەکرد هیچ شتێک بوترێت. هەربەو شێوەیە پاڵکەوتبووین هەتا ئەو کاتەی کە بەتەواوەتی بارانەکە خۆشیکردەوە، ئەوجا لەتەنیشتمە دانیشت و وتی؛ «ئێستاکە کاتی ئەوەیە کە خۆمان بخەینە ژێر دوشەکەوە!» سەیربوو بەلامەوە کە وای وت، چونکە ڕێک لەو کاتەدابوو کە دوشەکەیان گرتبووەوە و چیتر ئاو لە ئاسمانەوە نەدەهاتە خوارەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستایە سەرپێ و منیشی لەگەڵ خۆیدا ڕاکێشا. هەر بەڕوت و قوتی ڕامانکردە سەر تولەڕێگاکە، سەرماشمان نەبوو. "بیبیتا" بەرەو تاڤگەکە ڕایکێشام و وتی "تۆ خۆت پەیمانت دامێ". پاش یەک دوو چرکەیەک لەژێر ئاوی تاڤگەکەدا بووین و گۆرانیمان دەوت. لەپێشدا "بیبیتا" دەستیکرد بە گۆرانی و ئۆپێرای "نزای نۆسکا"ی "پۆنتشینی" وت، من هەڵبژاردنەکەیم بەلاوە





سەیربوو، لەبەرئەوە بە ئۆپێرای "توراندۆت" وەڵامم دایەوە و بەلامەوە باشترێک لەگەڵ ئەو کاتەماندا دەگونجا. بەڵام ئەو هەر بەردەوام ئۆپێراکەی خۆی دەوت؛ «پێرچێ، پێرچێ، سیگنۆرێ؟» من بەلامەوە خۆشبوو کە شارەزای ئەدەبیاتی ئۆپێرابوو. سەری نەسوڕماندم، بەڵام بەدڵمبوو و نرخی تایبەتی خۆی هەبوو لەلام. نازانم بۆچی لە ناکاودا دەستمکرد بە وتنی گۆرانیەکی کۆنی منداڵان، ڕەنگە لەبەرئەوە بوویێت کە زۆر دڵشادبووم. من لەسەردەمی منداڵیمەوە بیرم لەو گۆرانیە نەکردبووەوە، بەڵام تێستەکەی بەم شێوەیە بوو؛ «"پیتەر"ە بچکۆلەی جاڵجاڵۆکە بەدیوارێکدا سەردەکەوێت، بەڵام بارانێک دەبارێت و "پیتەر" دەخزێتە خوارەوە. ئینجا خۆر هەڵدێت و دەیدا لە لەشی، "پیتەر"ە بچکۆلەی جاڵجاڵۆکە دیسانەوە بەدیوارەکەدا سەردەکەوێتەوە»

دواتر ڕامانکردەوە ناو پاشماوەکان و جلەکانمان لەبەرکردەوە. کاتێکیش کە گەڕاینەوە سەر تولەڕێگاکە، خۆر دیسانەوە هەڵهاتبووەوە. هەستمان بە شەرم نەدەکرد. تەنها شتێک کە کەمێک شەرمم لێدەکرد، وتنی ئەو گۆرانیە کۆنەی "پیتەر"ە پچکۆلەی جاڵجاڵۆکە بوو. خۆشبەختانە هیچ پرسیارێکی دەربارەی ئەو گۆرانیە لێنەکردم، وابزانم زۆر بەباشی گوێی لێنەبوو، بەڵام من پەشیمان بووم لەوەی کە هێندە بێئاگابووم. هەستمدەکرد دیسانەوە گەڕاومەتەوە بۆ پیتزەری "ماگیۆری"ەکەی شاری "بۆلۆگنا".

ڕێک لەو کاتەدا کە لەڕووبارەکە پەڕینەوە و بەبەرزاییە چاڵ و چۆڵەکەدا سەرکەوتین، "بیبیتا" کەڵکی لە کالەکانی پێی وەرگرت. پاش کاتژمێرێک گەیشتینە بەرزاییەک کە پێیان دەوت "لوسیبێللۆ". لەوێوە شاری "ئامالفی" کەوتبووە خوارەوەمان و دەشمانتوانی زۆرینەی





نیمچە دورگەی "سۆرینتۆ" ببینین. "بیبیتا" دانەویەوە و چەپکێک گوڵی "سێ پەڕە"ی چنی، ئەوجا دەستی بۆ ڕاکێشام و وتی؛ «فەرموو، ئەوە چەپکە گوڵی جەژنی پاکە». منیش وتم لە هەندێ زماندا بەو ڕەگەزی گوڵە زەردە دەڵێن "پێڵاوی ئاڵتونی ماریا". زۆر جاریش لە زمانی ئینگلیزیدا پێی دەڵێن "پێڵاوی منداڵان"، ئەوجا هۆکەشم بۆ ڕونکردەوە. نەختە نەختە بۆ خوارەوە بەرەو "پۆگیرۆلا" کەوتینە ڕێ، چەپکێک گوڵی "پێڵاوی ئاڵتونی ماریا" بەدەستێکمەوە بوو و دەستی "بیبیتا"ش لەدەستەکەی ترما بوو. پاش نەختێک "بیبیتا" وتی؛ «دەتوانین ببینە ژن و مێرد و منداڵیشمان ببێت». بەمانای وشە مەبەستی نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشبوو گوێم لەو قسەیە بێت. هەروەک چۆن دوێنێ بەمانای وشە مەبەستی نەبوو کە وتی بابڕۆینە ژێر ئاوی تاڤگەکە، ئەو قسەیەشی هەر شتێک بوو لەو بابەتە. منیش لەوەڵامدا وتم "پێم خۆشدەبێت ئەگەر لەگەڵما بێیت بۆ ناوچەیەکی سەر ئۆقیانوسی ئارام". "بیبیتا" تەماشایەکی کردم و پێکەنی. بەڵام تازە قسەکەم کردبوو.

لە "پۆگیرۆلا"دا چووینە بارێکەوە و داوای سەندەویچێک و بتڵێک شەرابی سپیمان کرد. لەدەرەوە دانیشتین و چێژمان لەو دیمەنە قەشەنگە دەبینی، قاوە و مەشروبی لیمۆ و براندیمان خواردەوە. پەرداخێک ئاویشیان بۆ چەپکە گوڵەکەی دەستم هێنا.

لەو کاتەدا کە بە پلیکانە خواروخێچەکاندا بەرەو "ئامالفی" خلدەبووینەوە وتی؛ «باشە تۆ لەلایەکەوە ڕۆمان دەنوسیت، بەڵام وەک وتت لە دەزگایەکی چاپەمەنیشدا کاردەکەیت، سەخت نیە بەلاتەوە هەردووکیان پێکەوە ئەنجامبدەیت؟»





ئەو چیتر نەیدەویست هەروا بۆ خۆشی قسەم لەگەڵدا بکات، لەوێدا بەڕاستی دەیویست بزانێت کە من کێم.
لای خۆمەوە بڕیارمدا و وتم ئەگەر دیاردەی "جاڵجاڵۆکە"کەی بیستبێت، ئەوا ڕێک هێندەی بۆ باسدەکەم کەلەوە تێبگات کە من "جاڵجاڵۆکەکە"م. وتم من یارمەتی نوسەرانی ترمداوە کە بنوسن، باسی ئەوەشمکرد کە هەندێ جار بیرۆکەیەکم داونەتێ کە دەربارەی بنوسن، وتم بەدەرلەوانەش تێبینیم داونەتێ کە بەردەوامی پێبدەن و بیکەنە نوسین. ئەوجا وتم؛ «من هەمیشە فەنتاسیاکانم لە پێویستی خۆم زیاترێک بوون». دواتر وتم ؛«فەنتاسیا کەرەسەیەکی خاوی هەرزانە». بەڕاستی واموت، وتم "فەنتاسیا کەرەسەیەکی خاوی هەرزانە".
دیاربوو قسەکەم کاری لە "بیبیتا" کردبوو. ئەندێشە گرتبووی و بێدەنگ بوو، بێدەنگیەکەیم بە چەند شێوەیەکی جیاواز لێکدەدایەوە. وا لەدواجاردا بۆی دەرکەوت کە من "جاڵجاڵۆکە"کەم، وە هێشتام ڕێشی تێدەچوو کە ئەو کەسانە ناردبێتیان کە پلانەکەیان بۆ دانابووم. بەلایەنی کەمەوە پێیدەچوو وتارە کورتەکەی ناو ڕۆژنامەی "کۆریرێ دیللا سیرا"ی خوێندبێتەوە، چونکە خۆی بەشتێکی پێویستی دەزانی کە کتومت ئەو ڕۆژنامەیە بخوێنرێتەوە، هەڵبەتە ئەگەر بمانەوێت کەم تازۆر ئاگامان لە دونیا بێت، بەتایبەتیش ناوی لاپەڕەی کەلتوری هێنا. مەرجیش نەبوو بێدەنگیەکەی پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە ناوی "جاڵجاڵۆکە"کەی بیستبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بابەتێکی زۆری کەوتبووە بەردەست کە بیری لێبکاتەوە، چونکە من باسی پیشەیەکی سەیر و نامۆم بۆ کرد.





کەمێک زیاتر باسی فەنتاسیا و "یاریدەدەری نوسەر"م بۆ کرد. جارجارێک سەری بۆ ڕادەوەشاندم و لەوەدەچوو هێدی هێدی زیاتر و زۆرتر دوودڵی و نیگەرانی بیگرێت. بڕیارێکی گەورە و بەرفراوانمدا و وتم "دەمەوێت ئەو شتانە بخوێنیتەوە کە لەماوەی چەند ڕۆژی پێشودا لە ئوتێلەکەدا نوسیومن"، هەروەها وتم "دەتوانم بۆت وەریبگێڕمە سەر زمانی ئەڵمانی". من نەمدەویست هیچ نهێنیەک لە "بیبیتا" بشارمەوە. ئیدی دەمویست کۆتایی بە هەموو شێوەیەکی خەیاڵلێدان بهێنم. دیسانەوە لەدڵی خۆمدا بیرم لەوەدەکردەوە کە هەردووکمان پێکەوە سەفەربکەین و لە کیشوەرێکی تردا نیشتەجێببین، ئێ خۆ ئەو هەر لەو کاتەوە شوێنی خۆی بۆ ماوەی هەموو هاوینەکە لە خواروی ئیتاڵیادا کردبووەوە. بڕیارمدا لەوەبەدواوە هەوڵبدەم ژیانم وەک مرۆڤێکی باش و ڕێک و پێک بەسەربەرم. خۆم بە خۆمم دەوت "تەنها یەک کەرەت دەژیم و دەمەوێت بەمانای وشە ئەو ماوەیەی کە ماومە بژیم ".
کاتژمێر بووبە شەش. لەپاش ئەو هەموو پیاسە و شەرابە، قاچەکانم هیلاک بووبوون. لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین لە شوێنێکدا دابنیشین و تەماشای خۆر ئاوابوون بکەین. "بیبیتا" هێندە زۆر قسەی نەکرد و پاش نەختێک دەستمکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکێکی دورودرێژ. لەکاتی گێڕانەوەدا زوو زوو سەیری ئەوم نەدەکرد، وابزانم زیاتر لەبەرئەوەبوو کە لەکاتی گێڕانەوەدا چیرۆکەکە دروستدەبوو. وردەکاری چیرۆکەکەم لەیاد نیە، بەڵام هێڵە سەرەکیەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەبوو؛



گەلێ ساڵ لەوەوبەر سێرکێکی گەورە لەشاری "ئولم" لەنزیک ڕوباری "دانوب"دا خێمەکەیان هەڵدەدەن. بەڕێوەبەری سێرکەکە پیاوێکی بەشکۆ و بەڕێزدەبێت، هەرزوو لەگەڵ کێچکی پەتبازی جوانی سێرکەکەدا بە ناوی "تێری"یەوە دەکەوێتە عەشقێکی قوڵەوە. خوازبێنی دەکات و پاش ساڵێک کچێکی دەبێت، ناوی دەنێت "پەنینا مەنینا". ئەو خێزانە بچکۆلەیە بەئاسودەیی لە کەرەڤانەیەکی پەمەیی سێرکدا دەژین، بەڵام هەر بۆ ماوەیەکی کورت بەو شێوەیە دەمێننەوە، چونکە تەنها پاش ساڵێک لەدوای لەدایکبوونی کچەکەیان "تێری" لەسەر پەتەکە دەکەوێتە خوارەوە و یەکسەر گیانی دەردەچێت. بەڕێوەبەری سێرکەکە خەفەت و قەهری لەدەستدانی ژنەکەی لەیاد ناکات، بەڵام خۆشەویستی بۆ کچەکەی لەگەڵ گەورەبوونیدا زیاتر و زۆرتر دەبێت. بێگومان دڵی بەوە خۆشە کە "تێری" بەر لە مردنی ناکاوی منداڵێکی پێبەخشی. یادگاریەکی زیندووی لە ژنەکەیەوە بۆ مابووەوە، چونکە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا شێوەی کچەکەی زیاترێک دەچووەوە سەر دایکی. هەر لەو کاتەوەی کە تەمەنی ساڵ و نیوێک بوو لە شوێنێکی دیاریکراوی سێرکەکەدا دادەنیشت و زۆر بەسەرنجەوە لەگەڵ نمایشتەکاندا دەڕۆشت. جارجارێک لە پشوەکاندا یەکێک لە گاڵتەبازەکانی سێرکەکە پەشمەکێکی بۆ دەهێنا، وە بەر لەوەی تەمەنی ببێتە سێ ساڵ بەبێ یارمەتی هیچ کەسێک خۆی دەچووە شوێنی خۆی و دەشگەڕایەوە. بینەرانی سێرکەکە و کارمەندانی سێرکەکەش هەرزوو وتیان ئەو کچە خێر و بەرەکەت بەسەر سێرکەکەدا دادەبارێنێت، جارجارێک ئەو خەڵکەی کە نمایشتێکی دیاریکراویان بینیبوو، کەڕەتێکی تر دەهاتنەوە بۆ سێرکەکە، تەنها بۆ تەماشاکردنی "پەنینا مەنینا"،





چونکە هەموو ئێوارەیەک شتێکی نوێیان تێدا دەبینی _کەس پێشوەخت نەیدەزانی چ شتێک دەکات. بەو شێوەیەش بینەران هەمیشە دوو نمایشتیان بەیەک بلیت دەبینی؛ لەلایەکەوە نمایشتی ئاسایی ئێوارانی سێرکەکە و لەلایەکی تریشەوە تەماشاکردنی "پەنینا مەنینا". زۆر کەڕەت ئەو کچە بچکۆلەیە بەسەر قەراغی سێرکەکەدا هەڵدەزنا و بەشداری نمایشتەکەی دەکرد. ڕێگەیان پێدەدا ئەوە بکات، چونکە بەڕێوەبەری سێرکەکە لەڕادەبەدەر دڵی بەو کچە بچکۆلەیە دەسوتا کە لەو تەمەنەدا دایکی لەدەستدابوو، لەبەرئەوە دڵی بە هەموو ئەو شتانە دەکرایەوە کە کچەکەی ئاسودە دەکرد. ئەو بەشە تایبەتیانە هەمیشە بەشێوەیەکی خۆبەخۆیی ڕوویاندەدا، لەپڕێکدا ئەو منداڵە بچکۆلەیە خۆی لە بەشێکی گاڵتەبازەکاندا هەڵدەقورتان، یان لەنێوان دوو بەشدا خۆی هەڵدەدایە ناو پانتایی سێرکەکەوە و نمایشتی تایبەتی خۆی پێشکەشدەکرد _بۆ نمونە بە تۆپێک کە لە سەگێکی ئاوی وەردەگرت، یان بەیەک دوو قوچەک یاریدەکرد کە لە یەکێک لە یاریبازەکانی قەرزدەکرد، یاخود بە سۆندەیەکی شێوەبازنەیی، یان لەسەر "ترامپۆلین"ێکی بچکۆلە هەڵبەز و دابەزی دەکرد، یان دەمانچەیەکی ئاوی پێکەنیناوی دەدۆزیەوە و وەک ئامرازێکی نمایشت بەکاریدەهێنا. هەمیشە "پەنینا مەنینا" بەهۆی ئەو بەشە تایبەتیانەوە چەپڵەیەکی زۆری بۆ لێدەدرا. بەو شێوەیەش بەر لە نمایشتەکان خەڵکی زیاتر پەرۆشی بینینی ئیشەکانی کچی بەڕێوەبەری سێرکەکەبوون و کەمترێک خوێندنەوەی لیستەی لاف و گەزافی دوورودرێژی ناو پرۆگرامەکەیان بەلاوە مەبەستبوو.





"پیۆتر ئیلیاتسی" کە گاڵتەبازێکی ڕوسیبوو، تەنها کەسێک بوو کە ئەو کارەی پێناخۆشبوو. پێی ناخۆشبوو کە "پەنینا مەنینا" ببێتە ناو بەشی گاڵتەبازی ئەووەوە و بەهیچ جۆرێکیش حەزی لەوە نەبوو کە تاڕادەیەک هەموو کەرەتێک چەپڵەیەکی زیاتریان بۆ ئەو لێدەدا. لەلای خۆیەوە بڕیاریدا کە کۆتایی بەوە بهێنێت و ڕۆژێک لە ڕۆژانیش پلانی فڕاندی جێبەجێکرد. فڕاندنی کچەکە لەکاتی پشویەکی نمایشتەکەدا ڕویدا. وەک هەموو جارێکی تری پشوەکان "پەنینا مەنینا" دەڕواتە لای ئەو گاڵتەبازەی کە لەدەرەوە پەشمەک دەفرۆشێت، بەڵام ئەو ڕۆژە گاڵتەبازەکە لەگەڵ ئافرەتێکی کەمێک بەتەمەنی ڕوسیدا ڕێک کەوتبوو کە بەسەردان هاتبوو بۆ شارەکە. ناوی "ماریوسکا" بوو و "پیۆتر ئیلیاتسی" پارەی پێدابوو کە "پەنینا مەنینا" لەگەڵ خۆیدا بەرێت بۆ ڕوسیا، بەو شێوەیەش ئەو کچە بەدبەختە لە کێڵگەیەکی بچکۆلەی لادێیەکی هەژاردا گەورەدەبێت کە کەوتبووە شوێنێکی دور و ساردی ڕوسیاوە. ژنەکە قەت بەشێوەیەکی خراپ ڕەفتار لەگەڵ "پەنینا مەنینا"دا ناکات، چونکە هەمیشە ئاواتی بووە کە کچێکی هەبێت، بەڵام کچەکە هەرزۆر زۆر بیری باوک و سێرکەکەی دەکات و بۆ ماوەی ساڵێک هەموو شەوێک بەدەم گریانەوە دەخەوێت. بەڵام ئیتر ئێوارەیەکیان خۆشی نازانێت بۆ چ شتێک دەگری. ڕاستە بەردەوام هەر دەگری، چونکە "پەنینا مەنینا" هەر هێندەی جاران دڵی تەنگە، بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە لەوە بەدواوە نازانێت بۆ چ شتێک دەگری. هەموو یادوەریەکانی سێرکەکە لەیاددەکات. بۆنی وردە تەڵاشی سەر عەرزەکەی لەبیردەچێتەوە و چیتر لەیادی نیە کە باوکێکی هەیە و لەوڵاتێکی دوردا دەژی.





"پەنینا" مەنینا" لەگەڵ گەورەبوونیدا جوانتر و جوانترێک دەبێت و لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا بە جوانترین کچی ڕۆژهەڵاتی "ئوراڵ" دادەنرێت. لەو سەردەمەدا "ستالین" دەسەڵاتی حوکمی ڕوسیای بەدەستەوەدەبێت، بەڵام زڕدایکی "پەنینا مەنینا" ئەندامێکی متمانەپێکراوی پارتی کۆمۆنیستە و ڕۆژێک لە ڕۆژان "پەنینا مەنینا" ڕادەکات بۆ "مۆسکۆ"، بۆ بژێوی ژیانی بۆ ماوەی یەک دوو ساڵێک وەک مۆدێلێک کار لەلای چەند کەڵە هونەرمەندێکی وڵاتی ڕوسیا دەکات. هەر بەرێکەوت، لەڕاستیدا ئەم چیرۆکە باسی ڕێکەوتەکانی ژیان دەکات، لە ڕۆژێکی هاویندا دێت بۆ "میونشن" کە ئەوەندە لە "ئولم"ەوە دور نیە. لەو کاتەدا سێرکە گەورەکەی باوکی لە شای "میونشن"دا خێمەیان هەڵداوە، "پەنینا مەنینا"ش لەو کاتەدا کە بەپایتەختی ئەو وەختەی "بایرن"دا پیاسەدەکات، چاوی بەسێرکەکە دەکەوێت. بەرەو ڕوی دەچێت، لەڕاستیدا هەستدەکات کە شتێکی نادیار بەرەو خێمەکەی ڕادەکێشێت، بەڵام هەتا ئەو کاتەش هێندەی لەیاد نیە کە کاتی خۆی کچێکی ڕاستەقینەی سێرک بووە، بەتایبەتیش کە لەو کاتەدا خێمەکەش لە شارێکی تر هەڵدرابوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لەناخی ناوی ناوەوەیدا شتێک هەبووبێت کە ناو بازنەی سێرکەکەی لەیادبووبێت، بە هەموو گاڵتەباز و گالیسکە و بەشدارانیەوە، دەبێت شتێک هەبووبێت کە ئەسپ سوارە سەیروسەمەرەکان و سەگە ئاویەکانی لەیادبووبێت. چەندەها خەڵک لەبەردەمی خێمەکەدا وەستابوون، چونکە هێندەی نەماوە کە نمایشتی ئێوارەکە دەستپێبکات. "پەنینا مەنینا" بەرەو شوێنی کڕینی بلیت فرۆشتنەکە دەڕوات و بلیتی باشترین شوێنی سێرکەکەی دەکڕێ، چونکە زۆر لەدورەوە هاتووە و لەو کاتەدا

ڕوداوێکی گەورەبوو کە کچێکی ڕوسی سێرکێکی مۆدێرن لەشاری "میونشن" ببینێت. لەبەردەم ڕاڕەوی پێش چوونە ژورەوەی خێمەکەدا لولەیەک پەشمەک دەکڕێ. هەڵبەتە ئەوە کەمێک سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێت کە ئافرەتێکی ڕێک و پێکی وەک ئەو لە ڕیزی پێشی پێشەوە دانیشتووە و خەریکی خواردنی پەشمەکێکی پەمەییە، بەڵام "پەنینا مەنینا" لەلای خۆیەوە بڕیاری دابوو تامی ئەو لولە شیرینە بکات، چونکە ئەو شتانە هەروا بەئاسانی هەموو ڕۆژێک لەو شوێنەدا دەست نەدەکەوتن کە ئەوی لێوە هاتبوو.
نمایشتەکە دەستپێدەکات، یەکەمجار هەموو بەشدارانی سێرکەکە دێنە ناو بازنەی سێرکەکەوە و دواتریش پەتبازە ئازاکان هونەر خۆیان پێشکەشدەکەن، ئینجا گاڵتەباز و تۆپبازەکان، دواتر گروپی سوارچاکان و فیلە مەشقپێکراوەکان خۆیان پیشاندەدەن.
بەڵام لە پشوە کورتەکەدا شتێکی زۆر سەیر ڕودەدات. "پەنینا مەنینا" لەناکاودا دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا نامێنێت، یەک و دوو بەسەر قەراغی سێرکەکەدا هەڵدەزنێ و دەچێتە ناو بازنەی سێرکەکەوە، کڵاوێکی گەورەی ژنانەی بەدەستێکەوەیە و بەدەستەکەی تریشی پەشمەکەکەی. لەوێدا دەستدەکات بە هەڵبەزینەوە و دەکەوێتە سەماکردن، بەڵام بەشێوەی کچێک سەماناکات کە ئەو تەمەنەی هەبێت، نا، هەروەک منداڵێک چۆن بەسەر فەرشێکی گەورەدا دەخولێتەوە و خۆی هەڵدەدات، "پەنینا مەنینا"ش ئاوها بەبازنەکەدا بەنارێک و پێکی دەخولێتەوە و هەڵدەبەزێتەوە. بینەران لەسەرەتادا قاقای پێکەنینیان لێبەرزدەبێتەوە، چونکە وادەزانن ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی بەشێکی نوێی گاڵتەبازیە، بەڵام خەڵکی "میونشن" هەمیشە بە کەشخەیی بەناوبانگبوون و لەو کاتەدا کە بۆیان







دەردەکەوێت ئەو کچەی کە پەشمەک و کڵاوەکەی بەدەستەوەیە ڕەنگە کەسێکی شێت بێت یان سەرخۆش یان مادەیەکی بێهۆشکەری خواردبێت، نارەزایی خۆیان دەردەبڕن و داوادەکەن بیکەنە دەرەوە. "پەیننا مەنینا" یەک دوو چرکەیەکی تریش لەو حاڵەتی هەڵچونەیدا دەمێنێتەوە و لەو کاتەدا چاوی دەچێتە سەر پیاوێکی بەشکۆ و بەڕێز کە لەبەردەم ئۆرکێسترا گەورەکەدا وەستاوە و قامچیەکی بەدەستەوەیە. بەڕێوەبەری سێرکەکەیە. "پەنینا مەنینا" خۆی دەدا بەسەر وردە تەلاشی سەر عەرزەکەدا و دەستدەکات بە گریان. زۆر بە کوڵ دەگری، چونکە تەنها لەویادا، تەنها لەویادا هەستدەکات شتێکی زۆر شەرمەزارانەی کردووە. ڕێک لەو کاتەدا بەڕێوەبەری سێرکەکە هێندەی بۆ ڕوندەبێتەوە کە ئەو کچەی کە حاڵی لێهاتبوو کچی خۆیەتی. بەرەوڕوی کچەکە دەچێت، ئەویش سەری بەرزدەکاتەوە و سەیرێکی دەکات، لەو کاتەدا، ڕێک لەو کاتەدا "پەنینا مەنینا" ئەوەی بیردەکەوێتەوە کە خۆی کچی بەڕێوەبەری سێرکەکەیە، چونکە خوێن هەرگیز نابێت بە ئاو. بەڕێوەبەری سێرکەکە بڕیاردەدات کە پاشماوەی نمایشتەکە بوەستێنێت و ئەو ئێوارەیە هیچی تر پێشکەش نەکەن. تەماشایەکی ئۆرکێستراکەی سەرەوە دەکات و داوا لەبەڕێوەبەرەکەیان دەکات کە پارچە مۆسیقای "خەندە"ی فلیمی "سەردەمە مۆدێرنەکان"ی "شاپلن" بژەنن. لەگەڵ دەستپێکردنی مۆسیقاکەدا داوا لەبینەران دەکات کە سێرکەکە بەجێبهێڵن. بێگومان چاوەڕوانی ئەوەدەبێت کە کارەکەی وەک بەڕێوەبەری سێرک لەدەستبچێت، چونکە کەم ڕێدەکەوێت خەڵکی "میونشن" لە هەڵەیەکی گەورەی ئاوها ببورن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڕێوەبەری سێرکەکە ئاسودەیە. کچەکەی خۆی دۆزیوەتەوە و ئەوەش لە هەموو





هونەرەکانی تری سێرکەکە گەورەترێکە. لەوەبەدواوە دەخوازێت هەموو ژیانی لەگەڵ کچەکەیدا بەسەربەرێت.

لەو کاتەدا کە چیرۆکەکەم گێڕایەوە، "بییتا" بەتەواوەتی بێدەنگ بوو. تارادەیەک لەوە دەچوو ئیفلیج بووبێت، کاتێکیش کە تەواوبووم و تەماشامکرد، زۆر غەمگین و مات هاتە بەرچاوم. هەوڵمدا ورەی بەرزبکەمەوە و وتم "ئێ خۆ بەلایەنی کەمەوە چیرۆکەکە بەشێوەیەکی خۆش کۆتایی هات"، بەڵام قسەکەم بێسودبوو و هەر دڵتەنگ بوو. بەرلەوەی چیرۆکەکەی بۆ بگێڕمەوە دانیشتبوو و دەستی گرتبووم، بەڵام هەر لەسەرەتای چیرۆکەکەوە دەستی لەناو دەستما دەرهێنا. سەرم لەوە سوڕما کە چیرۆکەکە بەشێوەیەکی هێندە زۆر کاریگەری لێکرد.

پاش ماوەیەک وەک کەسێکی گۆشەگیر بەئاستەم دەمی کردەوە و پرسی؛ «تۆ تەمەنت چەندە؟»، منیش لەوەڵامدا وەتم 48. ئینجا بەشێوەیەکی سارد پرسیەوە؛ «ڕێک 48؟». من لە پرسیارەکەی تێنەگەیشتم و پێم وانەبوو ئەو چەند مانگە زیادەیە هیچ ڕۆڵکی گرنگی هەبێت، بەڵام خۆم بە خۆمم وت "ڕەنگە خەریکی ئەستێرەناسی بێت". وتم "من بورجی "شێر"م و لە کۆتایی مانگی حەوتدا 48 ساڵ پڕدەکەمەوە".

نەختە نەختە بۆ خوارەوە بەرەو شار ڕۆیشتین. شێوە ناچاریەک بە دموچاویەوە دیاربوو، وەک ئەوە وابوو هەستی بریندارکرابێت. لەوێدا لێمپرسی؛ «ئومێدەواربوویت کەمێک گەنجتربوومایە؟». مرخەمرخێکی کرد و سەری بۆ ڕاوەشاندم. وتی من تەمەنم 29 ساڵە، منیش بیرم لەوەکردەوە کە ماریاش ڕێک لە هاوینی 1971دا لەو تەمەنەدا بوو.





خۆم بەخۆمم وت "لەو کاتەوە کات وەستاوە و وا ماریا گەڕاوەتەوە بۆ لام". ڕۆژی جەژنی پاک بوو و ماریا زیندوو بووبوەوە. بیرکردنەوەیەک بوو کە بەڕواڵەت قەناعەتی پێدەکرا.

مەزاجی "بییتا" لە پڕێکدا گۆڕا. لەدڵی خۆمدا وتم ڕەنگە پەیوەندی بە پلانەکەوە نەبێت، بەڵام خۆ ڕێیتێدەچێت ناوی "جاڵجاڵۆکە"کەی بیستبێت. ئەو پەیوەندیەکی بە جیهانی کتێبەوە هەبوو و هەر خۆشی لە دۆڵەکەی خوارەوەدا وتی دەستمکردووە بە نوسین. بەدڵنیاییەوە نەمدەزانی شتێکی دڵخۆشکەرە یان نا کە ناوی "جاڵجاڵۆکە"کەی بیستبێت. چونکە ڕێیتێدەچوو کچی یەکێک لەو نوسەرانەبێت کە من یارمەتیمدابوون، بەلایەنی کەمەوە نوسەرێکم بیرکەوتەوە کە لە شاری "میونشن" دەژیا، پیاوێک بوو تەمەنی لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا بوو و هیچ شتێکم دەربارەی خێزانەکەی نەدەزانی.

کەتبووینە بارودۆخێکی ناخۆش و سەختەوە، ئەگەر هەر ئەوەندە بمزانییایە چ شتێک ئاوها پەستی کردووە، ئەوا دڵنیابووم لەوەی کە چارەیەکی باشمان دەدۆزیەوە. من لەوەپێش توشی چەندەها گرفت و کێشەی ناخۆشبووبووم و چارەم بۆ دۆزیبوونەوە. "بییتا" لەوەوبەر ئەوەندەی پێ وتم کە دایکی چەند مانگێک لەوەوپێش مردووە و زۆریش پەیوەستی بووە. لەبەرئەوە بەلامەوە سەیر نەبوو کە باری دەرونی جێگیر نەبووو لەپڕێکدا مات دەبوو. دەمزانی هەروا ئاسان نیە، چونکە خۆشم مردنی دایکم ئەزموونکردبوو.

بەلای کێڵگەیەدا ڕۆیشتین و یەک دوو سەگ تیایدا دەوەڕی، چەند قازێکیش لەناو قەفەزێکی پیسدا زاقوزیقیان بوو و دەخولانەوە. بەرلەوەی لەدواهەمین پلیکانە بێینە خوارەوە، "بییتا" وەستا،

سەیرێکی کردم و وتی؛ «نەدەبوو ئەو چیرۆکە بگێڕیتەوە!» ئینجا دەستیکرد بەگریان. ویستم دڵنەوایی بدەمەوە، بەڵام پاڵی پێوەنام.

پرسیارم لێکرد و وتم؛ «هێندە چیرۆکێکی غەمگین بوو بەلاتەوە؟»

دیسانەوە وتیەوە؛ «نەدەبوو ئەو چیرۆکەم بۆ بگێڕیتەوە. بێئەقڵیت کرد، هەر زۆر بێ ئەقڵیت کرد!»

سەرێکی کردم، کەمێک دواتر نیگای لەسەر لابرم، ئینجا دیسانەوە بەچاوێکی تورە و گومانەوە تەماشای کردمەوە. لەوەدەچوو تەماشای خێوێک بکات. دەترسا، لە من دەترسا.

من لە هیچ شتێک تێنەدەگەیشتم. پێم خۆشبوو لەگەڵ ئافرەتێکدابم کە لێی تێنەگەم، بەڵام ئا لەوێدا خۆش نەبوو. لەخەیاڵی خۆمدا دەموت "دەبێت لە خاڵێکی هەستیاریم دابێت". ڕەنگە خۆی وەک کچی بەرپێوەبەری سێرکەکە بینیبێت، کێ دەزانێت، خۆ من هیچ شتێکم دەربارەی ڕابوردوی "بیبیتا" نەدەزانی. زۆر دەگمەن ڕێدەکەوت کە چیرۆکێک هێندە کاریگەر بێت، بەڵام ڕۆژێکی دورودرێژیشمان بردبووەسەر، ڕۆژێک کە چەندەها ئەندێشە و هەستی قوڵی هێنابووە پێشەوە.

دیسانەوە لەناکاوێکدا تەماشای کردمەوە، چاوی ئاگری لێدەباری و وتی؛ «ناچارین ئەم چاوپێکەوتنەمان لەیادبکەین. شتێکە کە نابێت هەرگیز باسی بکەین. نابێت بۆ هیچ کەسێکی بگێڕینەوە!»

من لە هەستی هەڵچووی تێنەدەگەیشتم. لەوەپێش ئافرەتم بینیبوو کەلەپاش پێکەوە خەوتن، شێوە شەرم و پەشیمانیەکی قوڵ دەیگرتن، ئەوەش شتێکبوو کە من وەک سیفەتێکی تایبەتی ئافرەت دەمبینی، بەڵام لەوێدا بەتەواوەتی شتێکی جیاوازبوو. "بیبیتا" کەسێک نەبوو لەوانەی شەرم لەوەبکات کە باران و هەورە تریشقە مەستی بکات.





ئەگەر بەڕاستیش لەکارەکەی پەشیمان بووبێتە، ئەوا ئەو کاتە لەناوەوەی خۆیدا دەیهێشتەوە، یان هەر هیچ نەبێت بەسەر مندا هەڵی نەدەڕشت. خۆ من لە شاری "ئامالفی"دا چاوم بە "ماری ئان ماک کێنزی" نەکەوتبوو.

بەدەم گریانەوە دیسانەوە وتیەوە؛ «ناچارین و دەبێت هەموو شتێک لەیادبکەین. تێدەگەیت؟» دواتریش وتی؛ «دەبێت پەیمان بەیەکتری بەین کە ئیتر قەت قەت یەکتری نەبینینەوە، قەت قەت!»

من وەڵامم نەدایەوە، لەبەرئەوە وتی؛ «چیە، لە هیچ تێناگەیت؟ لەوە تێناگەیت کە دڕندەیت؟»

ترسەکەی ئەو منیشی گرتەوە. ڕەنگە دڕندەیەک بووبووم، ئەو ئەندێشەیە بەڕاستی لێی دام. گومانم لەوە کرد کە هەموو بیرۆکەکان و چیرۆکی ڕەچەڵەکەکانم جگە لە سەمایەکی تۆقێنەر لەگەڵ ڕۆحی شێتما زیاتر، هیچی تر نەبن.

شتێک هەبوو کە نەمدەتوانی بیرم بێتەوە، نازانم چی بوو، بەڵام شتێکی گەورە و قورسبوو و لەیادم کردبوو.

پاش ماوەیەک ژیر بووەوە. "بیبیتا" کچێکی ئازابوو، لەوانە نەبوو کە بەدرۆ خۆی نیشان بدات. بەڵام تەنها ئەوەندەبوو کە لەوێدا ڕەق و ساردبوو لەگەڵمدا. نەمدەناسی، نەمدەزانی لەسەر چ ڕێگایەکە، لەو کاتەدا نەمدەتوانی قەڵغانەکەی دەستی ببڕم و لێی نزیکببمەوە.

ئینجا وتی؛ «دەترسم... لە هەردووکمان دەترسم»

من ئەو قسەیەم وەک کلیلێک بینی. کەواتە ئاگای لەو پلانانەبوو کە بۆ کوشتنم دانرابوون، بەڵام هێندە تێنەگەیشتبوو کە من "جاڵجاڵۆکە"کەم. بەر لە ئێستا ئەوەی نەدەزانی، ئەو کاتە بۆی ڕونبووەوە کە وتم من یارمەتی نوسەرەکانم داوە، کە چیرۆکە



دورودرێژەکەی کچەی بەڕێوەبەری سێرکەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەو کاتەش بەتەواوەتی دڵنیابوو کە تەمەنی تەواوەتی خۆمم پێوت. چاوانی "جاڵجاڵۆکە"کەی بینیبوو، تەنها دوو چاویش نەبوون، بەڵکو چەندەها چاو بوون. ئەوەش ترساندبووی. زانیبووی کە "جاڵجاڵۆکە"کە گیانەوەرێکی تۆقێنەرە، بەڵام بەرلەوەی بەتەواوەتی بۆی ڕونبێتەوە، فریویدابوو. ئاگای لەو پلانانەبوو کە بۆ کوشتم دانرابوون و ئیدی لە هەردووکمان دەترسا.

بەبێ دەنگی بەلای پۆلیسخانەکەدا ڕۆیشتین و دواتریش بەناو شاردا. خەڵکی شارەکە لە باڵکۆن و بەردەم پەنجەرەکاندا کە دەیڕوانیە سەر شەقامەکان، جلیان هەڵخستبوو، چەندەها فانیلە و سوخمە وەک نیشانە و ئاڵای ژیانێکی ئاسایی لەبەر ئەو هەوا فێنکەدا دەشەکانەوە. لەوێدا واملێهاتبوو کە شتە جوان و پڕلەئومێدەکانی ئەو ڕۆژە ئاساییە ببینم، بەڵام "بییتا" خێراتر و خێراتر هەنگاوی هەڵدەنا، بە ئاستەم فریای دەکەوتم و هەتا نەگەیشتینە قەراغ ئاوەکەش نەوەستا. نەمدەزانی لە چ شوێنێک دەژی، بەڵام ئیتر لەوێدا ڕێگامان جوادادەبووەوە.

دەستێکم خستە سەر شانی، دەتوت بووە بە سەهۆڵ.

وتم؛ «من لەمە تێناگەم»

«نا، تێناگەیت... منیش ناتوانم پێت بڵێم»

دەستمی لەسەر شانی لادا.

وەک پرسیارێک وتم؛ «ئیتر قەت یەکتری نابینینەوە؟»

وتی؛ «قەت» ئینجا درێژەی بەقسەکەیدا و وتی؛ «ڕەنگە پێویستکات یەکێکمان بمرێت. لەوە تێناگەیت؟»







سەرم بۆ ڕاوەشاند. لەسەر خۆی نەبوو. دیسانەوە لەوێشدا "ماری ئان ماک کێنزی"یم بیرکەوتەوە. نەمدەزانی دەستم بە چ شتێک کردووە.

وتم؛ «هەرگیزاو هەرگیز؟»

کەمێک بیری کردەوە و دواتر وتی؛ «لەوانەیە بەناچاری یەک کەڕەتی تر یەکتری ببینین، بۆ نمونە بەیانی، بەڵام ئیتر ئەوە هەرە هەرە دواهەمین جار دەبێت»

قسەکەی زۆر بە شێوەیەکی سارد وت، ترساندمی. لە وەڵامدا وتم ؛ «زۆر باشە. حەزدەکەیت سبەینێ بێیتە ئوتێلەکە و نانی بەیانی پێکەوە بخۆین؟»

سەری بۆ ڕاوەشاندم. نائومێدبوو، زۆر نائومێدبوو. ئینجا وتی؛ «هەروا دەچین بۆ خۆمان پیاسەیەک دەکەین»

«ئاوها؟»

«دەتوانین بچینە سەر شاخی "ڕاڤیللۆ"»

لەوەوپێش ناوی "ڕاڤیللۆ"م بیستبوو. "واگنەر" کەمێک بەر لەمردنی ئۆپێرای "پارسیفاڵ"ی لە ڤێلا کۆنەکەی سەر شاخی "ڕاڤیللۆ"دا نوسی. "پارسیفاڵ" دواهەمین شاکاری "واگنەر" بوو.

نەمویست لەوە زیاتر سەر بکەمە سەری، چونکە دیاربوو زۆر بە قوڵی لێیدرابوو. منیش چیتر هێزم نەمابوو. من لەکاتی ناشتنی دایکمدا نەمتوانی هیچ شتێک بڵێم، مایەی شەرمبوو. لەو کاتەوە من لەناو پەرژینێکی پێچاوپێچ و دژواردا گیرم خواردبوو، پەرژینی دژواری خۆم، لەناو زیندانی خۆمدا گیربووبوم. من خۆم ئەو پەرژینە پێچاوپێچەم دروستکردبوو، بەڵام ئیدی نەمدەتوانی ڕێگای هاتنە دەرەوەی خۆم بدۆزمەوە.





وتم؛ «من ژیانێکی بەتاڵ و بچکۆلەم بەسەربردووە. تۆ یەکەمین کەسیت کە بەڕاستی حەزم لێ کردبێت. تەنها کەسیت کە بەدڵم بووبێت»
دیسانەوە بەکوڵ دەستیکردەوە بە گریان. خەڵکییش وردە وردە سەیریان دەکردین.
ئەندێشەیەک بەخەیاڵمدا هات و وتم ڕەنگە ئەوە ڕزگارمان بکات.
وتم؛ «تۆ دوێنی پەیمانت دامێ کە باسی باوکتم بۆ بکەیت. خۆ هەر هیچ نەبێت هێندەت لەیادە، ها؟»
موچوڕکەی پێداهات. ئینجا بۆ ماوەی یەک دوو چرکەیەک بیری کردەوە و وتی؛ «زۆرم باسکرد» لەوەندە زیاتری نەوت.
بۆ ساتێک هەروەک چۆن توتەڵە سەگێک لەترسی گەورەیی جیهان خۆی لە دایکی نزیک دەکاتەوە، ئەویش بەو شێوەیە خۆی بەرەوڕوم چەماندەوە و سەری لەسەر سنگم دانا. دیسانەوە لەپاش ئەو هەموو فرمێسک هەڵڕشتن و هەڵچونی دەرونیەی بەزەییم پێدا هاتەوە. باوەشم پێداکرد و ناوچەوانیم ماچکرد، بەڵام بەپەلە خۆی لێ ڕاپسکاندم و یەک زللەی قایمی تێسرەواندم، زللەیەکی تریشی پیاکێشام. نەمزانی تووڕەیە یان نا، نەمزانی خەندە کەوتە سەر لێوانی یان نا. لەباوەشما خۆی دەرفرتاند و ڕۆیشت.

*

نانی ئێوارەم نەخوارد، چونکە بەهیچ جۆرێک نەمتوانی بچم لە هۆڵی نانخواردنەکە دابنیشم، خۆشبەختانە پاکەتێک پسکیت و کیسەیەک فستقم لە ژورەکەدا هەبوو. لەلای مێزی نوسینەکە دانیشتنم و







بەردەوامبووم لەسەر نوسینی چیرۆکی ژیانم. نوسین بیرکردنەوەکانمی کۆدەکردەوە، شتێکبوو ئارامی پێدەبەخشیم. دەربارەی ناسینی "بیبیتا"م نوسی کە لە "ئامالفی"دا بینیم، باسی پیاسەکانی "پۆنتۆنا" و "پۆگیرۆلا"شم کرد.
وا چەند کاتژمێرێکە لێرەدا دانیشتووم، ئێستاکە کاتژمێری دووە. کەمێک لەلای پەنجەرەکەوە وەستام و تەماشای شەپۆلەکانم کرد، خۆیان دەدا بە "تۆرە ساراسینا"دا. پیاوە بچکۆلەکە هێشتام بە ژورەکەدا هەر هاتوچۆدەکات. بەدەم ڕۆیشتنەوە گۆچانە حەیزەرانەکەی دەدا بەملاولادا و دەڵێت «شش، شش!». من هەوڵدەدەم سەرنجی نەخەمەسەر، بەڵام ناتوانم ڕێگەی لێبگرم و نائارامیەکەی ئەو منیش دەگرێتەوە.

کاتژمێر دوو و نیوە. وا کەرەتێکی تریش بەوردی بیرم لە هەموو ئەو شتانە کردەوە کە لە چەند ڕۆژی ڕابوردودا بەسەرمدا هاتن، بەتایبەتیش ئەو شتەی کە ئەم ئێوارەیە بەسەر "بیبیتا"دا هات. سەرمامە.
کاتژمێر سێیە. ئەندێشەیەکی تۆقێنەر لەناکاودا بەخەیاڵمدا هات. هەست دەکەم کەسێکم کوشتبێت، هەست دەکەم بەسەرخۆشی بە ماشێنێک لە منداڵێکم دابێت و خەبەرم بووبێتەوە. سەرمامە. دڵم تێکەڵدێت.
نازانم دیسانەوە فەنتاسیایە کە هەڵمدەخڵەتێنێت یان نا. دەمەوێت ڕێک ئەو شتانە بنوسم کە بیریان لێدەکەمەوە، بەڵام دەستەکانم دەلەرزن. "بیبیتا" هێندەی پێوتم کە دایکی لەپڕێکدا لە ڕۆژی لەدایک





بوونیدا مردووە، لەدوای چەند حەفتەیەکی کەمیش من لە "ئامالفی"دا بینیم.

نابێت... دەبێت دیسان فەنتاسیای خۆمبێت کە هەڵمدەخڵەتێنێت.

گوێم لەتەپەی دڵی خۆمە. ڕۆیشتمە گەرماوەکە و دەمم نا بە بەلوعەکەوە، بەڵام هێشتام هەر دڵم تێکەڵدێت.

مەبەستی چی بوو کە وتی "تۆ دڕندەیت؟" بڵێیت بەهۆی "یاریدەدەری نوسەرە"کەوە بووبێت کە وای پێوتم، یاخود بەهۆی شتێکی تەواو جیاوازەوە بوو؟ ناوێرم تا کۆتایی دوای ئەو ئەندێشەیە بکەوم. قەت زات ناکەم کە بیرۆکەی سەرەکی چیرۆکەکەی خۆم بەو شێوە ناخۆشە و پرئازارە کۆتایی پێبهێنم. تەنانەت فەناتاسیای منیش لەتوانایدا نەبوو کە بیر لە شتێکی ئاوها بکاتەوە.

بۆ نابێت چیتر یەکتری ببینینەوە؟ لەتوانایدا نەبوو بەڕونی بیڵێت، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وتی "یەکێکمان دەبێت بمرێت".

وابزانم بەیەکجاری لەسەرخۆی نەبوو. بۆ ئەوەی بۆ ساتێک خەیاڵی بخەمە سەر شتێکی تر داوام لێکرد کە باسی باوکیم بۆ بکات، کەچی داچڵەکی و وتی "زۆرم باسکرد".

دڵم تێکەڵدێت و بەهۆی ئەوەشەوە نیە کە بیر لە "بیبیتا" دەکەمەوە، تەنانەت بەهۆی ئەوەشەوە نیە کە لە دۆڵی "ئاشەکەدا" لەئامێزم گرت. بەڵکو قێز لە خۆم دەکەمەوە. لە خۆم بێزارم.

دیسانەوە کەرەتێکی تریش بۆ ئاوخواردنەوە چوومەوە گەرماوەکە. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەبەردەم ئاوێنەکەدا وەستام و تەماشای دەموچاوی خۆمم کرد. تا ئەو پەڕی توانا هەوڵمدا لەناو دەستشۆرەکەدا نەرشێمەوە. ئێسقانی ڕومەتەکانی منیش بەرزن. چاوی منیش تاڕادەیەک لە چاوی دایکم دەچێت.



کاتژمێر چوارە. ئارەقێکی سارد بەلەشمدا دێتە خوارەوە. سەرتاپای بوونم تێکشکاوە، تەنها پێست و ئێسقانەکانم ماونەتەوە.

هەموو هیوایەکم ئەوەبوو کە لەگەڵ "بیبیتا"دا پاشەڕۆژێکم هەبێت، بەڵام وا هەمووی بەهەدەرچوو و مایەپوچبووم.

ڕێک لەو کاتەدا بەتەواوەتی وشکبوو کە چیرۆکی کچی بەڕێوەبەری سێرکەکەم بۆ گێڕایەوە. وتی "نەدەبوایە ئەو چیرۆکەت بۆ بگێڕامایەتەوە، بێ ئەقڵیت کرد، هەر زۆر بێ ئەقڵی". نەیوت ئەو چیرۆکەم لەوەپێش بیستووە، بەڵام وابزانم مەبەستی لەوە بوو. بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ مەبەستیبوو بڵێت "نەدەبوایە چەندەها ساڵ لەمەوبەر ئەو چیرۆکەی کچی بەڕێوەبەری سێرکەم بۆ بگێڕیتەوە". ئەگەر خۆشی ئەو چیرۆکەی لەیادی کردبێت، ئەوا بێگومان دایکی باسی ئەو پیاوە سەیرەی بۆ کردووە کە کراسەکەی لەبەرکردووە و باسی ئەو کچە بچکۆلەیەی بۆ کرد کە لەناو دارستانەکانی سویدا لەباوکی ونبوو.

ماریا چیتر لە ژیاندا نیە، ماریای نەگبەت. لە 19ی مانگی دوودا و لەڕۆژی جەژنی لەدایکبوونی 58 ساڵەیدا مردووە. نەخۆش نەبووە، بەڵام دەبوایە لەوە بەتەمەنتر نەبێت. ماریا تەمەنی 29 ساڵبوو کە سکی بە "بیبیتا" هەبوو، ئێستاکەش "بیبیتا" تەمەنی 29 ساڵە. ناگونجێت ئەوە هەروا ڕێکەوت بێت.

ماریا دەبوایە ئەوەندە بزیایە کە تەمەنی کچەکەی ڕێک بەقەد ئەو کاتەی لێبهاتایە کە خۆی هەروا بەبێ باکی ڕێگەی بە "جاڵجاڵۆکە"کەدا کە دووگیانی بکات. بەو شێوەیەش خۆی و کچەکەشی دوچاری تۆڵەی بێباکی خۆیان بوونەوە ـهەروەکو تۆڵەی شەرم شتێکی لۆجیکیە و ڕێگەی لێناگیرێت. منیش دەبوایە بەو





شێوەیە سوک و ڕیسوا بوومایە. بەو جۆرەش هەمووومان لە شەرم و شکۆدا یەکتریمان گرتەوە و کۆبووینەوە. من هەر لەوەوپێش زۆر بەباشی دەمزانی کە بوونەوەرە تاریکەکان و فریشتەی مەرگ، زۆر بەباشی دەیانزانی کە خەڵکی دەبێت بە چ شێوەیەک هاریکاریان بکەن.

ڕەنگە بەیانی زیاترێک دەربارەی "ویلیامین ویتمان" بزانم. بەڵام من هەر ئێستاوە دەزانم کە "بیبیتا" ئەو کەسەیە کە خۆی لەپشتی ئەو نازناوە سەیرەوە حەشارداوە. نهێنیەکەی "بیبیتا" ئەوە بوو.
ماریا هێندە چیرۆکی لەبەردەستدابوو کە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی پێکەوە ژیانیاندا بۆ کچەکەی بگێڕێتەوە. ڕەنگە هەندێکیانی شەوانە بەرلە خەوتنی "بیبیتا" بۆی گێڕابێتەوە، چونکە من کاتی خۆی چەندەها کورتە چیرۆکی خۆشیشم بۆ ماریا گێڕابووەوە. بەو شێوەیەش ئەو چیرۆکانەی کە کاتی خۆی من بۆ ماریام گێڕابووەوە، بەشێوەیەکی نوێ دەرکەوتنەوە، مەبەستم لەوەیە کە ئێستاکە "بیبیتا" لە دواهەمینیانەوە دەستیکردبوو بە نوسینەوەیان، لەپێشدا لە "نهێنی یاری شەترەنج"و "کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە" دەستیپێکردبوو. هەتاوەکو ئەو کاتەی کچەکەی ماریا گەورەنەبوو و توانای نوسینی تێدا دەرنەکەوت، من هیچ هەواڵێکیم نەبیست.
لەو کاتەدا کە وتی خەریکی نوسینم کەمێک شەرمی کرد، بەڵام من دەبوایە لەبواری ناسینەوەی ئەو جۆرە شەرمەدا شارەزاییەکی مەزنم هەبوایە. بێگومان مایەی سەرسوڕمان نیە کە کەمێک هەست بەشەرم بکەین ئەگەر چیرۆکێک بەناوی خۆمانەوە بڵاوبکەینەوە کە لە ڕاستیدا لەدەمی یەکێکی ترەوە بیستبێتمان.





کوشتنی سێ کەس لەدوای مەرگەوە. موچوڕکەم پێدا دێت ناونیشانەکەی خۆم دەمترسێنێت. لە ئێستاوە بەشێوەیەک لە شێوەکان هەر سێکمان قامچیەکی مەرگمان خواردووە. بەڵام هێشتام دوانمان لە ژیاندایە، هەڵبەتە بە پیاوە یەک مەتریەکەوە سی کەس ماوەتەوە.

تازە کچەی بەدبەختی سێرک کەوتبووە خوارەوە و دەبوایە من بەڕێزەوە داوای لێبکەم کە بەرزیبکەمەوە. لەسەر تەڵاشە دارینەکانی ناو بازنەکەدا تەختبووبوو، لەوێشدا بەڕێوەبەری سێرکەکە پێی لێنا. لەپاش ئەو هەموو ساڵە لە دەرەوەی وڵاتدا باوکی خۆی دۆزیەوە، کەچی باوکی نەک هەر نەینتوانی چارەنوس لێکباتەوە، بەڵکو دەستی درێژکردە سەری. باوکی لەو دواییەدا لە سێرکە گەورەکەی پێشانگای کتێبی "بۆلۆگنا" ڕایکردبوو. لەدوای ئەوەوە ئیدی هیچ نمایشێکی تریان پێشکەش نەدەکرد.
ڕەنگە لە ماوەی چەند کاتژمێرێکی داهاتودا چیرۆکی کچێکی بچکۆلەی سێ ساڵانە ببیستم کە لەگەڵ دایکیدا بۆ ماوەیەک لە سویددا ژیاوە، بەڵام هەر زوو لەوێوە گواستویانەتەوە بۆ ئەڵمانیا. یان هەر قەت لە سویدا نەژیاوون، لەوانەیە کچی بەڕێوەبەری سێرکەکە لە ئەڵمانیادا لەدایک بووبێت. کاتی خۆشی دایک و باوکی ماریا هەر لەوێدا دەژیان، من ئەوەشم لەیاد کردبوو.
هەڵەکە لەوەدابوو کە من هیچ شتێکم نەدەبیست و ئاگام لە هیچ نەبوو. نەگبەتیەکەش لەوەدابوو کە ماریا دەیویست هێندە لە تەونە ئاوریشمیە گەورە و ناشیرینە دورکەوێتەوە کە هەرگیز نەکەوێتە بەر چرنوکی "جاڵجاڵۆکە"کە. تەنانەت بۆم نەبوو ناوی کچەکەش بزانم،



ئەوەش هەڵەیەکی گەورە و ناشیرین بوو. هەموو باوکێک دەبێت ناوی کچەکەی خۆی بزانێت.

هەڵەیەکی تریش لەم دواداوییەدا ڕوویدا و ئەوەیان خەتای خۆم بوو؛ من هەروا بە کوێرانە باوەڕم بە قسە قۆڕەکەی "لویجی" کرد کە وتی کۆمەڵێک نوسەری قەرزدار پلانێکی نهێنیان بۆ داناویت. هەر لەبەرئەوەش بوو کە نەمتوانی بەشێوەیەکی ڕێک و پێک خۆم بە "بییتا" بناسێنم. بەڵام من هەرگیز ئەوەم بەخەیاڵدا نەهات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان "تۆپەڵە ئاڵتون" ببینمەوە. من هەرگیز ئەو کچە منداڵەم وەک کچێکی گەورە نەدەهاتە بەرچاو، تەنانەت زۆر بەدەگمەن بیرم لە تەمەنی دەکردەوە.

ئێستاکە شەوە، بەڵام هێشتام تاوناتاوێک گوێم لە دەنگی ماتۆڕێکی بچکۆلەیە کە بە سەر شەقامی قەراغ دەریادا دەڕوات. بۆ تاوێک لەلای پەنجەرەکەوە وەستام و چاوم بە گڵۆپی بەلەمێک کەوت کە لەناو قوڵایی دەریادابوو، جارجارێک ڕوناکیەکەی دەبوو بەژێر شەپۆلەکانەوە و دیسانەوە دەردەکەوتەوە. مانگ نیوەیە و بەرەو ئاخروئۆخری دەڕوات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەتێکی پانی زیوی بەسەر ئاوەکەدا نەخشاندووە.

دیسانەوە لەسەر مێزی نوسینەکە دانیشتمەوە. دانیشتووم و چاوم بڕیوەتە عەلاگەیەکی جلی ناشیرین کە لە ژوری خەوەکەدایە، هەرلە داهۆڵ دەچێت و بەهۆیەوە هەستدەکەم کە بەچکەی باڵندەیەکم.

خۆزگەی من ئەوەیە کە ڕێگەم پێبدرێت وەک مرۆڤێک بژیم، جگە لەوە هیچ خۆزگەیەکی ترم نیە. ئەوەندەم بەسە کە سەیری باڵندەکان و دارەکان بکەم، گوێ لە پێکەنینی منداڵان بگرم. دەمەوێت لە جیهاندا





بم، دەخوازم دەست لە فەنتاسیاکانم هەڵبگرم و بۆ خۆم بژیم. لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت داوابکەم کە ڕێگەم پێبدەن ببمە باوکی کچەکەی خۆم، من دەبێت بۆ شتێکی هێندە ئاسایی بپاڕێمەوە. لەوانەیە "بییتا" هیچ ڕێگە چارەیەکی تر نەبینێ جگەلەوەی کە بەهیچ شێوەیەک چیتر پەیوەندیم پێوە نەگرێتەوە، من زۆر بەباشی لەوە تێدەگەم. من تاوانبارم، بەڵام ئایا جیاوازیەکی بچکۆلە لەنێوان گوناحێکدا نیە کە هەستی پێبکەیت و گوناحێکیش کە هەستی پێنەکەیت؟ ئەوەی کە من لەگەڵ "تۆپەڵە ئاڵتون"دا کردم شتێک نەبوو کە من بەدەستی ئانقەست کردبێتم، بە مەبەستەوە نەبوو.

کاتژمێر پێنجە. چیتر هێزم نەماوە. بەڵام بەلامەوە ئاساییە، خۆ تازە هیچ شتێک نەماوە کە بەرەنگاری لێبکەم.

توێژاڵە سەهۆڵەکە شەقی بردووە و قوڵاییە سارد و تاریکەکەی ژێرەوەی خۆی دەکاتەوە. چیتر پێویست ناکات بەشێوەیەکی بازنەیی بەسەر سەهۆڵەکەدا سەمابکەم، لەئێستا بەدواوە دەبێت فێرببم لەناو ئاوی قوڵدا مەلە بکەم.

پیاوە یەک مەتریەکە لەلای ئاگردانەکەوە وەستاوە و تارادەیەک سیمایەکی ڕەسمیانەی خستۆتە سەر دەموچاوی. ئەوە یەکەمین جارە گۆچانە حەیزەرانەکەی بەو شێوەیە بخاتە سەر شانی، دەڵێیت کۆڵێکی قورسی پێیە. تەماشامدەکات و دەڵێت؛ «ئێ؟ ئێستاکە ئیتر بیرمان بکەوێتەوە؟»

لە خەیاڵی خۆمدا دەڵێم "ناگونجێت یادوەریەکی ڕونی بەسەرهاتێکم هەبێت کە لە تەمەنی سێ ساڵیمدا ڕوویداوە". سەیری ئەو پیاوە





بچکۆلەیە دەکەم و دەڵێم؛ «ناتوانم ئەو شتە بە وشە بڵێم. من ئەو زمانەم بیرچۆتەوە کە ئەو کاتە بەکارم دەهێنا. کوڕێکی بچکۆلەیە و بەزمانێک هاوارم بۆ دەکات کە من لێی تێناگەم»
پیاوە بچکۆلەکە دەڵێت؛ «بەڵام خۆ شتێکت هەر دێتەوە یاد؟»
لە وەڵامیدا دەڵێم؛ «هەروەک فیلمێک وایە. لە چەند مەترێکی بەکرەی فیلمێک دەچێت»
پیاوە یەک مەتریەکە دەڵێت؛ «کەواتە مادەی سەرەکی ئەو فیلمە بنوسە»
دەچمە قولاییەوە. لەدڵی خۆمدا وتم "ئەوە دواهەمین بیرۆکەی سەرەکیە" و دەستم کرد بە نوسین؛

ئۆسلۆ، ناوەڕاستی ساڵەکانی 1950کانە، پایزە. پیتەر سێ ساڵانە و لەگەڵ دایک و باوکیدا لە ئەپارتمانێکی مۆدێرندا دەژی. باوکی لە گەراجی ترامی "گریفسن"دا کاردەکات، دایکیشی ئیشێکی نیوە دەوامی لە شارەوانیدا هەیە.
وێنەی خێزانێکی نمونەیی، 12_15 چرکەیەکی پیاسەی ناو دارستانی "سۆگنسڤان"، پیاسەیەکی یەک شەممانی "ئولەڤۆلسیتە" و هتد. وێنەی دایک و باوکی لەو کاتەدا کە بەخێرهاتنی دراوسێیەکی نوێی قاتی خوارەوەیان دەکەن. پیاوێکە و سەگێکی "لابرادۆر"ی هەیە.
بەیانی زووە؛ پیتەر و باوکی لە داڵانەکەی بەردەم دەرگاکەدا وەستاون و جلی دەرەوەیان لەبەردایە. دایکی (ڕۆبێکی بەیانیانی لەبەردایە) لە چێشتخانەکەوە دوو قوتوی نانخواردن بۆ هەردووکیان دێنێت. پیتەر جانتایەکی منداڵانەی شینی لەپشتدایە، دایکی قوتوی نانەکەی تێدەخات و بۆی دادەخات. کەمێک لەگەڵ پیتەردا قسەی





ئاسای دەکات، لەسەر چیچکان دادەنیشێت و ماچێکی ڕومەتی دەکات. دایکی هەڵدەسێتەوە سەرپێ، ماچێکی ناودەمی باوکی دەکات و هیوای ڕۆژێکی خۆشی بۆ دەخوازێت.
پیتەر و باوکی لە پاسدا دانیشتوون. پیتەر پرسیار دەکات و دەڵێت "بۆ دەبێت بچم بۆ باخچەی ساوایان؟" باوکی دەڵێت "من ناچارم بچمە سەر کار و هەموو ترامەکانی شار بەرێک و پێکی بهێڵمەوە"، هەروەها دەڵێت "دایکیشت دەبێت بڕواتە شوێنی جل شۆرینەکە و جلەکان بشوات، دواتریش دەڕوات قژی چاک دەکات". پیتەر دەڵێت "دەتوانم لەگەڵ دایکمدا بڕۆم بۆ جل شۆرین و دواتریش پێکەوە بڕۆینە سالۆنی قژ برینەکەی"، بەڵام باوکی دەڵێت "ئاخر پیتەریش دەبێت بچێتە سەر کار. ئیشی پیتەر ئەوەیە کە بچێتە باخچەی ساوایان و لەگەڵ منداڵەکانی تردا یاری بکات". باوکی کەمێک ئەندێشە دەیگرێت و بە کوڕەکەی دەڵێت "یاریکردنی منداڵ هەروەک کاری گەورەکان گرنگە".
دەگەنە باخچەی ساوایان، بەڵام پارچە کاغەزێکیان بە دەرگاکەوە نوساندووە و نوسیویانە "باخچەی ساوایان داخراوە، چونکە هەردوو مامۆستای پەروەردەیی باخچەی منداڵان نەخۆشن. باوکی بەدەنگی بەرز نوسراوی سەر کاغەزەکە بۆ پیتەر دەخوێنێتەوە، دەستی دەگرێت و دەڵێت "دیسانەوە دەتبەمەوە ماڵەوە بۆ لای دایە". دەچنە دوکانێکەوە کە شتی هەمەچەشنەی هەیە؛ سەمونی گەرم دەکرن، چەند پارچە باستورمەیەکی بردراو دەکرن کە کەمێک بۆدوکەڵی لێدێت (دەخرێتە ناو کاغەزی تایبەتی پێچانەوەی خواردنەوە)، شوشەیەک خەیاری لەتلەتی ترش و زەڵاتەی ئیتاڵیش دەکرن. باوکی دەڵێت "من کاتی ئەوەم نیە ئەو خواردنە خۆشە بخۆم، بەڵام هەمووی بۆ تۆ و دایەیە".





پیتەر و باوکی دیسانەوە لە پاسدا دادەنیشنەوە. هەردووکیان دڵیان خۆشە. پیتەر ڕوو لە جامی پاسەکە دەکات و تەماشای خەڵکی دەرەوە دەکات، سەیری ماشێنەکان دەکات (بەلایەنی کەمەوە تەکسیەکیان تێدایە)، سەیری پاسکیلەکان دەکات و مەکینەیەکی هەڵمیی پەستنەوەی ڕێگاوبان دەبینێت (واتە تەماشای جیهانی گەورەی دەرەوەی خێزان دەکات).

لە پاسەکە دادەبەزن، لەڕێگادا بەرەو ماڵەوە باوکی بە فیکە مۆسیقای "خەندە"ی فیلمی "سەردەمە مۆدێرنەکان"ی "شاپلن" لێدەدات.

دەچنە ناو دالانی بیناکەوە، پیتەر پەرۆشی بینینی دایکیەتی لە ماڵەوە. باوکی دەرگای ئەپارتمانەکە دەکاتەوە. دایکی بەڕاکردن لە ژوری دانیشتنەکەوە بەرەوڕویان دەردەپەڕێت، لەترساندا ئاگای لە خۆی نیە، ڕۆبەکەی بەدەستەوە دەگرێت و خۆی پێدادەپۆشێت، تاڕادەیەک ڕوت و قوتە. هەموان دەشڵەژێن.

تێڕوانینی پیتەر لە بەرزی یەک مەترەوە؛ دایک و باوکی هاوار و قیژەیان لێ بەرزدەبێتەوە و جنێوی پیس پیس بەیەکتری دەڵێن. پیتەریش هاوار دەکات، بۆ ئەوە هاواردەکات کە گەورەکان بێدەنگ بکات. دەردەفرتێتە ژوری دانیشتنەکەوە، لەوێدا دراوسێ نوێکەیان دەبینێ خەریکە لەسەر فەرشە گەورە هەڵبسێت، ئەویش ڕوت و قوتە. جلەکانی بەتۆپەڵی لەسەر تەپڵەکەکە داناوە، لەسەروی تەپڵەکەکەوە ڕەفەیەکی دارینی لێیە و ڕادیۆیەکی کۆنی لەسەردانراوە، بە دەفتەرێکی نۆتە خۆی دادەپۆشێت (بۆ نمونە کەشکۆڵی ئۆپێرای "بەبێ وشە").

شێوە دیمەنێکی فیلمی بێ قسە، بەڵام پڕلە هاوار و قیژەقیژ (لەڕوانگەی پیتەرەوە)، بەڵام کەس بەڕونی گوێی لە وشەکان نیە.





دایک و باوکی دێنە ژوری دانیشتنەوە. باوکی لەدایکی دەدات، دەکەوێت و سەری دەکێشێت بە پیانۆیەکی سپی کۆندا. دەمی خوێنی لێدێت. دراوسێکەیان دەیەوێت بێتە پێشەوە، بەڵام باوکی تەلەفونەکە لە دیوارەکە دادەماڵێ و دەیکێشێ بەسەریدا. دراوسێکەیان دەست بە لوتیەوە دەگرێ. هەموویان هاوار دەکەن و دەقیژێنن، پیتەریش. جنێو تەنها شتێکە کە دێتە بەر گوێ، جنێوی زۆر زۆر پیس بەیەک دەدەن. پیتەر هەوڵدەدات دەنگی بەسەر گەورەکاندا بەرزبکاتەوە و هەموو ئەو وشە ناشیرینانە دەڵێت کە دەیزانێت.

پیتەر دەستدەکات بە گریان. ڕادەکاتە دالانەکەی دەرەوە و لەوێشەوە بۆ قاتی خوارەوە. دەڕواتە دەرەوە و لە زەنگی هەموو دەرگاکان دەدات و هاواردەکات؛ «سەیارەی پۆلیس، سەیارەی ئاگرکوژاندنەوە، سەیارەی فریاگوزاری! سەیارەی پۆلیس، سەیارەی ئاگرکوژاندنەوە، سەیارەی فریاگوزاری!».

دیسانەوە دەڕواتەوە ناو دالانی بیناکە و خۆی دەکات بە ژێر زەمینەکەدا. لەسەر دەرگای ژێرزەمینەکە بە پیتی سەوزی بریسکەدار نوسراوە "ژوری پەناگا". پیتەر دەرگای ژێرزەمینەکە دەکاتەوە و خۆی لەپشت چەند پاسکیلێکەوە دەشارێتەوە. زۆر زۆر بە بێدەنگی دادەنیشێت.

پیتەر هەر بەچیچکانەوە لەپشت پاسکیلەکاندا دانیشتووە. ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێت.

دایکی دێتە ژێرزەمینەکەوە و لەپشت پاسکیلەکاندا دەیدۆزێتەوە. هەردووکیان زۆر بە کوڵ دەستدەکەن بە گریان.





کوڕە منداڵەکە لەوەندە زیاتری لەیاد نیە و ناشتوانم زۆری لێبکەم. بەدڵنیاییەوە نازانم ئەو شتانەی کە کوڕەکە بیریکەوتەوە هەقیقەتە یان نا.

گۆچانە حەیزەرانەکەی پیاوە یەک مەتریەکە کەوتبووە سەر زەویەکە، یان خۆی بۆ هەتاهەتایە گۆچانەکەی داناوە، چونکە هەڵیناگرێتەوە. هەروا وەستاوە و بە نیگایەکی غەمگینەوە تەماشام دەکات، بە ماتیەکەوە سەیرم دەکات. ئینجا دەڵێت؛ «ئێستاکە ئیدی لەوەندە زیاتر لەسەر ئەو باسە ناڕۆین!».

چرکەیەک دوای ئەوە ونبوو، دەشزانم ئیدی قەت چاوم پێناکەوێتەوە.

زەویەکە بە خشتی کاشی سیرامیک داپۆشراوە، دانەیەکیان ڕەنگی سورە و دانەکەی تەنیشتی سەوزێکی زەیتونیە. وا خەریکی ژماردنیانم.

هەر بەچاو چوارگۆشەیەکم لە ناوەڕاستی زەوی ژورەکەدا نیشانە کردووە و لە چوار کاشی پێک هاتووە، زۆر بەزەقی وەک یەکەیەکی دیار دێنە بەرچاوم و بەو شێوەیەش بەسەر باقی زەویەکەدا زاڵن، بەڵام ئیتر لەوە زیاتر ناخۆشە سەیری بکەم. لەبەرئەوە نۆ کاشی جودادەکەمەوە، سێ کەرەت سێ دەکاتە نۆ، بەڵام لەوەش وەڕسم، نۆ خشتی کاشی دەتوانن چیم پێبڵێن؟ چوارگۆشەیەکی تر جیادەکەمەوە کە لە 16 کاشی پێکهاتووە، ئێستاکە هەر کاشیەک لەوانە بەشێکی یەکەیەکی گەورەتر پێک دەهێنن، بێگومان خۆیان ئاگایان لەوە نیە، بەڵام من ئەوە دەزانم. هێشتام هەر بێمانا دێنە بەرچاوم، لەبەرئەوە چوارگۆشەیەکی تر جودادەکەمەوە کە لە 25 کاشی پێکهاتووە. لەسەر پێنج کاشی سەری سەرەوە پیتی "ب"، "ی"، "ی"، "ت"، "ا" دەنوسم، دەمەوێت چوارگۆشەیەکی ئەفسوناوی لەو پێنج پیتەوە دروستبکەم.





هەوڵێک لەگەڵ پێنج پیتی "م، ا، ر، ی، ا"شدا دەدەم، بەڵام هەردوو بارەکە زۆر ئاڵۆز دێنە بەرچاوم، لەبەرئەوە دایاندەنێم بۆ کەرەتێکی تر کە کاتێکی باشترم لەبەردەستدا بێت.

زەویەکە زۆر گەورەیە و زۆر بەئاسانی دەتوانم چوارگۆشەیەک جیابکەمەوە کە لە 36 کاشی پێکهاتبێت. هەرئەوەندە بوو کە دەبوایە جوتێ پێڵاوم بخستایەتە لاوە. ئەو 36 کاشیە هی ئوتێلەکەیە، بەڵام ئەو پەیوەندیە مەزنەی کە گرێیان دەدات بەیەکەوە هی منە. پێم وانیە میوانانی تری ئوتێلەکە هەرگیز لەوەوپێش سەرنجیان بۆ ئەو چوارگۆشە هاوئاهەنگە چووبێت، چونکە من خستمنە ناو پەیوەندیەکی گەورەترەوە، من خستمنە ناو مەملەکەتی فیکر و سەرنجەوە. پەیوەندیە گەورەکەی نێوانیان لەسەر زەویەکە نیە، بەڵکو لەشوێنێکی ئەمینی ناو سەرمدا پارێزراون. ئەو 36 کاشیە دەتوانن لەناو ڕۆحمدا چوارچێوەیەکی هەڵبەستراو بەدەوری خۆیاندا هەڵبەستن. من خۆم پێموایە بەمیهرەبانیەوە حسابیان بۆبکەم. هەر بەچاو بەسەر ئەو 36 کاشیەدا دەجوڵێمەوە، بەسەریاندا دەخولێمەوە، بەشێوەیەکی شاقوڵی و تیرەیی بەسەریاندا دەڕۆم. کاشیەکان هەست بەوە ناکەن کە من بەچاو بەپەلە بەسەریاندا دەڕۆم. سەرنجم خستۆتە سەر کاشی ژمارە 13، یەکەمین کاشی ڕیزی سێهەمە. لەسوچی خوارەوەی لای ڕاستیدا قڵیشێکی بچکۆلەی تێدایە، لەدڵی خۆمدا دەڵێم "بەڵام پێویست ناکات خەفەت بەوە بخوات، چونکە هیچ کاشیەک نیە کە کەمێک ڕوشاوی پێوە نەبێت". کاشیەکان لەسەر پشت پاڵکەوتوون و ڕویان بۆ سەرەوەیە، لەبەرئەوە ناتوانن یەکتری ببینن. ڕاستە پێکەوە زەویەکیان داپۆشیوە، بەڵام مەرج نیە پەیوەندیان بەیەکەوە هەبێت. لە ئائێستاکەدا تەنها پەیوەندیان بە منەوە هەیە

و منیش بەنۆبە یەک لەدوای یەک لێیان وردەبمەوە. ئەگەر کاشی ژمارە 13 بەشێوەیەکی تەوەرەیی بکەم بە دوو بەشی وەک یەکەوە، ئەوا بێگومان دوو سێگۆشەی دوولایەکسانم دەست دەکەوێت، بەڵام تەنانەت پەنجەیەکیشی بۆ نابەم، چونکە من لەو کەسانە نیم کە شتومەکی ناو ماڵ بشکێنم، هەرچەندە دەزانم ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر تەماشای بکەم، لەوانەیە هەر بەنیگا وردی بکەم. دیسانەوە سەرنج دەخەمەوە سەر ئەو تەختەی کە لە "شەش بە شەش" کاشی پێکهاتووە. تەختێکی شەش بە شەشی کاشی شتی زۆری لەسەر دەکرێت، هەر زۆر زۆر، لەدڵی خۆمدا دەڵێم "بۆ نمونە دەتوانین لەسەر هەر کاشیەک چیرۆکێک بنوسین، ئەوە هەر زۆر ئاسانە".

کورسیەکم لابرد و ئیدی دەتوانم هەموو سەرنجم بخەمە سەر 49 کاشی. بەبێ ئەوەی چاوم بتروکێنم دەتوانم هەر هەموویان ببینم، وابزانم توانایەکی تایبەتیم تێدایە و دەتوانم چاوم لەسەر هەموو کاشیە سیرامیکەکان دانێم. من زیاد لە ڕادە دڵم بەو چوارگۆشەیەی دواتر خۆشە و قەت لەبیرم ناچێتەوە، چونکە بەڕاستی حەوت کەڕەت حەوت کاشی هەقیقەتێکی پەتیە، خودی دوائەنجامی ژیانە. ناواخنی بوونی ژیان لە چوارگۆشەیەکدایە کە لە 49 کاشی سیرامیکی سور و سەوز پێکهاتووە و لە ژوری ژمارە 15ی ئوتێلی "لونا کۆنڤێنتۆ"ی شاری "ئامالفی"دایە. تەماشای عەلاگەی جل هەڵواسینەکە دەکەم، بەڵام هەرئەوەندەی دیسانەوە نیگام دەخەمەوە سەر زەویەکە، یەکسەر چاوم دەچێتەوە سەر چوارگۆشەکە، تەنانەت یەک ملیمەتریش لەشوێنی خۆی نەجولاوە، بێگومان ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە کە شێوەکەم لە مێشکدا ماوە، فۆرمەکە لە زەویەکەدا نیە، بەڵکو ئەو کەسە خلوَقاندوویەتی کە چاوی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر





دەگوێزێتەوە. ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان زیندانی بکرێم و لەسەر زەویەکە چوارگۆشەیەکی 49 کاشی لێبێت، ئەوا هەرگیز بێتاقەت نابم. من جیهانم بینیووە. ئەگەر هێڵێکی نادیاری تەوەرەیی لە سوچی سەری سەرەوەی لای ڕاستەوە، واتە لە کاشی ژمارە حەوتەوە، ڕابکێشم بۆ خواری خوارەوەی سوچی چەپ، واتە بەرەو کاشی ژمارە 43، ئەوا دوو سێگۆشەی گۆشە وەستاوم دەستدەکەوێت، بەڕاست خۆ من لەوەوپێشیش ئاماژەم بۆ ئەوە کرد، چونکە ڕێک وەکو ئەو کاتەیە کە کاشیەک لەتبکەین، چوارگۆشە هەر چوارگۆشەیە، ئیتر چ گەورەبێت و چ بچوک. درێژی هەریەک لەو دوولایەی کە گۆشە وەستاوەکان پێک دەهێنێت، حەوت درێژی کاشیە. سەرجەمی لێکدانی هەموو چوارگۆشەکانی لا وەستاوەکانی دوو سێگۆشەکە دەکاتە 98 درێژی کاشی. نازانم ڕەگی دووجای 98 دەکاتە چەند. ئامێرێکی ژمێریای بچکۆلانەم لە جانتاکەمدا دۆزیەوە؛ ڕەگی دووجای 98 دەکاتە 9،8994949. کەواتە ژێی ئەو سێگۆشە لاوەستاوانە دەکاتە 9،8994949 درێژی کاشی. ئەوا ئەوەشمان زانی، بەڵام من وەک شتێکی سەیر دەیبینم کە تەوەرەی حەوت کەڕەت حەوت کاشی ژمارەیەکی هێندە ناشیرینی لێدەربچێت. تاڕادەیەک وەک ئەوە وایە کە لەناکاوێکدا بکەویتە ناو بۆسەیەکەوە، بەڵام هەمیشە گێرەشێوێنی توانایەکی تایبەتی هەبووە کە لەناوەوە جیهان ورد و خاشبکات. لەسەروئەوەشەوە شتێک هەیە کە ڕێک ناکەوێت، دەڵێیت شتێک لەنێوان کاشیەکانەوە پرسیار دەکات، بێگومان ئەوە ڕۆحە و بەسەر کاشیەکاندا دەخولێتەوە و دەپرسێت؛ ناکرێت 49 کاشی بکەین بە دوو کەرتەوە، ئەو کاتە بە چ شێوەیەک نیوەی کاشیەکان سور دەبن و





نیوەکەی تریشی سەوز؟ هەستدەکەم پەشۆکاوم، گومان لە مێشکی خۆم دەکەم.

جۆرە ڕیزکردنێکی زیاتر ڕزگاری کردم، چوارگۆشەیەکە کە لە 64 کاشی پێکهاتووە. ناچاربووم کەمێک پاڵ بە مێزی نوسینەکەی "ئیبسن"ەوە بنێم. قورس بوو، جگەلەوەش بەم نیوە شەوە هەروەک هەورەگرمە دەنگی دایەوە. هەشت کەرەت هەشت دەکاتە 64، هیچ گومانێک لەوەدا نیە، ئێستاکە 32 کاشی سور و 32 کاشی سەوز لە چوارگۆشەکەدایە، هەر بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بکەم، هاوئاهەنگیەکی پراوپڕم لەبەردەستادا بوو. ئێستاکە هاوسەنگیەکی تەواوەتیم لەنێوان سور و سەوزدا بەرهەم هێناوە. بەدەرلەوەش ئێستاکە دەتوانم یاری شەترەنج بکەم، لەوانەیە هەرلە سەرەتاوە هەموو مەبەستەکە لەوەدا بووبێت کە یاری شەترەنج بکەم. من زۆر بەباشی دەتوانم لەگەڵ خۆمدا یاری شەترەنج بکەم، بەبێ داشیش دەتوانم یاری بکەم، من هەمیشە ئەو توانایەم هەبووە؛ یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت ریزم هەیە. قەڵاکان و ئەسپەکان و فیلەکان و شاژن و پاشا لەریزی یەکەمدا دادەنێم؛ ""a، "b"، "c"، "d"، "e"، "f"، "g"، "h"". هەر زۆر ئاسانە، پراوپڕ ئاگام لە هەموو تەختی شەترەنجەکەیە، هەموو خانەکان بەیەک جار دەبینم.

من یەکە یەکە داشەکان لەسەر تەختەکە دادەنێم و بەوردیش یەک بەدوای یەکیان دەهێنمە بەرچاوم. لە مەرمەڕی ڕەش و سپی دروستکراون و زۆر گەورەشن، گەورەترینیان پاشاکان و شاژنەکانن، درێژییان لەسەرو 30 سانتیمەترەوەیە.

من پاشای سپیم و لەسەر خانەی یەکەمم، واتە شوێنێکی سورم بەخۆم بەخشیوە، لەسەر بلیتەکەم نوسراوە "e1"، تا بڵێیت شوێنێکی نایابە،





لەشوێنێکی ڕیزی یەکەمی ئۆرکێسترایەک دەچێت، بێگومان دەبێت هەرواش بێت. هەموو داشەکانی تر لەسەر شانۆ گەورەکەی بەردەممدا وەستاون، کەمێک ڕقم لەریزی سەربازەکانی خۆمە، هەرزۆر نزیکن لێمەوە و بۆنێکی ناخۆشیان لێدێت، بەڵام لەوسەری ئەوسەرەوە بەلای چەپمدا شاژنی ڕەش بە ڕونی دەبینم، لەسەر "d8"ە، ئەویش لەسەر کاشیەکی سیرامیکی سور وەستاوە. بەبڕوای من ئەویش شوێنێکی باشی بەرکەوتووە، بەدەستی چەپم دەستێکی بۆ ڕادەوەشێنم، ئەویش بەشێوەیەکی جوان و پرلەنهێنی دەستم بۆ ڕادەوەشێنێتەوە. تاجێکی لەسەردایە، لەئاڵتونی نایاب دروستکراوە و بریقەی دێتەوە.

داشەکان شوێنی خۆیان گرتووە و ئێستاکەش یاریەکە دەست پێدەکات.

من هەروا بەکردنەوەی ئاسایی پاشا دەستپێدەکەم؛ "e4_e2"، ئەویش بەئەدەبەوە بە "e5_e7" وەڵامم دەداتەوە. من ئەسپەکەم دەجوڵێنم بۆ ئەوەی پارێزگاری لە سەربازەکەم بکەم؛ "c3_b1"، بەڵام ئەو جوڵەیەکی چاوەڕوان نەکراو دەکات و شاژنەکەی لە "d8" دەخاتە سەر "f6"، بەڵام بۆ؟ پێدادەگرێت، ئازایە! من سەربازی "d2" بۆ "d3" دەجوڵێنم، بۆئەوەی پارێزگاری لە سەربازی سەر "e4" بکەم. ئەویش فیلەکەی دەجوڵێنێت؛ "c5_f8". ئەو شاژنە بیر لەچی دەکاتەوە؟ دیسانەوە ئەسپەکەم دەجوڵێنمەوە و هەڕەشە لە شاژنەکەی دەکەم، بۆئەوەی بیگەڕێنمەوە دواوە؛ "d5_c3". ئەوجا دەقەومێت و بەهیچ جۆرێکیش ناتوانم هیچ شتێک بکەم؛ شاژنەکەی لە "f6" دەجوڵێنێت و سەربازی سەر خانەی "f2" دەخوات. شاژنی ڕەش هەر زۆر نزیک دەکەوێتەوە لێم، کشم لێدەکات، بۆنی گێلاس و هەڵۆژەی لێدێت، بەڵام نەگبەتیەکە لەوەدایە کە ناتوانم دەستی بۆ بەرم. گەورەترین هەڵەمکرد کە یاریزانێکی شەترەنج بیکات، من هەتا لوتی خۆم دەبینم



و لەوە زیاتر نازانم بیربکەمەوە، لەلایەکی تریشەوە حسابم بۆ جوڵەی پێشوتری یاریەکە نەکردبوو. ئەوەم لەیادکردبوو کە شاژن ڕابوردویەکی هەیە، کە لە ڕەچەڵەکێکی نەجیبزادەوە هاتووە، لەبیرم چووبووەوە کە ماڵەکەی پڕە لە ئاوریشم، ئێستاکەش فیلێکی نهێنی بەتەریبی لەسەر خانەی "c5" داناوە. ئەوە کە لە کاتی دەرکەوتنی هەقیقەتدا پارێزگاری لە شاژن دەکات و ناهێڵێت بگیرێت. من کش ماتم لێکرا!

یاریەکی کورتبوو، هەر زۆر کورتخایەن بوو. شاژنی ڕەش بەسەرمدا زاڵبوو و یاریەکەم دۆڕاند. من تاوانبارم، مەبەستم نەبوو، بەڵام بەدەستی نائانقەست تاوانێکی گەورەم کرد و بەهۆی ئەوەوە تاوانبارم. من _کە هەمیشە دەموت خەڵکی زەڕەیەک شەرمیان لەلا نەماوە_ وا خۆم بێشەرمترین تاوانم کرد کە پیاوێک بیکات.

لەسەر جێگاکەم پاڵکەوتم و توانیم یەک دوو سەعاتێک بخەوم. کە چاوم کردەوە، وەک ئەوە وابوو کە لە یەکەمین یان دواهەمین ڕۆژی ژیانمدا خەبەرم ببێتەوە. خەوێکی خۆشم بە کچێکی بچکۆلەوە بینی کە بەرەوروم هات و چەپکێک گوڵی "پێڵاوی ئاڵتونی ماریا"ی بەدەستەوەبوو. نازانم لەلای "سۆگنسڤان"ەوە بوو یان لەلای یەکێک لە دەریاچە گەورەکانی سویدەوە بوو. بەڵام تەنها خەونێک بوو هیچی تر.
دیسانەوە لەسەر مێزی نوسینەکە دانیشتمەوە، کاتژمێر نۆیە. شتەکام کۆکردۆتەوە، لەپاش یەک دوو خولەکێک دەچمە دەرەوە و پارەی ئوتێلەکە دەدەم. ئەگەر ڕێگەم پێبدەن جانتاکەم لە ژورەکەی "بیبتا"دا دانێم، ئەوا دەیبەمە پۆلیسخانەکە. بەلایەنی کەمەوە







ناموێت لە ئوتێلەکەدا بەجێی بهێڵم، چونکە حەزناکەم دواتر بگەڕێمەوە بۆی.

هەستدەکەم شتێکی گرنگم لەیادکردووە. دواتر ئەو شتەم بیرکەوتەوە؛ من نەمدەزانی چ کاتێک و لە چ شوێنێکدا "بیبتا" دەبینمەوە؟ ئێمە لەسەر ئەوە ڕێک نەکەوتین. بەڵام لە هەموو بارێکدا دەبێت لێرەدا نەمێنم، دەبێت لە ئاگایی خۆم دوربکەومەوە.

کۆمپیوتەرە جانتاییەکەم لە ژورەکەدا بەجێدەهێڵم. لەیادی دەکەم، هەروا دایدەنێم بۆئەوەی خەڵکی بیبینن و بیری لێبکەنەوە. هەموو ئەو فایلانەم سڕیوەتەوە کە بە پێویستی نازانم، بەڵام ئەو فایلانەم جێهێشتووە کە مەبەستمە بمێننەوە. زۆر زۆرن، هەر زۆر زۆرن. هێندەی بیرۆکەی سەرەکی و ئەندێشەی تێدایە کە بەشی سەرجەمی نوسراوەکانی کۆمەڵێک نوسەر دەکات. دەتوانم پارچە کاغەزێک لەسەر کۆمپیوتەرەکە دانێم لەسەری بنوسم "ئەمە موڵکی هەموو نوسەرانی جیهانە. فەرموون بەئارەزوی خۆتان لێی ببەن، هەمووی بەلاشە". ئەو کاتەش بەئارەزوی خۆیان چی لێدەکەن با بیکەن. من بەلامەوە ئاساییە گەر وەک پێشوو بەردەوامبن، گەر وەک پێشوو سەمابکەن.

بەڵام ڕام دەگۆڕم. لەسەر پارچە کاغەزێکی زەرد دەنوسم "بۆ بیبتا" و دەینوسێنم بە کۆمپیوتەرەکەوە. من تەنها ئەوەندە دەخوازم کە ڕێگەم پێبدەن وەک مرۆڤێکی ئاسایی بژیم، هیچی ترم ناوێت. تەنها ئەوەندەم دەوێت کە تەماشای باڵندەکان و درەختەکان بکەم و گوێ بۆ پێکەنینی منداڵان بگرم.





وا کەسێک لەدەرگاکەم دەدات. منیش دەڵێم «بەیارمەتیت دەقەیەک» ئینجا گوێم لە دەنگی "بییتا"یە. دەڵێت "لە باخچەی کڵێسەکەی خوارەوە چاوەڕوانتم".

ئەمە یان یەکەمین یان دواهەمین ڕۆژی ژیانمە. نازانم بوێرم ئەو ئومێدەم هەبێت کە پەرجویەک ڕوبدات یان نا. هەموو ئەو شتانەی کە نوسیومن دەپارێزم و کۆمپیوتەرەکەم دەکوژێنمەوە. هەموو شتێک ئامادایە. ئامادەی گەورەترین گۆڕانکاریە.